٤

# شانازیی مرۆڤایەتی

محمد صلى الله عليه وسلم




پێغەمبەری خوا وەک پەروەرشیار

## نووری نەمر

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

محمد فتح الله گولەن



# شانازیی مرۆڤایەتی

# نووری نەمر

# ٤

## پێغەمبەری خوا وەک پەروەرشیار

محمد فتح الله گولەن




# شانازیی مرۆڤایەتی

# نووری نەمر

## ٤

پێغەمبەری خوا وەک پەروەرشیار

نووسینی

محمد فتح الله گولەن


وەرگێڕانی

دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان

چاپی یەکەم

کانوونی یەکەم ٢٠١٥

تیراژ ٥٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردنی (٨٢٠)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێ بەخشراوە

شوێنی چاپ

Neşe

Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 8330
www.nesematbaacilik.com



هەموو مافێکی لەبەرگرتنەوە و بڵاوکردنەوەی پارێزراوە.
Copyright © Irfan Publishing 2015



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

# پێڕستی بابەتەکان

**پێشەکی**.............................................. ١٠

## بەشی دووەم

## پێغەمبەری خوا وەک پەروەرشیار

**أ- پەروەرشیاریی پێغەمبەری خوا و سەرپەرشتیاریی خێزان** ....... ٢٧

١. پێغەمبەری خوا وەك سەرۆك خێزان.......................... ٢٨

٢. ئەو بەهایەی بەخشیبووی بە خێزانەکانی ............................ ٣٧

٣. ڕاوێژ بە خێزانەکانی ................................................ ٤٠

نموونەیەك................................................................ ٤٠

٤. ڕووداوی سەرپشك کردن (التخیر)................................ ٤٣

**ب- پێغەمبەری باوک** ............................................ ٤٩

١. سۆز و بەزەییەکەی بەرامبەر منداڵ و نەوەکانی.................. ٥١

٢. سۆز و خۆشەویستییەکەی بۆ حەزرەتی فاتیمە ................... ٥٦

٣. ئامادەکردنی منداڵەکانی بۆ ژیانی هەمیشەیی ..................... ٥٨

٤. حەزرەتی فاتیمە و داواکردنی خزمەتکار.......................... ٦١

٥. کەشی پەروەردەیی خانەی بەختەوەری .......................... ٦٥

**ج- پێگەیاندنی مرۆڤەکان و ڕەوشی گشتیی پەروەرشیارییەکەی** . ٦٨

١. بەرزکردنەوەی ڕۆح و نەفس و ژیری .......................... ٧٤

٢. جیهانیبوونی پەیامەکەی ........................................ ٧٦
**د. سیستەمە پەروەردەییە جیهانییەکەی پێغەمبەری خوا .......... ٨٥**
١. بزاوت و کردار .......................................... ٨٥
٢. بازرگانی، کشتوکاڵ، جیهاد ........................... ٨٨
٣. سەرنجێك لەسەر زانست ............................... ٩١
**هـ- چەند نموونەیەک لە سیستەمە پەروەردەییەکەی: ............ ٩٤**
١. پیاوێك لە مزگەوتدا میزدەکات ........................ ٩٤
٢. بەهای ئافرەت لە دیدی ئەودا .......................... ٩٥
٣. سونبولی چاوتێری و بێ نیازی لە خەڵك ................ ٩٧
٤. دیمەنێك لە سەردەمی نەفامی .......................... ٩٩
**و- سیستەمی فێرکاری لای پێغەمبەر .......................... ١٠٢**
١. بەخشندەیی و جوامێری ................................. ١٠٦
٢. پاڵەوانێتی خەنسا ........................................ ١٠٨
٣.ئەو قارەمانانەی لە ساتێکدا بە
بۆیەی محەممەدی ڕەنگداربوون ............................. ١٠٩
عیکریمە .................................................. ١٠٩
حەزرەتی عومەر .......................................... ١١٠

# بەشی سێیەم
# بێ وێنەیی پێغەمبەری خوا
# لە چارەسەرکردنی گرفتەکاندا


**أ- تایبەتمەندییەکانی سەرکردە..................... ١١٧**

١. خاوەن متمانە و دامەزراو بوو.................... ١٢١

٢. خواستی دەستڕۆیشتووەکان بۆ جیاکاری................ ١٢٤

٣. فاکتەری ئینسان نابێت فەرامۆش بکرێت................ ١٢٧

٤. وڵات بە تاکە پێگەیشتووەکانییەوە ئاوەدانە............. ١٢٩

**ب- برەودان بە تواناکان........................... ١٣١**

١. ئەبو زەرری غیفاری............................. ١٣٣

٢. عەمری کوڕی عەبەسە............................ ١٣٥

٣. جولەیبیب.................................... ١٣٧

٤. عەلی کوڕی ئەبوتالیب........................... ١٣٩

٥. هاوسەرە پاکیزەکانی پێغەمبەر...................... ١٤١

**ج- خاوەن فەراسەتی نوورانیی ڕەهەند سرووشی ئاسمانی........ ١٤٢**

١. دادوەریی کێشەی بەردە ڕەشەکە...................... ١٤٥

٢. دابەشکردنی دەستکەوتەکانی حونەین.................. ١٤٧

٣. قەیرانی کۆچ.................................. ١٤٨

ململانێی نێوان "بێ نیازی" و "بەخشندەیی" ........ ١٥٢
یەکەمین دەستوور........ ١٥٤
٤. قەیرانی جەنگ ........ ١٥٥
تاکتیکی نوحود ........ ١٥٦
ڕاوێژ........ ١٦٢
برِگەیەك لە ڕاوێژ........ ١٦٢
داخوازی و جێبەجێکاری ........ ١٦٨
مەردی بەرنامەداری و پلانسازی........ ١٦٨
هەنگاوی بۆ دواوە نەناوە ........ ١٧٠
**د- کێشەی چاوەڕوانکراوی ئەمڕۆ: پرسی ئەژاد........ ١٧١**
**هـ- حودەیبیە........ ١٧٣**
١. موعجیزەی ئاوەکە ........ ١٧٥
٢. نێرراوەکان........ ١٧٥
٣. دڵەکان دەگۆڕێن ........ ١٧٦
٤. عوسمان، نێرراوی پێغەمبەر ........ ١٧٦
٥. بەیعەت لەسەر مردن........ ١٧٧
٦. "کارەکە ئاسان بوو" ........ ١٧٨
٧. ڕێککەوتن........ ١٧٩
٨. حەزرەتی عومەر و شۆکی حودەیبیە........ ١٨٠
٩. ئەبو جەندەل ........ ١٨٢

١٠. ئەبو بەصیر و هاوەڵەكانی ........................ ١٨٢
**و- دەستكەوتەكانی حودەیبیە ........................ ١٨٤**
١. بەرەو ئیسلام دێن ........................ ١٨٤
٢. بۆ كەس نییە كەعبە پاوان بكات ........................ ١٨٦
٣. خزمەت لە كەشی ئاشتەوایدا دەكرێت ........................ ١٨٦
٤. لە ئاشتەوایدا ئیسلامیان ناسی ........................ ١٨٧
٥. ئیسلام لە هەموو جێیەكدا ناسرا ........................ ١٨٨
٦. خوای لەپشت بوو ........................ ١٨٩

## بەشی چوارەم

## هەرێمی نبوەت

**أ- ئەو ژینگەیەی پێغەمبەری خوا هێنایە كایەوە ........................ ١٩٥**
**ب- هەڵكەوتووانی هەرێمەكەی ........................ ١٩٧**
١. بلیمەتەكانی زانست لەو قوتابخانەیەدا ........................ ٢٠٠
لە بواری شەرعدا ........................ ٢٠١
لە بواری تەفسیردا ........................ ٢٠٣
لە بواری فەرموودەدا ........................ ٢٠٤
ڕەهەندە دونیاییەكەی زانست ........................ ٢٠٦
٢. پاڵەوانانی جیهانی ڕۆح ........................ ٢٠٧
٣. بەهرەدارانی ڕەوانبێژی ........................ ٢١٠

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ

وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين

## پێشەکی

باسکردنی کەسایەتیی بەرز و ناوازەی حەزرەتی محەممەد موستەفا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، زیاد لە باسکردنیش، پێشکەشکردنی وەك چارەیەك بۆ ڕزگاریی مرۆڤایەتی و ئیکسیرێك بۆ دەردە ناسۆرەکانی.. هەروەها ناساندنی ژیانی موبارەکی بە شێوەیەك کە شایستەی ئەو زاتە مەزنە بێت، لەو بابەتە گرنگانەیە کە وەك زۆر کەسی تر، دنیای هزر و هەستی منیشی خستبووە ژێر فشارەوە و لە هەموو ڕوویەکەوە بووبووە خواست و خولیایەکی بەرنەگیراو...

ئەو مایەی شانازی مرۆڤایەتییە. ئەوەتا چواردە سەدەیە لە سەرانسەری دنیادا گەورەترین بیرمەند و کەڵەفەیلەسوف و ئەو زانا و ڕووناکبیرانەش کە هەر یەکەیان ئەستێرەی گەشی ئاسمانی هزر و بیرمانن، لەدوایەوە دەستەنەزەر وەستاون و لە ڕوویدا دەڵێن: "تۆ ئەو مرۆڤەیت کە شانازی بە شوێنکەوتەییتەوە دەکەین."

بۆ گەورەیی ئەو ئەوەندە بەسە کە سەرباری ئەو هەموو تێکدان و کاولکارییە ماددی و مەعنەوییانەی لەم چەرخەدا کراون، کەچی هێشتا لە منارەکانەوە زایەڵەی "أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ" دەبیستین و شاباڵ گرتەی ڕۆحی ڕەوانی محەممەدی بە هەموو لایەکدا دەبینین و لەگەڵ ڕۆحانییەکاندا ڕۆژی پێنج جار ئێمەش دێینە جۆش و خرۆش.. دیسانەوە سەبارەت بە مەزنی و شکۆی ئەو دەتوانین بڵێین: سەرەڕای هەوڵی سەروەری دوژمنانی دین لە ناوەوە و دەرەوە لەپێناو گومڕاکردن و لەڕێ لادانی نەوەی نوێ، کەچی وا ئەمڕۆ چەندەها لاوی تازە پێگەیشتوو هەرچەند لە قۆناغێکی زەمەنی ئەوتۆشدان کە دەرککردنیان بە "حەقیقەتی ئەحمەدی" وەك پێویست سەخت و دژوارە، چەشنی بەرەو پیرچوونی پەروانە بۆ ڕووناکی، بەرەو حەزرەتی محەممەد (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) باڵ دەگرن.

بەم کارەشیان هەڵوێستێك دەنوێنن کە لە دنیادا هاوتای نییە. دەستی زەمەن کۆتاتر بوو لەوەی بتوانێت هیچ حەقیقەتێکی تایبەت بەو لە ناخماندا کۆن و ڕەنگپەڕ بکات. بەڵێ، ئەو هێشتا تەڕ و تازەیە لە سینەماندا. هەروەك زۆرجار بە دۆستەکانیشم دەڵێم؛ هەرکات دەچمە مەدینەی مونەووەرە، بۆن و بەرامەی ئەو سەروەرە بە جۆرێ دەمپێچێت، هەر دەڵێیت هەنگاوێك لەولاترەوە بەخۆی شاد دەبم و بە دەنگە ژیانبەخشەکەیەوە پێم دەڵێت: "مَرْحَباً، أَهْلاً وَ سَهْلاً" و بەخێرهاتنم دەکات. جا ئیتر پێغەمبەری خوا (صَلَّىاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) لەنێوماندا تا ئەو ڕادەیە زیندە و تازەیە، هەر واش بە تازەیی و پاراویی دەمێنێتەوە.

بەڵێ، زەمەن پیر دەبێت و بەساڵا دەچێت. هەروەك چۆن هەندێك فیکر و بۆچوونیش پووچ و نابوود دەبن و لە بەها دەکەون. کەچی حەزرەتی محەممەد (صَلَّىاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) بەوێنەی ئەو خونچەیەی کە ڕۆژ دوای ڕۆژ ئاڵتر و پاراوتر دەبێ، هەمیشە لە نوێبوونەوەدایە.

پێم وایە ئەگەر هێندەی کەسانی دی کە شتانی تر باس دەکەن، بمانتوانیبایە پێغەمبەری نازدار باس بکەین -کە بەداخەوە نەمانتوانیوە- بەو ئەندازەیەی کەسانی تر دەخرێنە پێش چاو و برەویان پێ دەدرێت، زەمینە بسازایە بۆ ڕۆشنایی خستنەسەر لایەنەکانی کەسایەتیی ئەو سەروەرە، هونەر و گشت یەکە و دامەزراوەکانی ژیان بۆ ناساندنی ئەو سەفەربەر بکرانایە، ئەوا ئەو کات لە دەروونی نەوەکانی ئەمڕۆدا تەنها ئەو تەختی دادەنا و دڵەکانیش تەنها بۆ ئەو لێیان دەدا.. سەرەڕای هەموو ئەمانە، وا ئێستا لە خۆرهەڵات و خۆرئاوای دنیادا، ڕۆژ دوای ڕۆژ مرۆڤەکان هەریەکە و بە گۆزەکەی دەستیەوە بەرەو ئەو سەرچاوە سازگار و خاوێنە ڕادەکەن کە بە "منهل العذب المورود" ناوی دەبەم و کۆششی ئەوە دەکەن بگەنە مەنزڵی ئەو سوڵتانەی کە تاج لەسەری خۆرەکان دەنێت.

بەڵێ، ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا، لەپێشی هەمووشیانەوە ئەمریکا، بەریتانیا، فەرەنسا و ئەڵمانیا، تێبینیی بووژانەوەیەك دەکەین ڕووەو ئەو. لە زۆر جێشدا موسوڵمانان بە تەشی دەستیانەوە سەرگەرمی ڕستنی بنەماکانی بەرنامەکەی

ئەون و نەخش و نیگاری ناسك و دڵڕفێن تایبەت بە ئیسلام دەچنن. هەر دەڵێیت ڕۆحیەتی "عەصری سەعادەت" سەرلەنوێ لە نێو موسوڵمانانددا زیندووبووەتەوە. بارودۆخی جیهانی ئیسلامیش جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەمەدا نییە... ئەوەتا لەبری ئەوانەی یەك دوو سەدە لەمەوبەر بەبێ هیچ داوەرییەکی ژیریی و هەروا بە ساکاری هاتبوونە ڕیزی موسوڵمانانەوە، ئەمڕۆ چینێکی ڕۆشنبیر و خوێندەواری وا هاتووەتە مەیدان کە لێکۆڵینەوەی زانستیانەی ڕەهەندەکانی ئیسلام دەکات و لەژێر شەبەنگی پرشنگداری زانستدا شوێن پێی حەزرەتی محەممەدی (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) هەڵگرتووە... ئەوانەش کە تا دوێنێ توێژی خوێندەوارانیان بۆ مەرامی خۆیان بەکاردەهێنا و زانکۆ و مەڵبەندەکانی فێربوونیان کردبووە شوێنکەوتەی تاقمێك "....یزم" و دەزگا نیشتیمانییەکانیشیان بۆ بەرژەوەندیی کوفر وەگەڕخستبوو لەمەودوا هەروەك توانەوەی شەختە سەهۆڵینەکان، یەك لەدوای یەك دەتوێنـەوە و بەخێرایی بەرەو رسول الله (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) دەکەونە ڕێ.

ئەوانەی چەندەها ساڵە هەزارەها جار شوێنیان گۆڕی و وێڵی لقێکن خۆیانی پێوە ڕاگیر بکەن، ئەوانەش کە وا لەم سیستەم بۆ ئەو سیستەم و لەم ڕێباز بۆ ئەو ڕێباز لە هەناسەبڕکێدان، زوو بێت یا درەنگ، مایەپووچی و بێ ناکامیی کرد و کۆششەکانیان دەبینن و بەپرتاو بەرەو مەکتەبەکەی حەزرەتی محەممەد (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ڕادەکەن. ئەو مەکتەبەی کە هەرگیز نشوستی بەخۆیەوە نەدیووە. ئەوە "مۆریس بۆکای" و "ڕۆجێ گارودی" و چەندەهای تری نەناسراویش...

بەڵام داخۆ ئێمە وەك پێویست ئەو "سوڵتانی دڵان"ەمان ناسیوە کە سوڵتانەکان فێری سوڵتانداری دەکات؟ جا بۆچی ئێوە سەغڵەت بکەم! ئایا منێك کە لە پێنج ساڵییەوە سەرم لە سوجدەدایە و خۆم بە "قطمیر"[1]ی گەردن بەستراوی دەرگانەکەی دەزانم، توانیومە بەتەواوی بیناسێنم؟ یاخود تا چەند سەرکەوتوو بووم لە گەیاندنی ئەوەی کە دەیزانم؟ جا بۆیە لێرەدا ڕووی گوفتارم دەکەمە هەموو ئەوانەی وان لە

١. قطمیر ئەو ناوەیە کە لە سەگەکەی "أصحاب الکهف" نراوە.

مەقامی ناساندنی ئەودا و خۆشم دەخەمە ڕیزیانەوە و دەڵێم: ئایا توانیومانە ئەو سەروەرەی کە شاهی تەختی دڵانە بە شێوەیەك کە شایانی قەدر و قیمەتی بێت، بە مرۆڤی ئەم سەردەمە بناسێنین و بڵێسەی تاسە و شەیدایی لە ناخیاندا تاو بدەین؟..

نەخێر! ئەگەر مرۆڤایەتی ئەوی بناسیایە، دەبووە مەجنوونی و دەیدایە ئەو کەژ و هەردە. هەر کاتیش یادی شیرینی ئەو ڕۆحەکانی پێچابا، دڵی دەکەوتە جۆش و چاوەکانی ئەسرینیان بۆ دەڕشت. جا ئەو دەم، بۆ چوونە نێو جیهانی پاکی پێغەمبەرایەتییەکەیەوە دەکەوتە پەرواز و لەپێناو گیان بەبەردا کردنەوەی خۆڵەمێشی دڵەی سووتاوی کە لەتاو عەشقی ئەو گڕی سەندبوو خۆی دەدایە بەر شنەی با تا بەرەو هەوارگەی ئەوینی ئەو ڕاپێچی بکات...

لەکاتێکدا ئادەمیزاد هێندەی ئاشنایی و ناسینی خۆشەویستی ئاراستەی شتان دەکات، بەرامبەر ئەو شتانەش کە نایزانێت و ئاشنایی نییە، هەردەم جۆرێك لە دوژمنایەتی نواندووە. هەر بۆیە ئەو خاڵەی کە دوژمنان بەدرێژایی تەمەنیان هەوڵی خۆیانی تێدا چڕدەکەنەوە، بریتییە لە سڕینەوەی "ئامی جەلیلی محەممەدی" لە یادگەکاندا و گۆشکردنی نەوەی نوێ لەسەر دوژمنایەتیکردنی فەخری کائینات (عَلَيهِ أَفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ). بەڵام ئەوە چ درەوشانەوەیەکی لوتف ئامێزە کە سەرەڕای خواستی دوژمنان بۆ ڕیشەکەن کردنی ناوی ئەو لە دەروونەکاندا، کەچی وا ئەمڕۆ تێکڕای بەربەستەکانی گەیشتن بەو تەی کراون! ئەخوازەڵا لاوان، کە وەك دڵخۆشیی ئەو کەسەی لە بیاباندا خەریك بوویێت لە تینواندا بمرێت، کەچی لە پڕێکدا و بە شێوەیەك کە هەرگیز چاوەڕوانی نەکردبێت لە پەنا سەریدا ئاوێکی سازگاری کەوسەرئاسای دەستکەوتبێت، ئاوەها بەو چەشنە خۆیان هەڵدەدەنە ئامێزی پڕ سۆزی ئەو نازدارەوە. بێگومان ئەو سینە پڕ سۆز و میهرەش لە ئامێزیان دەگرێت و هەرگیز ئەو کەسانە بێ بەش ناکات کە بەرەو لای دێن.

نازانم قەت سەرنجی ئەو کەسانەتان داوە کە لە ڕۆژانی هەینیدا مزگەوتەکان سەرڕێژ دەکەن؟ ئەگەر بەوردی سەرنجتان دابێت، ئەوا بینیوتانە کە زۆربەیان لە گەنجانن. داخۆ دەبێت ئەو پاڵنەرە چی بێت کە لە بەرامبەر پەلکێشکاریی بەرنامە

بۆ داڕێژراوی نەوەکان بۆ ناو گێژاوی ترسناکی گومڕایی و سەرکەشیدا، وای لەو گەنجانە کردبێ کە بەبێ گوێدانە ساردوسڕی زستان و لەگەڵ ئەوەشدا کە هەڵدەلەرزن لە سەرمادا، دەستنوێژ بگرن و لە ناهەموارترین هەلومەرجدا بەرەو مزگەوتەکان هەنگاو بنێن؟ گەر پێتان باش بێ من وەڵام دەدەمەوە: ئەوە جازیبەی قودسیی حەزرەتی محەممەدە...

ئەگەر عەقڵ و هەستەکانیشمان هەرگیز پەیی پێ نەبەن، ئەوا دەروونەکان بوونەتە پەروانەی دەوری ئەو شەمعە، ئەو خۆرە.. لە داهاتوویەکی زۆر نزیکیشدا ئەو عەقڵە دەربەدەر و پەرێشانانەی کە تا ئێستا نەیانتوانیوە بەرەو ئەو بدەنە پرتاو و بەورێنەی مێشی زستان لەملاو ئەولادا پەکیان کەوتووە، بۆ ئەم حاڵەیان دەستی پەشیمانی دەگەزن و بە خۆیان دەڵێن: "ئاخ و داخ! ئێمە بۆ نەبووینە پەروانە و بەرەو ئەو نەڕۆیشتین؟" بەڵام ئەو کات لەوانەیە بۆ هەندێکیان زۆر درەنگ بووبێت و هەموو شتێك کۆتایی هاتبێت...

جیهان بەهەڵەداوان بەرەو لای ئەو دێت. ئەوەتا ناوەندە زانستی و ئەکادیمییەکان لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن و ئەو دەروونانەش کە بەڕووی جیهانی فیکردا واڵان، شوێنی دەکەون و زۆرێکیش لەوانەی کە تا ڕۆژانێك لەبەرەی دوژمنانیدا بوون، وا ئێستا دەبنە دۆستی زۆر نزیکی و دەچنە داڵدەی ئەوەوە، هەروەك بەڕاستیش چوون... ئیدی ئەمڕۆ تەنانەت بە پێوانە و کێشانەکانی بەرەی بەرامبەریش حەزرەتی محەممەد (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) سەنگی خۆی هەیە و ئەوانیش دان دەنێن بە قەدر و گەورەییەکەیدا... پێغەمبەری خوا لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: "بە دە کەس لە ئوممەتەکەم کێشرام، من سەنگینتر دەرچووم. ئەوجا بە سەد، لەپاشان بە هەزار کەس کێشرام، دیسان هەر من سەنگینتر بووم. لەبەرامبەر ئەمەدا، ئەو دوو مەلائیکەتەی بەم کارە ڕاسپێررابوون، وتیان: وازبێنە، خۆ ئەگەر بە هەموو ئوممەتەکەشی بکێشرێ، هێشتا هەر ئەم قورستر دەبێت."[1] جا خۆ ئەوەش هاتە

۱. الدارمي، المقدمة ۳؛ بزار، المسند ۴۳۷/۹؛ الهيثمي، مجمع الزوائد ۲۵۵/۸.

دی. پێغەمبەری خوا (صَلَّىَاللّٰهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) یەکێك لەو خەونانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە دیویەتی: "لە تایەکی تەرازوودا من و لە تاکەی تریشیدا هەموو ئوممەتەکەم دانرا، من سەنگینتر بووم."[1]

بەڵێ، ئەگەر سەرجەم ئەصحاب و تابیعین و شوێنکەوتوانی تابیعین و ئەوانەی دوای ئەوانیش و ئەو کەسایەتییە مەزنانەش کە تا ڕۆژی قیامەت دێن و ئەو خواناسانەش کە ڕێچکەی چوونە نێو دڵانیان دۆزیوەتەوە و تێکڕای ئەولیا و ئەصفیا و موقەڕڕەبین، هەر هەموویان لە تای تەرازوویەکدا دابنرێن، ئەوا دیسان سوڵتانی دڵان، نووری چاوان قورستر دەبێت. ئاخر چۆن نا! لەکاتێکدا بوون لەبەر حورمەتی ڕووی ئەو بەدیهێنراوە.

پێغەمبەری خوا (صَلَّىَاللّٰهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) هۆی بەدیهاتنی بوونەوەرانە. لە وتەیەکدا کە وەك فەرموودە ناوبانگی دەرکردووە، بەم جۆرە باسکراوە: "لَوْلَاكَ لَوْلَاكَ مَا خَلَقْتُ الْأَفْلَاكَ" "ئەگەر تۆ نەبوویتایە، بوونم بەدی نەدەهێنا."[2] بەڵێ وایە، نووسینی کتێبێك کە تێگەیشتنی مەحاڵ بێت، کارێکی بێهودەیە. خوای گەورەش لە هەموو کارێکی بێ هودە و بەهەوانتە پاك و بێگەردە. بەم جۆرە، زۆر پێویست بوو ڕابەرێکی دەنگ زوڵاڵی وەك سەرداری زەمان و مەکان، حەزرەتی عالی مەقام (عَلَيۡهِالصَّلَاةُوَالسَّلَامُ) بێت و واتای دێڕەکانی گەردوون ڕوون بکاتەوە. ئەمە وێڕای ئەوەی کە بوونی ڕاڤەکار و ڕاگەیەنەرێك زۆر پێویست بوو تا ئەوەی ڕاستییەکانی پشت پەردەی بوون ئاشکرا بکات. هەروەها ئەو مرۆڤەی کە گەردوونی بێ بن، بە خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی ناویەوە بۆ خزمەتی ڕام کراوە، ئاگاداربکاتەوە لەوەی کە لە کوێوە هاتووە.. بۆ کوێ دەڕوات.. و ئامزەدی چ شتێکە... کەوابێ، ئەگەر ئەو نەبووایە، گەردوونیش و مرۆڤیش هیچ مانایەکیان نەدەبوو... بەڵێ، حەزرەتی محەممەد (صَلَّىَاللّٰهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) ئەو مرۆڤەیە کە واتای بۆ شتان گەڕاندەوە. ئەو لە نازدارترین خۆشەویست خۆشەویستترە لامان.

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ٧٦/٢؛ الهيثمي، مجمع الزوائد ٥٨/٩.

٢. علي القاري، الأسرار المرفوعة ٣٨٥؛ عجلوني، كشف الخفاء ٢١٤/٢.

لێرەدا -لەگەڵ دان نانم بەوەی کە خۆم بە گوناهبارترینی باوەڕداران دەزانم- هەستێکم هەیە بێ باسکردنی تێناپەڕم. نیازیشم لە گێڕانەوەی ئەوەیە کە: ئەگەر من تا ئەو ڕادەیە پێغەمبەری خوام خۆشبوێت، کێ دەزانێت مەشخەڵی ئەوینی ئەو لەو دڵانەدا کە لێهاتنیان هەیە، تا چ پلەیەك بڵێسەی سەندووە!.. بۆیە دەبێت لەم سۆنگەیەوە بڕوانرێتە ئەو حاڵەتە ڕۆحییەی دەیگێڕمەوە. دەنا، پێم شەرمە لە حوزووڕتاندا باسی شتێك بکەم کە پەیوەندی بە خۆمەوە هەبێت.

ئەو کاتەی خوای گەورە بە نسیبی کردم دەموچاوی گوناهکارم بسووم بەو خاکە موبارەکەدا، شارەکەی پێغەمبەری خوا هێندە درەوشاوە بوو لە لام و چێژێکی ڕۆحی وام چەشت، ئەگەر لەو کاتەدا -بە فەرزی مەحاڵ- لە هەموو دەروازەکانی بەهەشتەوە بانگهێشت بکرامایە، باوەڕبکەن نەدەچووم بۆ هیچ کامیان و مانەوەم لە شارەکەی رسول اللّٰه دا هەڵدەبژارد. لەڕاستیدا بەهەشت ئاوات و ئارەزووی هەموومانە. تاکە موسوڵمانێکیش نییە ئەم ئاواتەی نەبێت. ئەی مەگەر هەموو بەیانی و ئێوارانێك لە دوعاکانماندا لە پەروەردگار ناپاڕێینەوە کە پەنامان بدات لە دۆزەخ و بمانخاتە بەهەشتەکەیەوە؟ لەگەڵ داننانم بە هەموو ئەمانەدا، دەڵێم: ئەگەر لەو کاتەدا بانگ بکرامایە بۆ بەدەستهێنانی ئەو پایە بەرزەی کە لە دوارۆژدا بەدەست دێت، لەوانەیە مۆڵەتم لە پەروەردگارم بخواستایە و عەرزی ئارەزووی مانەوەم بکردایە لە ڕەوزەی پاکی رسول اللّٰه دا. تکا دەکەم وا گومان نەبەن بەمانە شایستەیی و لێهاتوویی خۆم بۆ ئەو مەقامە بەرزانە دەربڕیبێت، بەڵکو تەنها ویستوومە ئاماژەیەك بۆ ئەو خۆشەویستییە بکەم کە بۆ پێغەمبەری خوا هەمە. گەرنا، بەدرێژایی ژیانم لەو کەسانە بووم کە دوعا دەکەن و دەپاڕێنەوە تا خوای گەورە شەرەفمەندیان بکات بەوەی ببنە کۆیلەی گەردنبەندی بچووکترین هاوەڵی پێغەمبەری خوا. زۆرجاریش ئەم دوعایە ویردی سەر زوبانمان بووە: "پەروەردگارا، بۆ ساتێکیش بێت لە خولیای دەموچاو سووین بە تۆزی بەر پێیان بەدوورمان مەگرە." ئامین.

لە "ماڵی خوا"شدا ناخم لە هەمان جۆش و خرۆش تەژی بوو. لەوانەیە ئەمانە

هەست و نەستی هاوبەشی هەموومان بن. ماوەتەوە بڵێم؛ ئەوانەی پڕاوپڕی ئەم هەستانە دەژین، تەنها من و چەند کەسێکی هاوشێوەی من نین، بەڵکو پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شەیدا و ئەویندارى واى هەیە، ئەم حاڵەتە ڕۆحییەی من گێڕامەوە، بەلای ئەوانەوە زۆر کرچ و کاڵ و سەرەتایی دەبێت.

جا مادەم باس گەیشتە ئێرە، پێم خۆشە بیرەوەرییەکی تریشتان عەرز بکەم: لەگەڵ کاک عارف حیکمەت کە ئەو کات ئەندام پەرلەمان بوو لە حەج پێکەوە بووین. کاک عارف پەیمانی دابوو کە: "ئەگەر بچمە مەدینە، شەرت بێ وەك گوندرێژ لە خۆڵەکەیدا خۆم بگەوزێنم." جا هەر کە پێی نایە خاکی مەدینەوە، پەیمانەکەی هێنایەجێ. ئەوەبوو ئەو ڕۆحە بەرزە خۆی لە خۆڵدا گەوزاند و تەپاوتلی تێدا دەکرد. لێرە و لەوێ هەرکات ئەو دیمەنەم دێتەوە یاد، خۆم پێ ناگیرێ و چاوانم پڕ دەبن لە فرمێسك.

حەزرەتی محەممەد (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) پێغەمبەرە. بەڵام پێغەمبەرێك کە گشت پێغەمبەرانی پێش خۆی لە منارەی پێغەمبەرایەتییانەوە مزگێنی هاتنیان داوە. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەو پەیمانەمان بۆ تۆمار دەکات کە لە سەرجەم پێغەمبەرانی وەرگرتووە سەبارەت بە باوەڕهێنان و پشتیوانیکردنی ئەو پێغەمبەرەی کە خۆیان مژدەی هاتنیان داوە:

﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَـٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَـٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّـٰهِدِينَ ﴾ (آل عمران: ٨١)

"(یادیان بێنە) کاتێك خوا پەیمانی لە یەکە یەکەی پێغەمبەران وەرگرت، کاتێك کتێب و دانایی پێبەخشین بەوەی کە ئەگەر: لە ئایندەدا پێغەمبەرێکم بۆ ڕەوانە کردن و بەڕاستدانەری ئەوەی ئێوەش بوو ئەوە دەبێت باوەڕی پێ بهێنن و پشتگیری بکەن. ئینجا خوا فەرمووی: ئایا بڕیارتاندا و پەیمانی منتان

بەو جۆرە وەرگرت کە پێم ڕاگەیاندن؟ وتیان: بڕیارماندا (و هەروا دەکەین). ئەوسا خوا پێی فەرموون: دە بەشایەت بن و منیش لەگەڵتان یەکێکم لە شایەتەکان."

ئیتر ئەو پێغەمبەرانەش لەو پەیمانەیاندا کە بە پەروەردگاریان دابوو ڕاستگۆ بوون و لە هەموو جووڵە و کردەیەکیاندا لەو چوارچێوەیەدا مانەوە. ئەوەتا کاتێك سەروەرمان میعراجی کرد، هەموویان بە ڕۆحیانەت لەدوایەوە نوێژیان کرد.[1] بەڵێ، وەك بڵێی هەموو پێغەمبەران (عَلَيهِمُ السَّلَام) لە پێشەکی هەمووشیانەوە؛ حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی نوح و حەزرەتی موسا و حەزرەتی عیسا دەیانویست ببنە بانگبێژ و قامەت خوێنی. حەزرەتی مەسیح لە ئینجیلدا ئەو پێغەمبەرە قەدربەرزەی دەخستە بەرچاو و دەیوت: "من دەڕۆم تا سەرداری زەمان بێت."[2] بەڵێ، ئەو دەمەی بەرەو ئاسمان بڵند بووەوە، دامێنی ئاسمانەکان پڕ بوون لە گەوهەر و ئەستێرەکان بەوێنەی بەردی سەر ڕێ لەژێر پێیدا ڕاخران. کاتێکیش خۆر گەیشتە ئاسۆکەی حەزرەتی محەممەد (عَلَيهِ أفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام)، خولیا و سەودای سەری بووبووە ئەوەی ببێتە گەوهەرێك لە تاجەکەی موستەفادا. بەڵێ، هەموو ئەمانە وەك پەروانە بەدەوری پێغەمبەرایەتییەکەیدا پەرواز بووبوون و دەسووڕانەوە. ئیتر لەمانەوە چی دەربچێت!

لەتاو شەمعەی نووری ئەحمەد جوبرەئیل بووە پەروانە
لەتاو جەماڵی نووری محەممەد مەلەك پەروانەئاسا
سەرگەرمی سووڕانە...

هاودەم لەتەك ئەمانەشدا، لە ڕوانگەی خەسڵەتە ئادەمییەکانیشەوە لە لوتکەدا بوو و ڕابەرایەتی و پێشەنگیی ئێمەی ئادەمیی دەکرد. بۆ نموونە؛ پێغەمبەری خوا سەرۆك خێزانێکی کامڵی بێ هاوتا بوو. ئەوەتا لە ماوەیەکی دیاریکراوی ژیانیدا،

---

١. مسلم، الإيمان ٢٧٨.

٢. يوحنا، باب ١٦، ڕستەی ٧-١٥.

نۆ دانە ئافرەت لەژێر نیکاح و بەڕێوەبردنی ئەودا بوون.[1] لەگەڵ ئەمەشدا بواری نەدا لەنێوانیاندا هیچ جۆرە دەمەقاڵێ و بارگرژییەك ڕوو‌بدات. جا ئەگەر ئەو ڕۆڵانەی لەو خانەیەدا -کە تنۆك تنۆك ئیکسیری نبووەتی لێ دەچۆڕێ- گۆش و پەروەردەکران، هەریەکەو بەسەر سەدەیەکدا دابەش بکرانایە، ئەوا دەبوونە موجتەهید و موجەددیدانێك، بەس بن بۆ ڕۆشنکردنەوەی ئەو سەدەیە. داخۆ دەبێت چەند کەس لەم ڕووەوە پێغەمبەری خوایان ناسیبێت!..

حەزرەتی فەخری عالەم (عَلَيهِ ألفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) لە هەمان کاتدا سەرکردەیەکی سەربازیی بێوێنەش بوو. ئەوەتا بە مشتێك مرۆڤەوە کە وەك خەرمانەی مانگ دەوریان دابوو جەنگی بەرووی جیهاندا ڕاگەیاند و تەخت و سەرای چەندین گەورە سوڵتانی یەکسانی خاك کرد و چەندینی تریشیانی کردە بەندەی بەردەرگانەکەی. ئەمە لەکاتێکدا کە بە ڕواڵەت هونەر و زانستی جەنگی لە کەسەوە فێرنەبووبوو.

ئینجا پێغەمبەری نازدار (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) ئەو مرۆڤە مەزنە بوو کە زانستەکان لای ئەو دەگەیشتنە پایان. دەتوت لە شاشەیەکدا تەماشای ئەو ڕووداوانە دەکات کە تا ڕۆژی قیامەت دێنە سەر شانۆی بوون یان هەروەك ئەوەی لە تۆمارێکی غەیبیدا بیانخوێنێتەوە، ئاوا لە یەك بە یەکیان دەدوا. تەنانەت دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو سەدەیەش بەسەر کۆچکردنیدا بۆ خانەی جاویدانی، کەچی وا ئەمڕۆ هەموو لایەکمان لەو کۆتا خاڵەدا کە زانست و تەکنەلۆجیای پێشکەوتووی سەردەم پێی گەیشتووە، ئەو بەیداخە شەکاوەیە دەبینین کە رسول الله (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيهِ) چواردە سەدە لەمەوپێش هەڵی کردووە.. ئیدی ئەوانەیان کە خوای گەورە هیدایەتی لەچارە نووسیون، "کەلیمەی قودسییەی تەیبە" دەهێنن و هەر یەکێکیان دەبێتە ئەڵقەیەکی نوورین لە زنجیرە کاروانی موسوڵماناندا. ئەمەش نموونەیەك لەنێو هەزاران نموونەدا:

لە کاسێتێکی ڤیدیۆییدا تەماشای دکتۆرێکی بەرەگەز کەنەدیم کرد کە ناوی

---

١. البخاري، النكاح ٤، ١٠٢.

"کیث مۆر" بوو. ئەم دکتۆرە، پسپۆڕی زانستی کۆرپەلەزانی و پرۆفیسۆری توێکارییە لە کۆلێژی پزیشکیی زانکۆی "تۆرۆنتۆ". مۆر کاتێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە گوێبیستی قۆناغەکانی گەشەی کۆرپەلە دەبێت لە سکی دایکدا، کە ڕاستییەکی زانستییە و تەنها لە ڕێگەی تەکنەلۆجیای پێشکەوتووی ئەم سەردەمەوە دۆزراوەتەوە، یەکسەر دەڵێت: "أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ" و بەمە تەسلیمییەتی خۆی بۆ پێغەمبەری خوا دەردەبڕێت. هەروەها زانایەکی فیسیۆلۆجی یابانیش کاتێك ئایەتەکانی قورئان سەبارەت بە بوارەکەی خۆی دەبینێت دەڵێت: "أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ" -هەرچەندە لەسەر زاریشی گران بوو- و بۆ ساتێکیش چییە لە هاتنە ناو ئیسلام دوودڵ نابێت.

بەڵێ، هەروەك ئاشکرایە لەو شوێنەدا کە زانستەکان دەچەقن و پەکیان دەکەوێت، قورئانی پیرۆز چەندین دەروازەیان بە ڕوودا واڵادەکات. کۆتا خاڵیش کە زانست و زانیاری پێی بگات، لەگەڵ خاڵی دەستپێکی پێغەمبەری خوادا یەکدەگرێتەوە. باشە، بەڵام کێ ئەمانەی فێرکردووە؟ ئەو وانەی لە زاتی "العَلِيم" و "الخَبِير"ەوە وەرگرتبوو و "موعەللیمی ئەزەلی" لەودیو ڕەحلەی تەدریسەکەیەوە بوو. هەربۆیە دەستی زەمەن نەگەیشتە چمکی مەعریفەتەکەی تا کۆنی بکات. بەڵکو بە پێچەوانەوە، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار پاراوتر و نوێتر دەبووەوە. هەتا دنیاش دنیا بێت هەر لە تازەبوونەوەدا دەبێت.

ئینجا حەزرەتی حبیب الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) بە شێوەیەك کە بۆ هیچ کەسێکی تر نەڕەخسابێت، لە لایەن هاوەڵانییەوە خۆشدەویسترا. بۆ نموونە: لە کۆتایی ڕووداوی "ماء الرجیع"دا، کاتێك کافرانی دڵ پڕ لە قین "خوبەیبی کوڕی عەدی"یان ڕاپێچی پەتی سێدارە دەکرد، ئەم پرسیارەیان ئاڕاستە کرد: "ئایا پێت خۆش بوو ئێستا محەممەد لە جێگەی تۆدا بووایە و تۆش لەناو ماڵ و منداڵی خۆتدا بە ئاسوودەیی ژیانت بەسەر ببردایە؟" وەڵامی ئەم پرسیارە ڕوون و یەکلایی و بێ پەروا بوو:

"نەخێر وەڵڵاهی، ڕازی نابم لەپای ڕزگاربوونی مندا، تەنانەت دڕکێکیش بچێت بە پێی پێغەمبەری خوادا."

جا لەپاش نواندنی ئەم تابلۆ مەردانەیە لەسەر سەکۆی سێدارە، حەزرەتی خوبەیب (رضيَ اللهُ عَنْهُ) دەستەکانی بەرز دەکاتەوە و دەڵێت: "خوایە گیان، بەبێ ماڵئاوایی کردن لە خۆشەویستەکەت هاتم بۆ ئێرە. دەسا سەلامی منی پێ بگەیەنە." پێغەمبەری خوا کە لەو کاتەدا لەنێو ئەصحابدا دانیشتبوو و قسەی دەکرد، لە پڕ هەستایە سەرپێ و فەرمووی: "سەلامی خوا لە تۆش ئەی خوبەیب." کاتێکیش هاوەڵان پرسیاریان کرد، پێغەمبەری نازدار (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بەچاوی پڕ فرمێسکەوە وەڵامی دانەوە: "موشریکەکان خوبەیبیان شەهید کرد. لە دواساتەکانیدا سەلامی بۆ ناردم، منیش وەڵامی سەلامەکەیم دایەوە."[1]

دیمەنێکی تر کە تا ئێستاش دڵگوشادی دەبەخشێتە دەروونی هەموو ئیماندارێك: کاتێك حەزرەتی "سومەیرا" لە غەزای ئوحوددا دەنگۆی شەهیدکردنی پێغەمبەری خوا دەبیستێت، دەستبەجێ خۆی دەگەیەنێتە دامێنی چیای ئوحود... جا کە لەوێ پێی دەڵێن: "باوکت".."مێردەکەت".." کوڕەکانت" شەهیدبوون و تەرمەکانیانی پیشان دەدرێت، ئەم شێرەژنە گوێ بە هیچ کام لەمانە نادات و بەملاو ئەولادا هەر بەدوای پێغەمبەری خوادا دەگەڕێت و لەبەر خۆیەوە ورتەی دێت و دەڵێت: "رسول الله چی بەسەر هاتووە؟" ئینجا کە شوێنی پێغەمبەری خوای پێ نیشان دەدەن، بەڕاکردن بەرەو ئەو شوێنە دەڕوات و لەبەردەم پێغەمبەری خوادا خۆی دەدات بە زەویدا و دەڵێت: "كُلُّ مُصِيبَةٍ بَعْدَكَ جَلَلٌ" "ئیتر هەر ئەوەندەی کە تۆ لە ژیاندایت، هەرچی بەڵاو موسیبەت هەیە سووك و بێ ئەرزشە."[2] بەڵێ، رسول الله (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ئا بەو شێوەیە جێی خۆی لە دڵ و دەروونەکاندا کردبووەوە.

نموونەیەکی تر: مەردی ئاسۆکان لەودیوی ئاسمانەکانەوە بانگهێشت کرابوو.

---

١. سعيد بن منصور، السنن ٣٤٩/٢؛ الطبراني، المعجم الكبير ٢٦٠/٥؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٦٦/٤.

٢. إبن هشام، الصراط النبوية ٥٠/٤؛ الطبري، تأريخ الأمم و الملوك ٧٤/٢؛ الهيثمي، مجمع الزوائد ١١٥/٦.

ئیدی وادەی جێهێشتنی ئەو دۆستانە هاتبووە پێش کە بیست و سێ ساڵ پێکەوەییان هەبوو. هەر بۆیە لە دوا ڕۆژەکانی تەمەنیدا کەمێك بە دڵتەنگی و خەفەتەوە دەچووە لای هاوەڵانی. ئەم حاڵەتەی پێغەمبەری خوا هێندە کاری لە ئەصحاب دەکرد و هەستی دەبزواندن، کاتێك پێغەمبەر دەچووەوە خانەی سەعادەتی، دەتوت لە سینەی هەر یەکێکیاندا شنەی خەزان هەڵی کردووە. ئەوەبوو هاوەڵی بەڕێز موعاذی کوڕی جەبەل (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) لە لایەن پێغەمبەری خواوە ڕاسپێررابوو کە بچێت بۆ یەمەن. ئیتر ئەویش لەو نێوانەدا هاتوچۆی دەکرد. کاتێك دەڕۆیشت پەیامەکانی پێغەمبەری دەبرد. لە گەڕانەوەشدا ئەو مەسەلە و گرفتانەی دەهێنا کە چاوەڕوانی چارەسەر بوون. بەر لەوەی دوایەمین گەشتی ئەنجام بدات، دەچووە خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) داوای دوعای لێ دەکرد، ئینجا بەڕێ دەکەوت. بەڵام ئەمجارەیان جیاواز لە جارانی پێشوو حەزرەت پێی فەرموو: "لەسەر خێر بڕۆیت ئەی موعاذ، بەڵام ئەم جارەیان لەگەڕانەوەتدا لەوانەیە تەنها بتوانیت سەردانی مزگەوتەکەم و گۆڕەکەم بکەیت." ئەم چەند وشەیە بڕووسکەیەك بوو و دای لە حەزرەتی موعاذ. لە پەلوپۆ کەوت و فرمێسك لە چاوانی داباریین. دەتوت ئەژنۆی شکاوە. چوون بۆ یەمەن بە لایەك، تەنانەت توانای نەبوو لە شوێنی خۆیشی هەستێت.[1]

لەلایەکی ترەوە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەروەك موو لە ماست دەریبهێنێت، ئاوەها بەئاسانی سەرجەم ئەو گرفت و کێشانەی چارەسەر دەکرد کە تایبەت بوون بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە. "بێرنارد شۆ" کە سیازدە سەدە دوای ئەو هاتووە، تەنها یەکێکە لەو سەدان مرۆڤەی بەرەی بەرامبەر کە بەم وتانەی خوارەوەی ئەم ڕاستییەی قبووڵ کردووە: "مرۆڤایەتی چەندە ئاتاجی ئەو حەزرەتی محەممەدەیە کە هەموو کێشە و گرفتە کەڵەکەبووەکانی ئەم چەرخەی بە وێنەی سانایی خواردنەوەی کوپێك قاوە چارەسەردەکرد." فەزیلەت و گەورەیی ئەوەیە کە دوژمنیش دانی پێدا بنێت.

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ٢٣٥/٥؛ البزار، المسند ٩١/٧ ٩٢؛ ابن حبان، الصحيح ٤١٤/٢؛ الطبراني، المعجم الكبير ١٢١/٢٠

بەڵێ، ئەو کاتەی مرۆڤایەتی بۆ لای حەزرەتی محەممەد (صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم) دەگەڕێتەوە، بە ئاسوودەیی و دڵنیایی شاد دەبێتەوە. ئیتر ئەو کات، دەستی دەگاتە ئاسۆ پرشنگەکان و لە دەربەدەری و گاڵتەجاڕیی دەستی ڕۆژگار و پەژموردەیی دنیاو ئاخیرەت ڕزگاری دەبێ و بەرەو ئاسمانی مرۆڤایەتی بەرزدەبێتەوە. تەنانەت لەگەڵ کۆسپ و ڕێگریی هەموو هێزە نەیارەکانیشدا، سروەی ئەم دووەمین بوژانەوەیە هەڵیکردووە. ئەوەتا قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ۞ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴾

(الصف: ٨-٩)

"ئەوانە دەیانەوێت بە فوو بە قەڵەی دەم نووری خوا بکوژێننەوە!! (خەیاڵیان خاوە) خوا نووری خۆی (ئاینی خۆی) تەواو دەکات و دەیچەسپێنێت. هەرچەندە کافر و بێ بڕواکان پێی سەغڵەت بن و پێشیان ناخۆش بێت. هەر ئەو خوایە پێغەمبەرەکەی خۆی ڕەوانە کردووە هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنموویی و ئاینی حەق و ڕاستیدا، تا سەری بخات بەسەر هەموو ئاین و بەرنامەکاندا، هەرچەندە هاوبەش پەیداکارانیش پێیان ناخۆش بێت."

بەڵێ، خوای گەورە دینەکەی خۆی سەردەخات. سینە و دڵە ئاتاجەکانیش کەمەندکێشی دەبن و بەختەوەری و دڵنیایی خۆیان لەودا دەبیننەوە و دەگەنە ئاستێك، هەر لە دنیادا وا دەزانن چوونەتە بەهەشتەوە. جا کافر و ستەمکارانی دنیای ئەولا و مونافیقانی ئاسیاش کە لەپێناو بەرژەوەندیی خۆیاندا مرۆڤەکان دەقۆزنەوە و بێ ئاگایانی ناوخۆشمان، پێیان خۆش بێت یان نا، ڕۆژێك دێت ئەو شاهی شاهانەی کە لە لایەن پێغەمبەرانەوە بە "سوڵتانی ئەنبیا" ناسراوە و ڕۆژی پێنج جار ناوی پڕشکۆی بەگوێی جیهاندا دەدرێت، دەچێتە نێو گشت دڵەکانەوە و دەبێتە خۆشەویست و لەدڵدا هەڵگیراوی هەموو لایەك.

ئەو لە هەمان کاتدا کانگای دڵنیایی و ئارامییە. ئێمە باوەڕی تەواومان هەیە بەوەی کە ئەو پەیامەی ئەو هێناویەتی، لە هەمان کاتدا سەرچاوەی ئاسوودەیی و دڵنیاییشە. گەورەترین شاهیدی ئەم ڕاستییەش مێژووە. تاکە ڕێگەی دووبارە چەشتنەوەی ئەم ئارامییەش بە مرۆڤایەتی، بریتییە لە ناساندنی ئەو سەروەرە و ئەو نوورەی کە هێناویەتی. چونکە هەر کات مرۆڤایەتی چاکتر ئەو پێغەمبەرەی ناسی، خۆشەویستی بۆی زیاتر دەبێ و لە سایەی ئەو خۆشەویستییەشدا سیمای کۆمەڵگە دەگۆڕرێت.[1]

جا لە چوارچێوەی ئەم پێشەکییەدا کە پێشینان بە "دیباجە" ناویان دەبرد، پشت ئەستوور بە لوتف و کەرەمی پەروەردگار، هەوڵماندا بەکورتی چەند شتێکی پێرِست ئاسا دەربارەی ڕەهەندە جیاوازەکانی سەروەری هەردوو جیهان، مایەی شانازی بوونەوەران عەرز بکەین.

لەڕاستیدا هەر وتەیەك باس لەو بکات جوان و شیرینە. ئەوەش کە جوان و پەسەند نییە، دەبێت بدرێتە پاڵ دەربڕین و شێوازەکەی. جا ئەگەر لە دەربڕین و شێوازدا کەموکورتییەك هەبێت، ئەوا بەتەواوەتی بۆ من دەگەڕێتەوە. ئەوەشی تایبەتە بە پێغەمبەری خواوە (صَلَّىٰ‌اللّٰهُ‌عَلَيۡهِ‌وَسَلَّمْ)، تەنها و تەنها جوانییە.

١. حەزرەتی عەلی (رضيَ‌اللّٰهُ‌عَنْهُ) بەم شێوەیە باسی پێغەمبەری خوای دەکرد: مَنْ خَالَطَهُ مَعْرِفَةً أَحَبَّهُ "هەرکەس -ئاکارە بەرزەکانی- بزانیایە و تێکەڵاوی بکردایە، ئەوی لە هەموو شتێك- خۆشتر دەویست." الترمذي، المناقب ٨؛ إبن أبي شيبة، المصنف ٣٢٨/٦؛ البيهقي، الشعب الأيمان ١٥٠/٢.

# بەشی دووەم

## پێغەمبەری خوا
## وەک
## پەروەرشیار
## (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)

## أ- پەروەرشیاریی پێغەمبەری خوا و سەرپەرشتیاریی خێزان

ئەوە حەزرەتی محەممەدە کە باڵاترین نمایندەی ناوی "الرب"ی خوایە. ئەو نازدارە، ئەو خاوەن سروشتە بێ هاوتایەیە کە لەنێو گرۆی مرۆدا -بە پێغەمبەرانیشەوە- بەرزترین نوێنەری ئەم ناوە پیرۆزەی خواوەندە. بەدڵنیاییشەوە ئەوانەی لە کەشە پەروەردەییەکەی ئەودا پێگەیشتوون، لەپاش پێغەمبەران بژاردەترینی ناو مرۆڤەکانن. ئەوەتا ئەستەمە جارێکی تر لەسەر زەویدا ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلییەکی تر بەرچاوبکەوێت و پێبگەیەنرێتەوە. نەك تەنها ئەوان، بەڵکو گەیشتنەوە بە ئاستی هیچکام لە هاوەڵە بەرێزەکان لە تواناادا نییە. چونکە ئەوان پەروەردەی دەستی خودی پێغەمبەری خوان. دیسانەوە هەر لە کەشە پەروەردەییەکەی ئەودا چەندین کەسایەتی وەها پێگەیشتوون کە بەوێنەی گەوهەر پەرشبوونەتەوە بە سەدەکانی دوای خۆیاندا. بۆیە وەك ئەوە وایە ئەوانیش لە لایەن پێغەمبەری خواوە پەروەردەکرابن. پێگەیاندنەوەی هاوشێوەی ئەو مرۆڤە هەڵبژاردە و ڕەسەنانەش کە مایەی شانازیی مرۆڤایەتین، کارێکە ئەستەمە بۆ کەسێکی تر مەیسەر ببێت.

فوزەیلی کوڕی عیاز، بیشری حافی، بایەزیدی بوستامی، جونەیدی بەغدادی، ئیمامی ئەبو حەنیفە، ئیمامی شافعی، ئیمامی مالیك، ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، ئیمامی ڕەببانی، ئیمامی غەزالی، مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی، شێخی گەیلانی، شازەلی، نەقشیبەندی، ئەحمەد ڕوفاعی و بەدیعوززەمان و چەندین ناوی پرشنگداری دیکە، هەموویان وانە و پەروەردەی خۆیان لەوەوە وەرگرتووە و لەسەر بنەما پەروەردەییەکانی ئەو سەروەرە پێگەیشتوون. وتەیەکی بەپێز هەیە، ئەگەرچی لە ڕوانگەی سەنەدیشەوە زۆر متمانەپێکراو نییە، بەڵام واتایەکی ناسك دەگەیەنێت: "زانایانی ئوممەتەکەم وەك پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیل وان."[1]

---

١. عجلوني، كشف الخافة ٨٣/٢.

ئاشكرایه كه له ڕوانگه‌ی فه‌زیله‌تی گشتییه‌وه هیچ مرۆڤێك ناگاته‌وه به پێغه‌مبه‌ران. به‌ڵام ئه‌وه‌نده هه‌یه كه له چه‌ند بارێكی تایبه‌تدا كه‌سانێك هه‌ن پێیان بگه‌نه‌وه. هه‌موو ئه‌و كه‌سایه‌تییه مه‌زنانه‌ی له‌سه‌ره‌وه ناومان هێنان و ئه‌وانه‌ش كه بواری ناوهێنانیان نه‌بووه، له‌و خانه‌یه‌دا پۆلێن ده‌كرێن. ده‌ڵێت ئه‌و زاتانه به هاتنیان بۆ سه‌رزه‌وی ته‌نازولیان كردووه. گه‌ر بڕیاربێت شوێنیان به كه‌سانێكی تر پڕ بكرێته‌وه، ئه‌وا به هه‌رحاڵ وا پێویست ده‌كات فریشته‌كانی ئاسمان بێنه شوێنیان. چونكه مه‌گه‌ر ته‌نها فریشته‌كان بتوانن نماینده‌یی ئه‌وان بكه‌ن.

له‌ڕاستیدا ئه‌مه‌ش تایبه‌تمه‌ندییه‌كی جیاكه‌ره‌وه‌ی حه‌زره‌تی محه‌ممه‌ده. به‌ڵێ، ئه‌وه ته‌نها ده‌ره‌نجامی وابه‌سته‌گی ئه‌وه به‌رهه‌مێكی له‌و جۆره‌ی لێ هاتووه‌ته‌كایه‌وه. هه‌تا دونیاش دونیایه به‌رده‌وام ده‌بێت له خستنه‌وه‌ی به‌رهه‌می له‌وجۆره. له‌پاش زه‌مه‌نێكیش له قاتوقڕی و وشكه‌ساڵی، مه‌گه‌ر هه‌ر خوا خۆی بزانێت له‌نێو به‌ختیاره‌كانی ئه‌مڕۆدا كه چه‌كی بوونه قودسییه‌كانی سبه‌ینێیان لێ كردووه به‌لادا، چ بژارده و جوانخاسانێك پێده‌گه‌ن! به‌ڵێ، له بازنه‌ی هۆكاره‌كاندا گشت ئومێد و هیوایه‌كمان ئه‌وانن. من وه‌ك خۆم، له‌وه‌ته‌ی فامم كردووه‌ته‌وه، بێ ئه‌وه‌ی تۆزقاڵێك له ئومێد و گه‌شبینیم له‌ده‌ستبده‌م، به‌رده‌وام له چاوه‌ڕوانییاندا بووم، به‌رده‌وامیش ده‌بم له چاوه‌ڕوانییان...

به‌رله‌وه‌ی بچینه خزمه‌ت چه‌مكی په‌روه‌رده لای پێغه‌مبه‌ری خوا به شێوه گشتییه‌كه‌ی، با پێكه‌وه هه‌وڵبده‌ین ئه‌و سه‌روه‌ره له سۆنگه‌ی شێوازی په‌روه‌رده‌یی ناو خانه‌واده‌كه‌ی ببینین. بیرمان نه‌چێت ئه‌و سه‌رپه‌رشتیاری خێزان بووه و منداڵ و هاوسه‌ر و نه‌وه‌ی هه‌بووه.

## ١. پێغه‌مبه‌ری خوا وه‌ك سه‌رۆك خێزان

گومان له‌وه‌دا نییه كه ئه‌م خانه‌واده‌یه به‌خته‌وه‌رترین و به‌ره‌كه‌تدارترینی ئه‌و خانه‌واده و لانانه‌یه كه تاوه‌كو ئێستا سه‌رزه‌وی به‌خۆیه‌وه بینیوه و ده‌یبینێت.

لە ماڵەکەیدا بەردەوام بۆن و بەرامەی ئاسوودەیی پەرش دەبووەوە. ڕەنگە ئەم ماڵە لە ڕوانگەی دارایی و توانای ماددییەوە یەکێك بووبێت لە هەرە نەدارترین خانەوادەکانی دونیا، چونکە چەندین مانگ تێپەڕدەبوو و لەو ماڵەدا تاسێك شۆربا لێنەدەنرا.[1] هەرچی جێی مانەوەی هاوسەرەکانیشییەتی سەرو هۆدەیەکی بچووك یاخود کوخێکی تەنگەبەر بوو کە تەنها جێی خۆیانی تێدا دەبووەوە. ئەم ئافرەتە بەختیارانە، ئەو یەك دوو سەعاتەی کە لە هەفتەیەکدا لەگەڵ پێغەمبەری سەروەر بەسەریان دەبرد، نەدەگۆڕییەوە بە هەموو شتێکی دونیا.. شادومان و ئاسوودە و بەختەوەر بوون.

هەموو منداڵەکانی پێش خۆی ماڵئاواییان لە دونیا کرد. تەنها حەزرەتی فاتیمە نەبێت کە دوای خۆی وەفاتی کرد. ئەویش هەموو ژیانی لەنێو دەردەسەریدا بەسەر دەبرد. واتە تەنانەت ژیانێکی خۆشبەختی نەخستبووە بەردەستی ئەویش. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، چ هاوسەرەکانی، چ ئەم کیژە نازدارەی دڵی، دێوانەئاسا خۆشیان دەویست و لە هەموو شتێك و لە هەموو کەسێك بەنرختر بوو لە لایان. جێیەکی ناوازەی ئەوتۆی هەبوو لە دڵیاندا ئاوەزی ئادەمیی سەرسام دەکرد.

ئەودەمەی باوکی وەفاتی کرد، حەزرەتی فاتیمە چەندین ڕۆژ بە ئەشکە خوێنینەکانی دونیای هێنایە گریان و شین و لاوانەوەکانی کزەیان لە دڵان هێنا. هەر شەش مانگیش بەرگەی فیراقی ئەوی گرت. دواجار ئەویش بە کامەرانییەکی مەزنەوە بەرەو لای باوکی کۆچی کرد. هیچ ڕۆڵەیەك هێندەی فاتیمە باوکی خۆشنەویستووە. هیچ باوکێکیش ڕۆڵەکانی هێندەی پێغەمبەری خوا -بێگومان هاوسەنگانە- خۆشنەویستووە. پەیوەندیشی لەگەڵ هاوسەرەکانی لە هەمان چوارچێوەدا بووە. هیچ ژنێك مێردەکەی بە ئەندازەی خۆشویستنی هاوسەرانی پێغەمبەر بۆ پێغەمبەر خۆشنەویستووە. هیچ مێردێکیش بە ئەندازەی پێغەمبەری خوا لە لایەن خێزانەکانییەوە خۆشنەویستراوە. بێ شك ئەو تریفە خۆشەویستییەی کە دەوری ئەم نزیکترین بازنەیەی دابوو هەروا بێ هۆ نەبوو.

---

١. البخاري، حبة ١، رقاق ١٧؛ مسلم، زهد ٢٦، ٢٨.

ئاخر پێغەمبەری خوا لەڕێی ئەو شێوازە پەروەردەییەی لەگەڵ کەسانی دەوروبەریدا پەیڕەوی دەکرد، خۆشەویستی و هۆگرییەکی ناکۆتای لە دڵ و دەروونیاندا بەدەستهێنابوو. هەر ئەم هۆگرییە دواتر لەم بچووکترین بازنەیەوە شەپۆل شەپۆل ڕووی لە فراوانی کرد هەتا ئەوەی سەرجەم جیهانی گرتەوە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا دیوێکی تری فەتانەتەکەیەتی.

تۆ سەرنج بدە، ئەوکاتەی وەفاتی کرد، بە هەموو خێزانەکانییەوە تەنها خانوویەکیش چییە بۆیان جێ نەمابوو. بەدرێژایی ژیانیان لە هۆدەی بچووک و تەنگەبەردا ژیانیان بەسەربرد. هەر تەنها ئەو ژوورانەشیان بۆ مایەوە. بەڵێ، ئەو سەروەری جیهانییانەی کە بوونەوەران لەبەر خاتری ئەو بەدیهێنرابوو تەنها ئەوەندەی دەستەبەرکردبوو بۆ خێزانەکانی و لە نێوەندی هەژاری و نەدارییەکی لەو چەشنەدا ماڵئاوایی لێکردن. کەچی وێڕای ئەمە، لە هیچ قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانی هیچکام لە خێزانەکانیدا تاکە وشەیەکی وەهات بەرچاوناکەوێت بۆنی سکاڵا و ناڕەزایی لێبێت لەدەست ئەو بارودۆخە. خۆ ئەگەر بۆ تاوێك شتێکی لەوجۆرەش هاتبێت بە مێشکی یەك دوانێکیاندا، ئەوا دەستبەجێ لەڕێی هۆشیاریدانی قورئانەوە لەبن دەرهێنراوە.[1]

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴾

(الأحزاب: ٢٨)

"ئەی پێغەمبەر بەهاوسەرانت بڵێ: ئەگەر ئێوە تەنها ژیانی دونیا و ڕازاوەییەکەیتان دەوێت، وەرن با هەندێك شتومەك و پارە و سامانتان پێ ببەخشم لەوەودواش بە جوانترین شێوە دەستبەردارتان ببم."

حەزرەتی ئەبوبەکر لە بەیتولماڵ شتێکی بۆ بڕیبوونەوە و ئەوانیش بەو هێندە

١. بۆ وردەکاری ڕووداوەکە تەماشای ئەمە بکە: إبن کثیر، تفسیر القرءان العظیم ٤٨١/٣؛ طبري، جامع البیان ١٥٦/٢١.

دەیانگوزەراند. ئەو برەش وەنەبێت شتێکی بەرچاوبێت، بەڵکو هەر ئەوەندە بوو کە دەدرا بە گشتینەی خەڵکی. بەڵێ، حەزرەتی ئەبوبەکر تەنانەت نەیخستبوونە ڕیزی موسوڵمانانی پێشینیش و بەراورد بە موسوڵمانە یەکەمینەکان مووچەیەکی زۆر کەمتری بۆ ئەو خانمە موبارەکانە بڕیبووەوە.[1] ئەو بەمجۆرە ڕەفتاری کرد و ئیجتیهادەکەی بەم ئاڕاستەیەدا بوو. بەڵام کاتێك حەزرەتی عومەر بوو بە خەلیفە، هاوشێوەی پلە یەکەمینەکان مامەڵەی لەگەڵ کردن. بە بڕوای ئەو ئەگەرچی ئەوان لەڕووی مێژووەوە لە موسوڵمانە یەکەمینەکانیش نەبوون، بەڵام بەوپێیەی کە ئەوان نزیکترین کەس بوون لە سەروەرمانەوە و هەتا ڕۆژی قیامەتیش بە دایکی باوەڕداران هەژماردەکران، دەبوایە بخرێنە بازنەی "السابقون الاولون".[2] حەزرەتی عومەریش لە لایەن خۆیەوە بەوجۆرە بیری دەکردەوە و ئیجتیهادەکەشی بەو ئاڕاستەیەدا بوو. بەڵام ئەو لایەنەی ئێمە دەمانەوێت لەسەری بوەستین ئەمە نییە. ئەو تاکە بابەتەی ئێمە لێرەدا هەموو هەوڵێکی خۆمان خستووەتەگەڕ بۆ ڕۆشنکردنەوەی، بێ هاوتایی ئەو ئاستەیە کە پێغەمبەری خوا لە ڕووی پەروەردەییەوە خێزانەکانی بۆ بەرزکردبووەوە. ئەوە چ پەروەرشیارێکە کە سەرەڕای کورتخایەنی ماوەی پێکەوەییان، توانی بە چەشنێك بچێتە دڵ و ڕۆحی خێزانەکانییەوە کە ئیدی جگە لەو خەون و خەیاڵیان بەلای شتێکی تردا نەترازێت. لەکاتێکدا لە ماڵی دونیا تەنها ئەوەندەی بۆ دەستەبەرکردبوون کە لەسەرەوە باسمانکرد. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە کێشمەندییەکی تەواو جیاواز لەودا هەبووە.. وەك بڵێی بەو کێشمەندییەش دەوروبەرەکەیی خستبووە ژێر ئەفسوونی کاریگەرییەکەیەوە. دەی دیسانەوە ئەم حاڵەتەش بۆخۆی ڕوویەکی دیکەی پێغەمبەرێتییەکەی دەخاتە ڕوو.

جا لەبەرئەوەی ئێرە شوێنی ئاماژەدان نییە بەو لایەنەی کە فرە هاوسەرگیریی پێغەمبەری خوا دەبێتە بەڵگەیەکی تەواو جیاواز لەسەر پێغەمبەرێتییەکەی،

---

١. إبن سعد، الطبقات الكبرى ٢٩٦/٣؛ البلاذري، فتوح البلدان ٤٣٧/١.

٢. إبن سعد، الطبقات الكبرى ٢٩٦/٣؛ البلاذري، فتوح البلدان ٤٣٧/١؛ طبري، تاريخ الأمة و ملك ٤٥٢/٢.

بۆیە ئێستا ناچینە ناو ئەو باسەوە. تەنها بەوەندە دەست هەڵدەگرم کە بڵێم؛ ماڵی مویارەکی پێغەمبەری خوا لە حوکمی فێرگەیەکدا بوو کە ئەحکامەکانی تایبەت بە ئافرەتانی تێدا فێردەکرا. سەرجەم حاڵەت و بارە تایبەتییەکانی پێغەمبەری خوا لە چوارچێوەی ئەو بازنە مەحرەمەدا وەردەگیرا و دواتریش لەوێوە دەگوازرایەوە بۆ ئوممەت. ئەوەتا لە سەدا نەوەدی ئەو حوکمانەی تایبەتن بە ژیانی خێزانەوە، لە لایەن خێزانە پاکەکانی سەروەرمانەوە پێمان گەیشتوون. هەربۆیە بوونی چەند ئافرەتێك لەو خانەیەدا کە لەڕووی ئاست و تایبەتمەندییانەوە لە یەکتر جیاواز بوون، بە جۆرێك لە زەرورەت دادەنرێت. بۆیە دەبینین تەنها لەپێناو بەهەدەرنەچوونی حوکمەکانی ئاییندا، پێغەمبەری خوا لەدوای تەمەنی ٥٣ ساڵییەوە شانی داوەتە بەر ئەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ کۆمەڵە ئافرەتێکدا بکات، کە ئەمەش لە ڕوویەکەوە قوربانیدانە.

بەڵێ وایە، تایبەتمەندیی سەروەرمان وای دەخواست کۆمەڵە ئافرەتێك لە خانەکەیدا بوونیان هەبێت. ئاخر پیاوان دەیانتوانی هەمووکات لە مزگەوت بن و لە خزمەت پێغەمبەری خوادا دابنیشن. بۆ نموونە ئەگەر یەکێکیان گفتوگۆی ئەو ڕۆژەی لەدەستبچوایە، ئەوا هاوەڵانی بەجارێك ئەم کەموکورتییەیان بۆ پڕ دەکردەوە و دانیشتنی ئەو ڕۆژەیان وەك خۆی بۆ دەگێڕایەوە. بەڵام ئەمە لە ئافرەتاندا وا نییە. چونکە زۆرێکیان بێبەش بوون لە وەها بەهرەمەندییەك و بواری ئەوەیان نەبووە بەشداریی کۆڕی نبووەت بکەن. دەی لە وەها بارێکدا کێ ئەو بابەتانەی بۆ ئافرەتان باسبکردایە، نەخاسمە ئەو بابەتانەی کە تایبەتن بە سروشتی ئافرەتانەوە؟ ئەوسا کێ ژیانی تایبەتیی پێغەمبەر و ئەدەب و ڕەوشتی ژووری نووستن و لایەنەکانی سروشتی ئەو نازدارەی بۆ ئوممەت بگێڕایەتەوە؟ داخۆ تاکە ئافرەتێك توانای ئەوەی دەبوو ئایین بە هەموو بنەما و ڕێساکانییەوە باسبکات و بگوازێتەوە؟

ئینجا لەبەرئەوەی ئەوانیش لەڕووی سروشتی بەشەریەتەوە ئەو حاڵەتانەیان بەسەردەهات کە ئافرەتبوون داخوازیەتی، لەم بارە تایبەتانەدا ئەگەر حوکمێکی

تازە سەبارەت بە پێغەمبەری خوا بهاتایەتە ئاراوە، چۆن تاکە ئافرەتێك بەتەنها دەیتوانی فریا بکەوێت؟ نا نەخێر، هەرگیز ئافرەتێك بەتەنها نەیدەتوانی و فریای ئەوە نەدەکەوت هەموو ئەو حاڵەتانە نەقڵ بکات.

جا بۆیە پێویست بوو کۆمەڵە ئافرەتێك هەبن کە هەمووکات حاڵەتەکانی سەروەرمان بۆ باسبکەن و بە بەردەوامی لە نزیکەوە ئاگاداری ورد و درشتی کاروبارەکانی بن. دەبێت ئەوەش بڵێین کە ئەم پێویستییە هەرگیز ڕووی لە دیوە بەشەرییەکەی پێغەمبەری خوا نەبووە. بەڵکو زەرورەتێك بووە بەتەواوی مانا لە پێویستیی ئایینییەوە سەرچاوەی گرتووە. پێغەمبەری خواش لەبەر ئەم زەرورەتە چووبووە ژێر ئەو بارە قورسەوە.

لە لایەکی ترەوە، وەك چۆن ئەم ئافرەتانە بوون بە هۆکاری ئەوەی هۆز و خێڵەکانیان لەڕێی پەیوەندیی خزمایەتییەوە ببەسترێنەوە بە پێغەمبەری خواوە، ئاوەهاش گەورەترین ئامراز بوون لە پاراستنی سەدەها، بگرە هەزارەها فەرموودەدا. بۆیە بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێم کە دونیای ئافرەتان زۆر قەرزارباری خێزانە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوان. خۆ ئەگەر تەواوی ئافرەتان سەری خۆیان وەك بەردی سەرڕێ لەژێر پێی موبارەکیشیاندا دابنێن، هێشتا هەر ناتوانن مافیان بدەن. بەڵێ، ئەو ئافرەتانە تا ئەو ڕادەیە خزمەتی ئایینیان کردووە.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هاوسەرگیریی پێغەمبەری خوا، نە ئەوەبووە لە ئاتاجییەکی جەستەییەوە سەرچاوەی گرتبێت -چونکە ڕێی تێناچێت بوترێت لە ناوچەیەکی گەرمی وەك عەرەبستاندا مرۆڤێك گەیشتبێتە تەمەنی ٥٣ ساڵی، پێویستی بەوە بێت زیاد لە هاوسەرگیرییەك ئەنجام بدات- نە ئەوەشە هاوسەرگیری خێزانەکانی لەگەڵیدا، پەیوەندی بە حەزی جەستەیی، یان دونیاداریی ئەوەوە هەبووبێت. ئاخر ژیانی ئەو ژینی هەژارترین مرۆڤی دونیا بوو. سەرباری ئەوەی خێزانەکانی ئەمەیان دەزانی، کەچی هێشتا هەر داخوازی ئەوەبوون ببنە هاوسەری. لە هەمان کاتدا پێغەمبەری خوا دادگەری و مافپارێزی لەنێوان خێزانەکانیدا پیادەدەکرد، لە هەفتەیەکدا یەکی ڕۆژێکی بۆ

تەرخانكردبوون. تەواوی خێزانەكانی بەمشێوەیە وەسفیان دەكرد: "پێغەمبەری خوا دەم بەخەندەترینی مرۆڤەكان و قسەخۆشترینیان بوو لەگەڵ خێزانەكانیدا."[1]

جا ئێستا ئێوە بڵێن، مەگەر نەدەبوو ئەم ئافرەتانە كە بۆ ماوەیەكی دوور و درێژ لەماڵیاندا شتێكیان دەستنەدەكەوت بیخۆن، یان ناچاربوون هەر ئەو پۆشاكە بپۆشن كە لەبەریاندابوو لایەنی كەم وەك شتێكی سروشتی كەمێك توورەیی پیشان بدەن؟ بەڵام نەخێر. چونكە جگە لە ڕەفتارە ڕەزامەندەكانیان شتێكی ئەوتۆ شك نابەین. پێشموایە وردبینانی سیرە و مێژوو لەم خاڵەدا پشتم دەگرن.

سەرباری ئەو شكۆ و ویقارەی لە ڕۆحییەتی پێغەمبەرێتییەكەیدا هەبوو كەچی دەتبینی قسەی خۆشی بۆ خێزانەكانی دەكرد و نوكتەی ناسكی لەگەڵ دەگۆڕینەوە. تێكەڵاویان دەبوو و دەبووە هاودەمی ڕاز و نیازیان. لەو بەینەشدا پەردەیەكی ناسك دەمایەوە، ئەویش ئەو خەمخۆرییەی كاروباری سەر بە قیامەت بوو كە لە وابەستەیی پەروەردگارەوە سەرچاوەی گرتبوو. دواجار ئەو پێغەمبەر بوو. خێزانەكانیشی بەر لە هەموو شتێك ئوممەتی ئەو بوون...

لە لایەكی ترەوە، پڕكردنەوەی ئەو بۆشاییەی كە لە نەمانی پەیوەندی بەوەوە دروست دەبوو مومكین نەبوو. چونكە ئەو لەم ڕووەشەوە ناوازە و بێ هاوتا بوو. خێزانەكانیشی هەرگیز تەسەووری ژیانێكی بێ ئەویان نەدەكرد.

وەك دەزانن پێغەمبەری خوا هەر لە قۆناغی مەككەوە هاوسەرگیری لەگەڵ دایكی ئیمانداران، خاتوو سەودە ئەنجامدابوو. واتە دووەم خێزانی پێغەمبەری خوا سەودە خاتوون بوو. بەڵام لەبەر هەر هۆیەك بێت، پێغەمبەری خوا ویستی لێی جیاببێتەوە. هەر ئەوەندەی ئەم ئافرەتە هەواڵەكەی پێگەیشت، لە جێی خۆی وشكبوو و ڕاستەوخۆ چووە خزمەت حەزرەت. تەنانەت چەند كەسێكیشی كردە میانگیر. ئەوەبوو عەرزی كرد: "ئەی نێردراوی خوا، من هیچ چاوەڕوانییەكی دونیایم لە تۆ نییە. ئەوە ڕۆژەكەی خۆیشم بەخشی بە عائیشە. گەر دەخوازیت

---

١. إبن سعد، الطبقات الكبرى ٣٦٥/١؛ سيوطي، الجامع الصغير لا.١٣١.

بەدرێژایی ژیانم بۆ هەواڵپرسینیش سەرم لێمەدە. بەڵام چی دەبێت بێبەشم مەکە لەوەی لەژێر مارەییتدا بمێنمەوە. هەموو ئاواتم ئەوەیە کاتێك دەچمە ئەودونیاش هاوسەری تۆبم. جگە لەمەش هیچ خولیایەکی دیکەم نییە."[1] ئەم خواستەی لە لایەن پێغەمبەری خواوە قەبووڵکرا و لە ڕیزی هاوسەرە پاك و بێگەردەکاندا مایەوە.

وەك بینیمان پێغەمبەری خوا لە دڵ و دەروونیاندا جێیەکی لەوجۆرەی داگیرکردبوو. خۆ ئەگەر لە یەکێکیان جیاببوایەتەوە، ئەوا بێ هیچ گومانێك هەتا ڕۆژی قیامەت لە چاوەڕوانی سەروەردا دەمایەوە.

ئەودەمەش کە هەستی بە جۆرێك لە ناڕەزایی کرد لە دایکی ئیمانداران، حەزرەتی حەفصە، دەربڕینێکی لەمجۆرەی بەکارهێنا: "ئەگەر دەیەوێت ئەوا لێی جیادەبمەوە..." کەچی وەرە ببینە ئەم چەند وشەیە بەس بوو بۆ ئەوەی حەزرەتی حەفصە لە پەلوپۆ بخات. ئەوەندەی نەبرد حەزرەتی جوبرەئیل دابەزی و ئەوەی وەبیرهێنایەوە کە حەفصە کەسێکی چەندە نوێژکەر و ڕۆژووگرە. هەروەها پێی ڕاگەیاند کە لە بەهەشتیشدا دەبێتە خێزانی بۆیە پێ فەرموو: "سەرلەنوێ بیهێنەوە بۆ ماڵەکەت." ئیتر ئەویش بۆ جارێکی تر هاونشینیی ئەم کیژە بەوەفایەی وەفادارترین هاوەڵی لە خانەی بەختەوەریدا تۆمارکردەوە.[2]

بەلای ئەوانەوە جودایی لە سەروەر زۆر دڵتەزێنتر بوو لە مەرگ. هەمووشیان هاوبەشبوون لەم هەستەدا و جیاواز لەمە بیریان نەدەکردەوە. هۆکاری ئەمەش ئەوەبوو پێغەمبەر بە چەشنێکی وەها لە دەروونیاندا تەختی خۆشەویستی دانابوو بزواندنی مەحاڵ بێت. لەڕێی ژیانە بەرەکەتدار و نەرمونیان و سروشتییەکەیەوە بە شێوەیەکی وەها ئاوێتەی ژین و ژیانیان ببوو ئەستەم بوو بەرگەی دابڕانی بگرن.

---

١. ابن سعد، الطبقات الكبرى ٥٤/٨؛ طبراني، المعجم الكبير ٣٣/٢٤.

٢. طبراني، المعجم الكبير ٣٦٥/١٨؛ حاكم، المستدرك ١٦/٤-١٧.

خۆ ئەگەر هاتوو جودایی بکەوتایەتە نێوانیانەوە، ئەوا وەك چۆن کەسێك هەوای لێببڕێت دەمرێت، ئاوەها ئەوانیش دەمردن.

لەڕاستیدا دیمەنی دوای وەفاتی خۆشەویست سەرتاپا پارچەیەکە لە خەم و ماتەم و ژانی فیراق. حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر چ کات سەردانی خێزانەکانی پێغەمبەریان بکردایە بە چاوی پڕ فرمێسکەوە دەیانبینین. جاری وا دەبوو ئەوانیش چۆکیان دادەدا و هاوبەشی ئەشك ڕێژییان دەکردن. دەتوت ژیانیان سەربوردی گریە و ماتەمە.

بەڵێ، ئەو ئازدارە شوێنەوارگەلێکی نەسڕاوە و لەیادنەکراوی لەوجۆرەی لە ناخیاندا نەخشاندبوو. ڕەنگە پێکەوەییان ئەوەندەشی نەخایاندبێت، کەچی دەتوت حەزرەت کانگای بوون و ژیانیانە. دەی ئەمە هەر ئەو بابەتەیە کە ئێمە دەمانەوێت لێی بدوێین. ئەوەتا خێزانداریەکەشی بە ئاوازێکی تر جاڕدەدات کە ئەو پێغەمبەری خوایە. سەرپەرشتیکردنی نۆ دانە ئافرەت لە یەك کاتدا بێ ئەوەی گرفتێکی ئەوتۆ لەنێوانیاندا ڕوویدات، کارێکە داخوازی ناسکی و نەرمونیانییەکی وەهایە کە هەر لەو ئازدارە خۆی دەوەشێتەوە.

ئەوەبوو بەر لە ماڵئاوایی کردنی لە دونیا بە چەند ڕۆژێك فەرمووی: "بەندە لەنێوان پەروەردگار و دونیادا سەرپشك کرا. بەڵام ئەو پەروەردگاری هەڵبژارد." وەختێك مرۆڤی خاوەن فەتانەت، ئەبوبەکر گوێی لەم قسەیە بوو خۆی پێ نەگیرا و دەستی بە گریان کرد.[1] ئاخر چۆن نەگری لەکاتێکدا ئەو بەندەیە هەر ئەو کەسە بوو کە قسەکەی کردبوو. نەخۆشییەکەی ئەوەندەی نەخایەند. تا دەهات خراپتر دەبوو و لەتاو ئازاری سەری دەتلایەوە. کەچی لەو ناڕەحەتییەشدا دەستبەرداری ناسکی و خۆش مامەڵەیی نەبوو بەرامبەر خێزانەکانی. داوای کرد ڕێی بدەن لە ژوورێکی دیاریکراودا بمێنێتەوە چونکە توانای ئەوەی نەبوو هاتوچۆی نێوان خێزانەکانی بکات. ئەوانیش هەموو بەجارێك سەری ڕەزامەندییان لەقاند.

---

١. البخاري، صلاة ٨٠؛ مسلم، فضائل الصحابة ٢.

بەمشێوەیە پێغەمبەری خوا دوا ڕۆژەکانی تەمەنی موبارەکی لە ژوورەکەی حەزرەتی عائیشەدا بەسەربرد.[1]

بەڵێ، تەنانەت لە ناهەموارترین بارودۆخیشدا هێشتا هەر بیری لای ڕەچاوکردنی مافی هاوسەرەکانی بوو. زیندەیی ڕۆح مەگەر ئەمە بێت!

## ٢. ئەو بەهایەی بەخشیبووی بە خێزانەکانی

ئەو بەها و پایەیەی پێغەمبەری خوا بەخشیبووی بە ئافرەت، لە ئاستێکی وەها بەرز و بڵنددا بوو نە تاوەکو ئەو ڕۆژە و نە لەو ڕۆژەش بەدواوە دونیا لە وێنەی ئەوەی بەخۆیەوە نەدیوە. گەر شەوێك هەستابایە هەواڵی یەکێك لە هاوژینەکانی بپرسیایە، ڕاستەوخۆ بەدوایدا دەچوو هەموو ئەوانی دیکەی بەسەردەکردەوە. لە ڕوانگەی ڕەفتار و مامەڵەوە هەستت نەدەکرد یەکێکیان بەسەر یەکێکی تریاندا پەسەند دەکات.[2] وەك هەرکەسێکی دیکە، خێزانەکانیشی وایان هەستدەکرد خۆیان خۆشەویستترین کەسن لەلای. بێگومان ئەمەش لە ڕەوشتبەرزیی ئەو نازدارەوە سەرچاوەی گرتبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، وەك چۆن زاڵبوونی هیچ مرۆڤێك بەسەر مەیل و ئارەزووەکانی دڵیدا شتێکی چاوەڕواننەکراو بوو هەر بەوجۆرە، نەدەکرا چاوەڕێی شاندانە بەر تەکلیفێکی (ما لا یطاق)ی ئاوەها لەویش بکرێت. لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا بەهۆی ئەو ئارەزووانەی دڵەوە کە لە دەستی مرۆڤدا نەبوون، داوای لێخۆشبوونی لە خوای گەورە دەکرد و دەیفەرموو: "بێ ئەوەی هەستی پێبکەم ڕەنگە یەکێکیانم لەوانی تر خۆشتربوێت، ئەمەش بۆخۆی ناحەقییە. دەسا خوایە پەنا دەگرم بە میهری ناکۆتات لەم حاڵەتەی کە بەدەست خۆم نییە..."[3]

ئای خوایە، ئەمە چ ئاسکییەکە.. ئەمە چ جوان ڕەفتارییەکە! دەبا ڕووی

---

١. البخاري، الوضوء ٤٥؛ مسلم، صلاة ٩١-٩٢.

٢. أبو داود، نكاح ٣٧.

٣. الترمزي، نكاح ٤٢؛ أبو داود، نكاح ٣٧.

گوفتارم بکەمە ئێوە و بپرسم: "داخۆ ئێوە تاوەکو ئێستا لەبەینی کوڕێك و کوڕێکی ترتاندا، یاخود کچێك و ئەوی تریاندا توانیوتانە ڕەچاوی هەمان وردەکاری بکەن؟" ڕێمبدەن من بەناوی ئێوەشەوە ئەو "نەخێر"ە بڵێم. بەڵێ، "سەد هەزارجار نەخێر." "نەخێر" بەلایەك، بگرە وا دەزانین گەر خواستەکانی دڵمان بشارینەوە ئەوا کارێکی ناوازەمان ئەنجامداوە و دەیکەینە بەڵگە لەسەر بەهێزیی ئیرادەمان. بەوەندەش وازناهێنین، بەڵکو دەچین بە شانازیشەوە بۆ خەڵکی باسدەکەین. کەچی دەبینی پێغەمبەری خوا دێت و لەدەست مەیلێکی زیادەی لەمجۆرە کە ڕەنگە بە دڵیدا بێت، داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگار دەکات.

ئەم ناسکییەی لە پێغەمبەری خوادا هەبوو بە هەموو لەتافەت و نوورانییەتییەوە ڕۆچووبووە ڕۆحی خێزانەکانیشیەوە. بۆیە دەبینی فیراقی خۆشەویست حەسرەت و پەژارەیەکی نەبڕاوەی دوای خۆی جێهێشت. ڕەنگە لەبەرئەوەی ئیسلام خۆکوشتنی یاساغ کردووە دەستیان نەچوویێتە گیانی خۆیان، بەڵام دوای وەفاتی پێغەمبەر ژیان بۆ ئەوان بریتی بوو لە بەستەیەك لە ناڵە و تابلۆیەك لە پەژارە. لەڕاستیدا پێغەمبەری خوا بەرامبەر تەواوی ئافرەتان بە ڕێز و وناسکییەوە مامەڵەی دەکرد، ڕێنمایی هەمووانیشی دەکرد بەو جۆرە مامەڵەبکەن. ئەوەیشی بە کەسانی دیکەی دەوت، خۆی بەکردەیی لەگەڵ هاوسەرەکانیدا دەیکرد. ئەم ڕەوشتە بەرزەی لە صەحیحی بوخاریدا بەمشێوەیە دەبینین:

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لە حەزرەتی عومەرەوە بەسەرهاتەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە. حەزرەتی عومەر دەڵێت: "ڕۆژێکیان چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا بینیم بزەی لەسەر لێو بوو." عەرزمکرد: "دەك هەمیشە دەم بەخەندەبیت، ئەوە بەچی پێدەکەنی ئەی نێردراوی خوا؟" بە خەندەوە ئەم وەڵامەی دامەوە: "پێکەنینم بە حاڵی ئەو ژنانە دێت. بۆخۆیان دانیشتبوون و قسەیان لەگەڵ دەکردم. کەچی هەر ئەوەندەی گوێیان لە دەنگی تۆ بوو هەریەکەیان بە لایەکدا هەڵهاتن." بە بیستنی ئەم وەڵامە دەنگم بەرزکردەوە و وتم: "ئەی دوژمنانی نەفستان، کەواتە لە من دەترسن؛ کەچی لە پێغەمبەری خوا ناترسن و لە

خزمەتیدا بێ ڕێزی دەکەن!" وەڵامی ئەوانیش دوانەکەوت: "ئاخر تۆ ڕەق و ڕەفتار زبریت!"[1]

ڕاستییەکەی حەزرەتی عومەریش ڕەق و توندوتیژ نەبوو لە مامەڵەیدا. ئەویش لەگەڵ ئافرەتاندا نەرمونیان بوو. بەڵام وەك چۆن جوانترین و پێکەوتەترین مرۆڤ کاتێك بەراورد دەکرێت لەگەڵ حەزرەتی یوسفدا، لە جوانی دەکەوێت و ناشرین دەردەکەوێت، ئاوەهاش، نەرمونیانی حەزرەتی عومەر لەچاو نەرمونیانی پێغەمبەری خوادا زبر و توند دەردەکەوت. ئەو حوکمە ڕێژەییەی ژنان دایان، لە بەراوردکردنی حەزرەتی عومەر بە پێغەمبەری خواوە سەرچاوەی گرتبوو. بۆ مەگەر کەس هەبوو لەو ئاستەدا بێت لەگەڵیدا بەراورد بکرێت! ئەستەم بوو...

بەڵێ، ئەوان تا دوا چۆڕ لە ڕێژاوی نەرمونیانی و ناسکی و ڕەوشتبەرزیی پێغەمبەری خوایان نۆشکردبوو. هەربۆیە مامەڵەی حەزرەتی عومەریان بەلاوە توند بوو. ئەمە لەکاتێکدا حەزرەتی عومەر دەستنیشانکراوی ئەوەبوو لە داهاتوودا سەنگی خەلافەت بێ کەموکورتی لە ئەستۆ بگرێت. زۆر هەستیارانە دەژیا و لەدوای پێغەمبەران دەبوو بە یەکێك لە مەزنترین نموونەکان.. کە ڕۆژیشی هات هەر بەڕاستی بوو.. لە سەرجەم هەڵسوکەوتەکانیدا پەرۆشی دادگەری بوو و بەڕاستی دەوت ڕاست و بە چەوتیشی دەوت چەوت و پیشانی کەسانی تریشی دەدا...

دارای حاڵەتێکی ڕۆحی ئەوتۆ بوو ساز و ئامادەی دەکرد بۆ پایەی جێنشینی. ڕەنگە ئەم حاڵەتە ڕۆحییە بەلای کەسانی ترەوە توند بووبێت. بەڵام دەبێت بیرمان نەچێت کە حەزرەتی عومەر تەنها لەرێی ئەو حاڵەتە ڕۆحییەوە دەیتوانی لەو ئەرکە قورسەدا سەرکەوتوو بێت کە دواتر نوێنەرایەتی دەکرد... ڕۆژگاریش سەلماندی کە سەرکەوتوو بوو تیایدا.

---

١. البخاري، أدب ٦٨؛ فضائل الصحابة ٢٢.

### ٣. ڕاوێژ بە خێزانەکانی

پێغەمبەری خوا لەگەڵ خێزانەکانی دادەنیشت و گفتوگۆ و دەمەتەقێی لەگەڵ دەکردن، تەنانەت جاری وا هەبوو وەك هاوڕێیەك دەربارەی کۆمەڵە پرسێك ڕاوێژی پێ دەکردن. گومانی تێدا نییە پێغەمبەری خوا بە هیچ جۆرێك ئاتاجی بیر و بۆچوونی ئەوان نەبووە؛ چونکە نیگای خوایی پشتیوانی بوو. بەڵام ئەو دەیویست بەو ڕەفتارەی شتێك فێری ئوممەتەکەی بکات. بە پێچەوانەی بیری باو و سەپاوی ئەو ڕۆژگارەوە، ئافرەت بەرزدەکرایەوە بۆ پایەیەکی گەلێك بەرز و بڵند. وەك هەمیشە، دیسانەوە لە ماڵەکەی خۆیەوە دەستی دەکرد بە پراکتیزەکردنی ئەمە.

... نموونەیەك

پەیمانی حودەیبیە بەلای موسوڵمانانەوە زۆر قورس بوو. بەجۆرێك هەموان هێز و پێزیان لەبەر بڕابوو. لەم نێوەندەشدا پێغەمبەری خوا فەرمانیدا بەو هاوەڵانەی یاوەرییان دەکرد بۆ عەمرە، قوربانییەکانیان سەرببڕن و لە ئیحرام دەربچن. بەڵام هاوەڵان بە نیازی ئەوەی "تۆ بڵێی گۆڕانکارییەك بەسەر بڕیارەکەدا بێت؟" مەسەلەکەیان کەمێك بە قورسی گرتبوو. پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) جارێکی تر فەرمانەکەی دووبارە کردەوە. بەڵام چاوەڕوانیی پڕ ئومێدی هاوەڵان نەگۆڕا.. بەڵێ، ئەمە هەرگیز سەرپێچی نەبوو لە فەرمانی پێغەمبەر. ئەوەندە هەبوو ئەوانیش چاوەڕێی فەرمانێکی جیاوازتر بوون. چونکە بە مەبەستی تەوافی ماڵی خوا کەوتبوونە ڕێ.

ئەگەری ئەوە هەبوو بەندەکانی حودەیبیە ڕۆشنایی واقیع بەخۆیانەوە نەبینن و گۆڕانکاری بەسەر ڕێکەوتننامەکەدا بێت.

هەر کە سەرداری جیهانیان ئەم حاڵەتەی هاوەڵانی بینی، ڕاستەوخۆ چووە ناو

چادرەکەی و لەگەڵ دایکی ئیمانداران، ئوم سەلەمەی خێزانی کەوتە ڕاوێژکردن. ئەم خاتوونە ئاسۆ فراوانە، تەنها لەبەر ڕێزگرتنی بەهای ڕاوێژ هاتە قسە. چونکە ئەویش زۆرباش دەیزانی کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە هیچ شێوەیەك پێویستی بە بیر و بۆچوونی ئەو نییە.. سەروەرمان لەرێی ئەو ڕاوێژەوە وانەیەکی کۆمەڵایەتی فێردەکردین. هیچ ڕێگرییەکیش نییە لەوەی لەوجۆرە حاڵەتانەدا ڕاوێژ بە ئافرەتان بکرێت.

ئەوەبوو دایکمان ئەم چەند وشەیەی عەرزی پێغەمبەری خوا کرد: "ئەی نێردراوی خوا، جارێکی تر فەرمانەکەت دووبارەمەکەرەوە. چونکە لەوانەیە سەرپێچی بکەن و بەو هۆیەشەوە لەناوبچن. بەڵکو تۆ قوربانیی خۆت بکە و بێ ئەوەی هیچ شتێکیش بڵێیت لە ئیحرام دەربچۆ. جا وەختێك تێدەگەن فەرمانەکەت براوەیە، ئیدی بیانەوێت یان نا گوێڕایەڵیت دەکەن." پێغەمبەری خواش هەروا بیری دەکردەوە. یەکسەر چەقۆی گرتە دەست و قوربانییەکەی خۆیی سەربڕی. وەختێك هاوەڵان بینییان پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) خەریکی سەربڕینی قوربانییەکانییەتی، دەمودەست ئەوانیش کەوتنە سەربڕینی قوربانییەکانیان. ئیدی هەموو لایەك تێگەیشتن کە گەڕانەوە نییە لەو بڕیارەی دراوە.

خۆم پێناگیرێت ئەپرسم: "کێ لە ئێمە توانیویەتی بەو ئەندازەیە بایەخ بە ئافرەتان بدات؟ چەند سەرۆك وڵات هەیە لە هەستیارترین ساتەوەختدا ڕاوێژ بە هاوسەرەکەی بکات؟ چەند کەس وەك سەرپەرشتیاری خێزان لە ژیانی خێزانیدا پرس و ڕا بە هاوبەشی ژینی دەکات؟ دەتوانین ژمارەی پرسیارەکان زیاد بکەین و هەمان پرسیار ئاڕاستەی سەرجەم کایە کۆمەڵایەتییەکان بکەین. دەبا گوێی هەموو ئەوانە بزرنگێتەوە کە بانگەشەی ئەوە دەکەن ئیسلام ئافرەتی بەندکردووە! دەپرسین داخۆ ئاسۆی چ فێمینیستێك تا ئەو ئاستە باڵای کردووە؟"

بەڵێ، هاوشێوەی هەموو کارە چاکەکانی دیکە، ڕاوێژ و ڕاپرسیش بۆ یەکەمجار لە خانەکەی پێغەمبەردا ناوی گۆکرا.. بەڵێ، لەگەڵ خێزانەکانی ڕاوێژی کرد. ئێمەومانانیش جارێك لە دەرگانەی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەدا دێین و دەچین، هێشتا

نازانین ئەم دەرگا ڕازئامێزە لەکوێوە دەکرێتەوە. بگرە هێشتا بۆمان نەڕەخساوە لە دەسکی دەرگاکەش بدەین. بەڵێ، ئەمڕۆ تەنانەت لە هزری ئەوانەشدا کە لافی داکۆکی مافی ئافرەتان لێدەدەن، هێشتا ئافرەت لەوە ڕزگاری نەبووە وەك بوونەوەری پلەدوو هەژمار بکرێت. لەکاتێکدا ئێمە بەو چاوەوە دەڕوانینە ئافرەت کە نیوەی تەواوکاری پێکهاتەیەکی یەکگرتووە. پارچەی یەکەیەکی ئەوتۆیە، بەکەڵکهاتنی پارچەکەی دیکە وابەستەی بوونی ئەمە. بەڵام ئێمە بڕوامان وایە کە پێکهاتەی ئینسان تەنها و تەنها بە یەکگرتنی هەردوو پارچەکە دێتە بوون. لە شوێنێکدا ئەم یەکپارچەییە بوونی نەبێت، مرۆڤایەتیش بوونی نابێت. شتێك نامێنێت ناوی ئیسلامییەت و نەتەوایەتیش بێت.

وەك چۆن سەروەرمان لە ڕەفتارەکانیدا بەرامبەر ئافرەتان نەرمونیان بوو لەرێی فەرمایشتە نوورینەکانیشیەوە هەردەم ڕێنمایی ڕەفتارەی لەو چەشنەی دەکرد.

لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێت:

"أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا وَ خِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِهِمْ خُلُقًا"

"کامڵترینی باوەڕداران لە ڕووی باوەڕەوە ڕەوشت جوانترینیانە. (مرۆڤ لەرێی ڕەوشت بەرزییەوە دەگاتە لوتکەگەلێکی وەها و بەجۆرێك بەرەو ئاسمانی مرۆڤایەتی بەرزدەبێتەوە، بە هیچ پەرستشێك ناتوانێت ئەو مەقامانە بەدەستبێنێت.) ڕەوشت جوانترینیشتان مامەڵە جوانترینتانە لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا."[1]

وەك دەبینین، بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی گەر ئافرەتان بۆ تەنها جارێك مافەکانیان بەدەستهێنابێت و تەنها جارێکیش بە شێوەیەکی ڕاستەقینە ڕێزیان لێنرابێت، ئەوجارە بووە کە حەزرەتی محەممەد (صَلَّىٰ ٱللَّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بووەتە پارێزەری مافەکانیان و ڕێزی شایستەی بۆ گەڕاندوونەتەوە.

---

١. الترمزي، رضاع ١١.

## ٤. ڕووداوی سەرپشك كردن (التخيير)

تەخییر، بریتییە لە ڕووداوی سەرپشككرانی هاوسەرانی پێغەمبەر لە لایەن پێغەمبەرەوە سەبارەت بەوەی لەگەڵیدا بژین یاخود لێی جیاببنەوە.

سەرەتای ئەم ڕووداوە هەرچۆنێك بوویێت، لە كۆتاییدا فەرمانی ڕاستەوخۆی خواوەندە بۆ پێغەمبەرەكەی. ئێستاش دەچینە خزمەت ئەو ئایەتەی لەم ڕووداوە دەدوێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾

(الأحزاب: ٢٨-٢٩)

”ئەی پێغەمبەر بەهاوسەرانت بڵێ: ئەگەر ئێوە تەنها ژیانی دونیا و ڕازاوەییەكەیتان دەوێت، وەرن با هەندێك شتومەك و پارە و سامانتان پێ ببەخشم، لەوەودواش بە جوانترین شێوە دەستبەردارتان ببم، خۆ ئەگەر ئێوە خوا و پێغەمەرەكەی و پاداشتی ڕۆژی قیامەتان دەوێت، ئەوە دڵنیا بن كە خوا بۆ چاكەكارانتان پاداشتی زۆر گەورە و بێ ئەندازەی ئامادەكردووە (پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)) هەموو هاوسەرانی یەك یەك تاقیكردەوە هەموویان خوا و پێغەمبەر و پاداشتی قیامەتیان هەڵبژارد).“

ڕەنگە لەنێو هاوسەرانی پێغەمبەردا هەندێكیان داوای كەمێك خۆشگوزەرانی زیاتریان كردبێت و وتبێتیان: ”تۆ بڵێیت ئێمەش نەتوانین هاوشێوەی موسوڵمانان كەمێك خۆشتر بژین؟ یان هەر هیچ نەبێت لە ڕۆژێكدا تەنها جارێكیش بێت چۆرێك شۆربا بخۆین؟ یاخود كەمێك زیاتر گرنگی بە جلوبەرگەكانمان بدەین؟“

له یەکەم تێڕوانیندا ئەم داخوازییە و هاوشێوەکانی کە بە دڵیاندا هاتووە، لەبەرئەوەی لە بازنەی ڕێگەپێدراودایە، لەوانەیە زۆر ئاسایی بێتە بەرچاو. بەڵام ئەوان لە خانەیەکی وەهادا بوون کە هەتاوەکو ڕۆژی قیامەت دەبووە نموونە و سەرمەشق بۆ تێکڕای ئەو لانانەی لە ئایندەدا لەسەر بنەمای ئیسلام بنیات دەنران. لەم ڕووەوە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا لە خاڵی ناوەند و چەقی مەسەلەکەدا بوون. هەربۆیە نەیاندەتوانی وەك ئافرەتانی موسوڵمانی دیکە هەڵسوکەوت بکەن، چونکە ئەوان لە موقەرڕەبین، واتە بەندە نزیکەکانی پەروەردگار بوون. ئەو شتانەی بۆ کەسانی تر مایەی پاداشت بوون، دەبوایە بۆ خێزانەکانی پێغەمبەری خوا بە گوناه دابنرانایە...

هەر کە پێغەمبەری خوا هەستی بە خواستێکی لەو جۆرە کرد لە هەندێکیاندا، یەکسەر هەڵوێستی وەرگرت. سوێندی خوارد چاوی پێیان نەکەوێت. هەواڵەکە بە هەموو لایەکدا بڵاوبووەوە. هەمووان بە خام و پەژارەوە ڕوویان کردە مزگەوت و دەستیان کرد بە گریان؛ ئاخر بچووکترین شت کە پێغەمبەری خوای دڵگران بکردایە بەس بوو بۆئەوەی موسوڵمانان بێنێتە گریان. تەواوی موسوڵمانان بە ڕادەیەك ئاوێتەی ئەو ئازارە ببوون، نارەحەتییەکی زۆر بچووکی ماڵەکەی دەمودەست دەبیسترا و هەموو بە پەرۆشییەوە دەکەوتنە چاوەڕوانی ساتەوەختی ڕەوینەوەی تەمی خەمی سەر دڵی. ئەو ڕۆژەش هەر ئەوە ڕوویدا.

ئەم هەڵوێست وەرگرتنەی پێغەمبەری خوا لە هەمان کاتدا "ڕووداوی ئیلا"شی پێدەوترێت. لەپاڵ سەرنجەکانی سەرەوەدا، کۆمەڵە کەسانێکیش هەبوون کە لە دەلاقەیەکی جیاوازترەوە دەیانڕوانییە مەسەلەکە. حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر لەو کەسانە بوون. کچی هەردووکیشیان لەناو مەسەلەکەدا بوون. وەك هەر کەسێکی تر ئەوانیش بە پەلە بەرەو مزگەوت کەوتنەڕێ.

مۆڵەتیان خواست بۆئەوەی بچنە خزمەتی، بەڵام مۆڵەت نەدران. ئیتر ئەوانیش لەناو مزگەوتدا کەوتنە چاوەڕوانی. لەدوای سێ جار دووبارەکردنەوەی داواکەیان، دواجار چوونە ژوورەوە. ئەوجا کەوتنە سەرزەنشتی کچەکانیان. پێغەمبەری خواش

لەولاوە تەماشای دیمەنەکەی دەکرد.. لەو کاتەدا تەنها ئەم چەند وشەیەی بە زاردا هات: "داوای شتانێکم لێدەکەن کە لە توانای مندا نییە."[1]

لەولاشەوە قورئانی پیرۆز ئاگاداری کردبوونەوە کە:

﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾

(الأحزاب: ٣٢)

"ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر، ئێوە وەك هیچ ئافرەتێکی تر نین."

ڕەنگە کەسانی تر بەس بە ئەنجامدانی فەرزەکان ڕزگاریان ببێت، بەڵام ئەوانەی لە چەق و کرۆکی مەسەلەکەدان و مەحرەمی ڕازی حەقیقەتگەلێکی زۆر و زەبەندەن لە حەرەمەکەیدا، دەبێت هەموو کیان و بوونیان بکەنە قوربانی ئەو ڕێیە. بەڵێ دەبێت بیکەنە قوربانی، تاوەکو هەست بە لاوازی نەکرێت لە ناوەندا.

گومان لەوەدا نییە بوونە خێزانی پێغەمبەر بۆخۆی کۆمەڵە سوودێکی مەزنی هەبوو بەڵام بیرمان نەچێت مەترسییەکانیشی بەو ئەندازە مەزن و قورس بوون. پێغەمبەری خوا بەجۆرێك ئامادەیدەکردن ببنە پێشەنگ و نموونە بۆ دین و دونیا. لەپێناو ئەوەی نیعمەتەکانی سەر بە دوارۆژ لە دونیادا نەخۆن و دووچاری زللەی ئەم ئایەتە نەبن:

﴿ أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا ﴾

(الأحقاف: ٢٠)

"هەرچی خۆشی و شادییەکتان هەبوو لە ژیانی دنیاتاندا ئەنجامتاندا بە ئارەزووی خۆتان ڕاتانبوارد."

لە ڕادەبەدەر پەرۆش بوو بۆیان و وەك چاوانی دەیپاراستن. بۆیە لە چەند ڕوویەکەوە هاونشینانی خانەی پێغەمبەر لە گوزەرانێکی سەختدا دەژیان. بەهۆی

---

١. البخاري، مظالم ٢٥؛ مسلم، طلاق ٣٤، ٣٥.

ئەو بارە سەختەشەوە جارجار داواگەلێکی بچووکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەهاتە ئاراوە. ئەوەندە هەبوو پێگەی ئەوان وەك هیچ کەسێکی تر نەبوو. تایبەتمەندییەکەیان ئەوەی دەخواست کۆمەڵە بەرپرسیارێتییەکیشیان هەبێت. بەڵێ، بۆیان نەبوو وەك خەڵکی پێبکەنن و وەك ئەوانیش بخۆن و بخۆنەوە. نەك هەر ئەوان، بەڵکو هەندێك لە پیاوچاکانیش لە هەموو تەمەنیاندا یەك دوو جار نەبێت پێنەکەنیون.. هەندێکی تریشیان تا لە ژیاندا بوون سکیان تێر نەکردووە.

فوزەیلی کوڕی عیاز هیچ پێنەکەنیوە. تەنها جارێك بینیویانە پێبکەنێت. جا کە هۆکاری پێکەنینەکەیان -ئەویش زەردەخەنە بووە نەك پێکەنین- لێپرسیوە، ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی داوەتەوە: "ئەمڕۆ هەواڵی مەرگی عەلی کوڕمیان پێگەیاندم. خۆشحاڵ بووم لەبەرئەوەی خوا ویستی لەسەر بووە، زەردەخەنەکەم لەبەرئەوە بوو."[1]

دەی گەر حاڵی پیاوە گەورەکان وابێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە حاڵی خێزانە پاکیزەکانی پێغەمبەری خوا کە سەرگەورەی هەموو گەورەکانن و لە حوکمی دایکانی سەرجەم ئوممەتدان، جیاوازتر دەبوو.

شایستەیی هاودەمی لەگەڵ پێغەمبەری خوا لە دونیا و دوارۆژدا پایەیەك نەبوو ئەوەندە بە ئاسانی بەدەستبێت. بۆیە -بەگوێرەی ئاماژەی ئایەتەکە- ئەو خانمە ناوازانە لە هەڵوێستێکدا بوون نیرادەیان خرابووە بەر تاقیکردنەوە. پێغەمبەری خوا لەنێوان هەڵبژاردنی ماڵە هەژارەکەی و زرق و باقی دونیادا سەرپشکی کردبوون. خۆ ئەگەر دونیایان هەڵبژاردایە، ئەوا لەو حاڵەتەدا سەروەری هەردوو جیهان هەموو خواستە دونیاییەکانی بۆ دەهێنانەجێ. بەڵام دواتر دەستبەرداریان دەبوو. نەخێر ئەگەر خوا و پێغەمبەرەکەیان هەڵبژاردایە، ئەوسا دەبوو ڕازیبن بەو ئاستی گوزەرانەی کە تا ئەو وەختە تێیدا بوون. چونکە ئەمە تایبەتمەندیی ئەو ماڵە بوو. جا مادەم ئەو ماڵە ماڵێکی بێوێنە بوو بۆیە

---

١. أبو نعيم، حلية الأولياء ١٠٠/٨.

دەبوو هاونشینەکانیشی بێوێنە بن. سەرپەرشتیاری خێزان کە هەرخۆی بێ وێنە بوو. کەوابێت ئەو هاوسەر و منداڵانەش کە شوێنکەوتەی ئەو سەرپەرشتیارە بوون ناچاربوون کە وەك ئەو وابن.

پێغەمبەری خوا یەکەمجار حەزرەتی عائیشەی بانگکرد و پێی وت: ''دەمەوێت مەسەلەیەکت لەگەڵ باسبکەم، بەڵام تا لەگەڵ دایك و باوکتدا قسە نەکەیت پەلە نەکەیت لە بڕیارداندا.‘‘ پاشان ئەو ئایەتەی بۆ خوێندەوە کە لە سەرەتای باسەکەوە ئاماژەمان پێدا. هەرچی وەڵامەکەی حەزرەتی عائیشەشە بە جۆرێك بوو هەر لە کچی ڕاستگۆی باوك ڕاستگۆ دەوەشایەوە: ''ئەی پێغەمبەری خوا، مەبەستت ئەوەیە سەبارەت بەم بابەتە لەگەڵ دایك و باوکم قسە بکەم؟ سوێند بە خوا من خوا و پێغەمبەرەکەی هەڵدەبژێرم.‘‘

دایکمان دیمەنەکانی دواترمان بەمجۆرە بۆ دەگێڕێتەوە: ''پێغەمبەری خوا لەگەڵ هەرکام لە خێزانەکانی قسەی کردبێت، لە هەموویانەوە هەمان وەڵامی وەرگرت. هیچ یەکێکیان لەمبارەیەوە بۆچوونێکی جیاوازی نەبوو. منیش چیم وتبوو ئەوانیش هەمان شتیان وتبوو...‘‘[١]

هەموویان هەمان شتیان دووپاتکردەوە؛ چونکە ببوون بە پارچەیەك لە پێغەمبەری خوا.. ئیتر چۆن دەیانتوانی پێچەوانەی ئەوە بڵێن. خۆ ئەگەر هاتو پێغەمبەری خوا پێی بوتنایە: ''بەدرێژایی ژیانتان بەڕۆژوو بن و هەرگیز مەیشکێنن.‘‘ ئەوا بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە ئەوەشیان بەجێدەهێنا.. هەر لەڕاستیشدا بەجێیانهێنا.. تەنانەت بە جۆرێك بەجێیانهێنا، ئیفتاری ئەو ڕۆژووە درێژەیان بەو شەربەتی مەرگە کردەوە کە فریشتەی گیانکێشان پێشکەشیکردن.

لەنێو خێزانەکانیدا هی وایان تێدا بوو کە نۆش و عەیشی ژیانی کۆشکیان تامکردبوو.. حەزرەتی صەفییە یەکێك بوو لەوانە. باوك و براکەیی لە خەیبەردا لەدەستدابوو. هەردووکیشیان لە سەردارانی خەیبەر بوون. صەفییە لەناو دیلەکانی

---

١. البخاري، مظالم ٣٥؛ مسلم، طلاق ٣٥.

جەنگدا بوو.. ئەم حاڵەتەش کاریگەرییەکی مەزنی بەسەر ئەم ئافرەتە خانەدانەوە جێهێشتبوو. هەتا ئەو کاتەی چاوی بە پێغەمبەر کەوت ڕمنگە بڵێم لە هەموو کەسێك زیاتر رقی لێ بووبێت. بەڵام هەرئەوەندەی چاوی پێکەوت، سەرجەم هەستەکانی گۆڕانکارییان بەسەردا هات.

بەڵێ، لە ماڵەکەی پێغەمبەری خوادا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) ژنگەلێکی هاوشێوەی صەفییە خاتوون هەبوو کە بە خۆشنۆشیی ژینی کۆشك راهاتبوو و لەگەڵ ئەوەشدا شانی دابووە بەر ژیانێکی هێندە سەخت و گران نەیدەتوانی پاروویەك بەدڵی خۆی بخوات. بەڵێ، پێغەمبەری خوا لەڕێی کەسایەتییە ناسکەکەیەوە بە چەشنێك چووبووە دڵیانەوە، هاودەمیی ئەو بە هەر نرخێك و لەپای هەرچییەکدا بێت، ببووە تاقانە ئاوات و خولیای یەکە بەیەکەی خێزانە پاکیزەکانی.[1]

صەفییەی دایکمان بە نەژاد جوولەکە بوو. جارێکیان یەکێك لە خێزانەکان ئەمەی دابووەوە بەڕوویدا و پێی وتبوو: "ئەی کچە جوولەکە!" ئەویش ئەم ڕووداوەی بۆ سەروەرمان گێڕابووەوە و دڵگرانی خۆی دەربڕیبوو. سەروەریشمان بەمشێوەیە دڵی دابووەوە: "گەر هاتوو جارێکی دیکە وایان پێوتیت ئەوا تۆش پێیان بڵێ: باوکم حەزرەتی هارون و مامم حەزرەتی موسا و مێردەکەشم -وەك دەبینن- حەزرەتی محەممەد موستەفایە. جا ئیتر ئێوە بەچیدا دەنازن بەسەر مندا؟"[2] ساتی هاتنە حزوور و ماڵئاوایی صەفییە خاتوون وەك یەك نەبوو؛ وەختێك پێغەمبەری خوای جێهێشت، تەواوی خەمەکانی ڕەویبوونەوە و بە دەروونێکی ئاسوودەوە ماڵئاوایی دەکرد. چونکە مێردەکەی حەزرەتی محەممەد موستەفا بوو. لەدوای ئەمەوە ئیدی ئەم وشانە زوو زوو دەبوونە میوانی سەر لێوانی.

پوختەی قسە: کەسایەتیی پێغەمبەر لە ڕوانگەی سەرپەرشتیکردنی خێزانەوە لەوپەڕی کامڵیدا بوو. سەرپەرشتێکردنی ئەو هەموو ئافرەتە بەو ئاسانییە و

---

[1]. طبراني، المعجم الكبير ٦٧/٢٤.

[2]. الترمزي، مناقب ٦٣؛ حاكم، المستدرك ٣١/٤.

ئەوپەڕی خۆشویسترانی لە لایەن هەموویانەوە و تەنانەت ئەوەش کە بووەتە ئەوینداری دڵ و.. مامۆستای ژیری و.. پەروەردەکاری ڕۆحیان.. هەروەها ئەو ڕاستییەش کە لە سەرویەندی ڕاپەڕاندنی هەموو ئەمانەدا هێندەی تۆزقاڵێك کەمتەرخەمی نەکردووە لە فەرمانبەرییەکەی سەرشانیدا و بە هیچ ڕەنگ و شێوەیەك سستی ئەنواندووە لەو کاروبارانەی سەر بە دەوڵەت و میللەت بوون، هەموو ئەمانە بەڵگەی ڕوون و ڕەوانی پێغەمبەرێتییەکەین. خۆ ئەگەر هیچ بەڵگەیەکی تریش لە ئارادا نەبوایە، ئەوا ئەو شێوازەی لە سەرپەرشتیکردنی خێزاندا پەیڕەوی کردووە، بەڵگەیەکی سەروزیاد دەبوو لەسەر ئەوەی کە لە لایەن خوای بەدیهێنەری جیهانیانەوە نێردراوە.

## ب- پێغەمبەری باوک

ئاشکرایە پێغەمبەری خوا لە سەرجەم بوارەکانی ژیاندا لە لوتکەدا بووە. جا بۆیە وەختێك مرۆڤەکان هەوڵی ناسینی ئەو زاتە دەدەن، دەبێت لە ئاستی نیگای خۆیانەوە بۆی نەڕوانن، یاخود هەڵنەستن بە هەڵسەنگاندنی لە ڕوانگەی ئەو هاوسەردەمانەیانەوە کە بە گەورەیان دەزانن. لەولاشەوە هەرکات لێکۆڵەران ویستیان بیناسن، دەبێت بەردەوام سەربڵندترین لوتکەکان بهێننە پێشچاوی خۆیان و بە ئەندێشە لەسەر قەدپاڵە بەرزەکان بێن و بچن تاوەکو بەرامبەر ئەو زاتەی ویردی سەرزوبانی ڕۆحانییەکانە، قەدر نەزانانە مامەڵە نەکەن.

بەڵێ، گەر ئەوان پەرۆشی ناسینی حەزرەتی محەممەدن، ئەوا چار نییە جگە لەوەی لە ئاسۆکەی خۆیدا بەدوایدا بگەڕێن؛ ئاخر لەڕێی ئەندێشەی کەسانێکی وەك ئێمەوە کە هەر نازانین خەیاڵکردنیش چییە، ئەستەمە بگەیت بەو سەروەرە. خوای باڵادەست وەك بەهرەمەندییەکی سوبحانی خۆی، لە سەرجەم بوارەکاندا باڵادەستی پێبەخشیبوو.

مایەی شانازیی مرۆڤایەتی وەك تابلۆیەکی شانازی ژیا و هەرواش ئاوابوو.

بەشەریەت جارێکی تر وێنە و هاوتای ئەوی بەخۆیەوە نەبینی و ناشیبینێت. وەك چۆن بەشەریەت نەیبینی، هەندێك لە هاوسەردەم و تەنانەت کەسە نزیکەکانیشی نەیانبینی. ڕەنگە زۆرێکیان هاوشێوەی ئەو گوڵانەی بوونیان بەندە بە خۆرەوە، مەگەر تەنها بە گەنینی ناخیان تێگەیشتبن لەوەی کە ئەو ئاوابووە.. ئەویش تێگەیشتنێکی بێهودە، چونکە ئەوکات زۆر دڕەنگ بوو. بێگومان ژمارەی ئەوانەی لەناو ئوممەتەکەیدا دەیناسن و ڕێز و قەدری دەزانن هەمیشە زیاتر بووە.

سەرباری تێپەڕبوونی ١٤ سەدە کەچی تاوەکو ئەم ساتەش کە بە خەدیجە، عائیشە، ئومو سەلەمە یان حەفصە دەڵێین "دایە"، زۆر لەوە زیاتر هەست بە چێژ دەکەین کە بە دایکی خۆمان دەڵێین "دایە." هەڵبەتە هەست و چێژی ئەو سەردەمە قووڵتر و لەدڵەوەتر و ڕەگداکوتاوتر بووە. هەموو ئەمانەش بەهۆی ئەوەوە بوون. ئەوەتا حەزرەتی ئەبوبەکر بە عائیشەی کچی دەوت "دایکی ئازیزم." مەگەر قورئانیش هەروای نەدەفەرموو:

﴿ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡ ﴾

(الأحزاب: ٦)

"خێزانەکانی پێغەمبەر دایکانی باوەڕدارانن."

حەزرەتی ئەبوبەکریش هەر لەم ڕوانگەیەوە کیژە نازدارەکەی بە "دایکە" بانگ دەکرد.

ئەوەندە هەبوو کە هەموو ئەو ڕووتێکردن و ستایش و قەدرزانیە بەس نەبوو بۆ ڕەواندنەوەی خەم و پەژارەی ئەو قەدرزانە ڕاستەقینانە. تەنانەت سروەی خۆشبەختییەکانی دواتریش نەیتوانی ئەدگاری ئەو پەژارەیە لەسەر ڕوخساریان لابدات. هەتا ئەو ڕۆژەش کە دواهەمینیان ماڵئاوایی لە دونیا کرد، ژین و ژان و هەستان و دانیشتنیان هەر خەم و ماتەم بوو.

بەمشێوەیە، لەپاڵ ئەوەدا کە نەخشی نموونەییترین سەرپەرشتیاری خێزانی

دەنەخشاند لە سینەی هاوسەرەکانیدا، هاوکات باوکێکی قووڵ و کامڵ بوو.. بەدڵنیاییەوە بە ئەندازەی باوکایەتییەکەی باپیرێکی بێوێنەش بوو کە ئەو لەم ڕووەوە تەمسیلی لایەنێکی ڕەهەنداری دەکرد.. بەڵێ، لەم مەیدانەشدا هاوتا و وێنەی نەبوو.

لەگەڵ منداڵ و نەوەکانی بەوپەڕی سۆز و میهرەبانی دەجووڵایەوە.. لەم سەروبەندەشدا ڕوانینیانی ئاڕاستەی دواڕۆژ و کاروبارە بەرزەکان دەکرد و سستی نەدەنواند لەم بابەتەدا. لە ئامێزی دەگرتن و بزەی بەڕوویاندا دەنواند.. دەستی بەسەریاندا دەهێنا و ڕێزی لێدەگرتن.. لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز ڕازی نەدەبوو فەرمانبەرییەکانی دواڕۆژیان فەرامۆش بکەن.

بۆیە لەم چوارچێوەیەدا تابلێی کراوە بوو لەگەڵیان. کەچی وەختێك دەهاتە سەر ڕەچاوکردنی پەیوەندی لەگەڵ خوادا لە ئەندازەبەدەر جددی و شکۆمەند بوو. لە لایەکەوە لە چوارچێوەی ئازادی و سەربەستیدا فێری ژینی مرۆڤانەی دەکردن، لەولاشەوە بواری ئەوەی بۆ نەدەهێشتنەوە خەمسارد و کەمتەرخەم دەربچن. نەك هەر بواری نەدەدان، بە پێچەوانەوە، لە بەرامبەر کاڵبوونەوەی بەها ڕۆحییەکان لە دڵ و دەروونیاندا بە تەواوی هەستیارییەوە ڕادەپەڕی و بەردەوام بەگوێرەی جیهانە بەرزەکان ئامادەی دەکردن. پێغەمبەری خوا بەم جۆرە تێگەیشتنەی لە چەمکی پەروەردە، دیسانەوە نمایندەی ڕاستەڕێی دەکرد، ئەو ڕاستەڕێیەی کە لە هەموو چەشنە پەڕگیرییەك دوورە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا ڕەهەندێکی تری فەتانەکەیەتی.

## ١. سۆز و بەزەییەکەی بەرامبەر منداڵ و نەوەکانی

لە فەرموودەیەکدا کە لە صەحیحی موسلیمدا بەرچاومان دەکەوێت، ئەنەسی کوڕی مالیك، ئەو هاوەڵە بەڕێزەی کە بێ دابڕان بۆ ماوەی دە ساڵ بە کەماڵی وەفا و دڵسۆزییەوە بەهرەمەندی شەرەفی خزمەتکردنی حەزرەتی رسول الله بووە، بۆمان دەگێڕێتەوە:

"مَا رَأَيْتُ أَحَدًا كَانَ أَرْحَمَ بِالْعِيَالِ مِنْ رَسُولِ الله (صَلَّىَ الله عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)"

"کەسم نەدیوە هێندەی پێغەمبەری خوا بەسۆز و میهرەبان بوویێت لەگەڵ خاو و خێزانەکەیدا."[1]

بەڵێ، ئەوەندە میهرەبان و هێندە خۆش مامەڵە و بە ڕادەیەکیش دڵفراوان بوو مەحاڵە ڕێت لە سەرپەرشتیار و باوکێکی وەکو ئەو بکەوێت.

خۆ ئەگەر ئێمە ئەم گەواهیەمان بدایە، ئەوا لەوانەبوو بایەخێکی ئەوتۆی نەبوایە. کەچی ئەوەتا ملیۆنان مرۆڤی خاوەن سۆز و شەفەقەت کە تەنانەت دڵیان نایەت ئازاری مێرووڵەش بدەن، ڕایدەگەیەنن و گەواهی دەدەن کە لە باوەشکردنەوەی پڕ میهر و بەزەییانەدا بۆ تەواوی مەوجودات، حەزرەتی محەممەد وێنە و مانەندی نییە.

بەڵێ، هاوشێوەی هەمووان ئەویش وەك مرۆڤ بەدیهێنرابوو بەڵام بە مەبەستی دروستکردنی ڕایەڵەی پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤەکاندا، خوای گەورە خۆشەویستییەکی قووڵی بەرامبەر هەموو مەوجودات خستبووە دڵیەوە. هەربۆیە چ بەرامبەر ئەندامانی خێزانەکەی بێت یان بەرامبەر دەوروبەرەکەی، لێوان لێو بوو لە سۆز و خۆشەویستییەکی بێ وێنە.

منداڵە کوڕەکانی هەموو پێشتر وەفاتیان کردبوو. دواجار لە ماریەی دایکمان کوڕێکی هاتە دونیا، بەڵام ئەویش ئەوەندە نەژیا. تا جگەرگۆشەکەی لە ژیاندا بوو لەبەینی دمەها کاروباری گرنگدا زوو زوو سەری لە ڕۆڵە نازدارەکەی دەدا.. لە ئامێزی دەگرت و تێر ماچی دەکرد.[2] وەختێك گیانیشی سپارد دیسانەوە گرتیەوە ئامێز و نوساندی بەخۆیەوە و بەدەم چاوی پڕ ئەسرینەوە گوزارشتی لە دڵگرانی و پەژارەی ناخی کرد. ئەوجا ڕووی کردە ئەوانەی بە سەرسوڕمانەوە بۆیان دەڕوانی، پێی وتن: "بەڕاستی دڵ خەمبار دەبێت و چاوانیش ئەشکیان

---

١. مسلم، فضائل ٦٣؛ أحمد بن حنبل، المسند ١١٢/٣.

٢. مسلم، فضائيل ٦٢-٦٣؛ أحمد بن حنبل، المسند ١١٢/٣.

لێ دەڕژێت، بەڵام پشتیوان بە خوا جگە لەوەی خوا فەرمووبەتی و ئەوەیش کە ئەو پێی رازییە، شتێکی تر نایەت بەدەمماندا.“ بەدواشیدا ئاماژەی بۆ زمانی کرد و فەرمووی: ”بەڵکو خوا بەهۆی ئا ئەمەوە لێمان دەگرێت.“[1] رێبدەن جارێکی دیکە دووپاتی بکەینەوە: ئەو میهرەبانترین و بەسۆزترینی مرۆڤەکان بوو. حەزرەتی حەسەن و حسێنی دەخستە سەرشانی و لێرە و لەوێ دەیگەڕاندن. کەسێك لەو ئاستەدا بێت ئایا منداڵ دەخاتە سەرشانی و بەو شێوەیە دەچێتە ناو خەڵکەوە؟ ئەو دەیخستە سەرشانی و دەشچووە ناو خەڵکەوە. بەو کارەشی وەك بڵێی پێشوازی لەو شەرەفە دەکرد کە لە داهاتوودا بەدەستیاندەهێنا. ڕۆژێکیان کە حەزرەتی حەسەن و حسێن لەسەر کۆڵی بوون، حەزرەتی عومەر خۆی کرد بە خانەی بەختەوەریدا. وەختێك هەردووکیانی لەو شوێنە موبارەکەدا بینی، گوتی: ”نِعْمَ الْفَرَسُ تَحْتَكُمَا“ ”ئەسپێکی چەندە جوانتان هەیە!“[2] بە بیستنی ئەمە، پێغەمبەری خوا یەکسەر هاتە قسە و فەرمووی: ”نِعْمَ الْفَارِسَانِ هُمَا“ ”ئەوانیش چ سوارچاکێکی جوان و چاکن!“ ئەوان درکیان بەم مەسەلەیە کردبێت یان نا، پێغەمبەر ئا بەو جۆرە ڕێزی لێدەنان. جارێکی تریشیان کە یەکێك بە حەزرەتی حەسەنی وت: ”نِعْمَ الْمَرْكَبُ رَكِبْتُ“ ”بەڕاستی سەرنشینی شوێنێکی چاك بوویت!“ لە وەڵامدا ئەویش فەرمووی: ”وَنِعْمَ الرَّاكِبُ هُوَ“ ”ئەویش چ سوارچاکێکی چاکە!“[3]

بەڵێ، ئەو نازدارە جاروبار دوو ڕەیحانەکەی بەهەشتی دەخستە سەرپشتی و بەوەش ڕێز و پایەیەکی تایبەتی دەبەخشی بەو دوو پێشەوا مەزنەی ئەهلی بەیت، کە باوکی هەموو پیاوچاکانن هەتا ڕۆژی دوایی و لە ماهییەتیاندا ناوکی سەرجەم ئەو شکۆ و شەرەف و سەروەرییەیان هەڵگرتووە کە دۆستانی خوای لێ بەهرەمەندکراون. گومانی تێدا نییە ئەهلی بەیت و تەواوی دۆستانی خوا

١. البخاري، جنائز ٤٤؛ مسلم، فضائل ٦٢؛ جنائز ١٢.

٢. بزار، المسند ١/٤١٨/

٣. الترمزي، مناقب ٣٠؛ حاكم، المستدرك ١٨٦/٣.

پشکی خۆیان هەیە لەو بەها و بایەخەی دەدرا بە حەزرەتی حەسەن و حسێن. لەبەر ئەمەیە کە شێخ عەبدولقادری گەیلانی، کە کەسایەتییەکی نایاب و مەزنی ئەهلی بەیتە، لەو ڕوانگەیەوە کە پێغەمبەری خوا باپیرانی لەسەرشانی هەڵگرتووە، دەڵێت: "پێیە موبارەکەکانی پێغەمبەری خوا لەسەر شانی منن، پێیەکانی منیش لەسەرشانی سەرجەم ئەولیاکانە."[1] پێدەچێت ئەمە تا ڕۆژی قیامەتیش هەروا بەردەوام بێت.

جارێکی تریشیان نەوەکانی دەچنە سەرشانی، ئەویش ڕوویان تێدەکات و پێیان دەڵێت: "نِعْمَ الْجَمَلُ جَمَلُكُمَا وَنِعْمَ الْعِدْلَانِ أَنْتُمَا" "وشترەکەتان چەندە وشترێکی نایابە، ئێوەش چەندە بارێکی نایابن!"[2]

ئەو بەمجۆرە منداڵ و نەوەکانی خۆشویست و لە دڵیاندا تەختی ئەوینی دانا. لەولاشەوە ئەویش بەهرەمەندی خۆشەویستییەکی وەهابوو هیچ باوك و باپیرێك بەخۆیەوە نەدیوە.

بەوێنەی بابەتەکانی دیکە، پێغەمبەری سەروەر لە بابەتی پەروەردەی منداڵیشدا پەیڕەوی ناوەندڕێی کردووە. سەرجەم منداڵ و نەوەکانی وەك گیانی خۆی خۆشدەویست و ئەم خۆشەویستییەشی بۆ دەردەبڕین. لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز ڕێی نەدەدا ئەم خۆشەویستییەی بقۆزرێتەوە و خراپ بەکاربهێنرێت. دەبێت ئەوەش بڵێین کە لەنێوان منداڵ و نەوەکانیدا کەسیان ئارەزووی پەنابردنە بەر ڕەفتارێکی لەو جۆرەیان نەبووە. بۆیە دەبینی لە بەرامبەر ئەو هەڵانەدا کە بەبێ ویست ئەنجامیان دەدا، هەڵوێستی پێغەمبەر وای دەکرد بەرگێك لە شکۆ و ویقار دەوری ئەو خۆشەویستییە قووڵەی بدات و بەریان پێبگرێت لەوەی لە زەمینەی گوماناویدا بێن و بچن. بۆ نموونە، جارێکیان حەزرەتی حەسەن یاخود حسێن لەبەرئەوەی کە هێشتا تەمانیان بچووك بوو دەستی برد بۆ ئەو بەشە خورمایەی

١. منوي، فيض القادر ١٦/٦.

٢. طبراني، المعجم الكبير ٥٢/٣.

کە هی سەدەقە بوو. پێغەمبەری خوا هەر کە ئەمە دەبینێت، یەکسەر خورماکەی لەدەست دەسەنێت و بە نەرمی پێی دەڵێت: "خورمای سەدەقە بۆ ئێمە حەرامە."[1] هەر لەو تەمەنەوە گۆشکردنیان لەسەر هەستیاری بەرامبەر حەرام، پێموایە یەکێك بێت لە نموونە جوانەکانی ڕاگرتنی هاوسەنگی لە پەروەردەدا.

هەرجارێك تەشریفی مویارەکی بهێنایەتەوە مەدینەی مونەووەرە، پۆلێك منداڵ دەوریان دەدا و پێشوازییان لێدەکرد.[2] ئەمە مانای وایە کە خۆشەویستی سەروەرمان تەنها سنووورداری ڕۆڵەکانی خۆی نەبووە، بەڵکو تەواوی منداڵانی بە کەماڵی بەزەیی و سۆزەوە لە ئامێز گرتووە و بە خۆشەویستی دڵی فەتح کردوون.

ئەوجا ئەوە تەنها منداڵانی کوڕ نەبوون کە لە بازنە بەرینەکەی میهری ئەودا جێیان ببووەوە. حەزرەتی حەسەن و حسێنی چۆن خۆشدەویست، ئومامەی نەوەشی ئا بەو جۆرە خۆشدەویست. بە ڕادەیەك، جاری وابوو کە دەچووە دەرەوە ئومامە لەسەر کۆڵی بوو. تەنانەت هەندێك جار لە نوێژە سوننەتەکاندا ئومامە خۆی هەڵدەدایە سەرشانی و ئەویش لەگەڵ خۆیدا هەڵی دەگرت. وەختێکیش دەگەیشتە کڕنووش دایدەنا، کاتێکیش هەڵدەستایەوە دیسان دەیخستەوە سەرشانی.[3]

جێی باسە ئەم خۆشەویستی دەربڕینەی پێغەمبەری خوا بۆ ئومامە لەناو کۆمەڵگەیەکدا بوو هەتا دوێنێ کیژەکانیان بە زیندوویی ئەسپەردەی هەناوی خاك دەکرد. لەڕاستیدا ئەم ڕەفتارەی سەروەرمان شتێکی تەواو جیاواز بوو بۆ خەڵکی ئەو سەردەمە، هەنگاوێکیش بوو لە هەنگاوە بێ پێشینەکانی بۆ سەرلەنوێ داڕشتنەوەی چەمکەکان لە ژیهنی کۆمەڵدا.

---

١. البخاري، زكاة ٦٠، مسلم، زكاة ١٦١.

٢. البخاري، جهاد ١٩٦؛ مسلم، فضائل الصحابة ٦٥-٦٨، أبو داود، جهاد ٥٤.

٣. الترمزي، مناقب ٦٠؛ أبو داود، أدب ١٤٣.

## ٢. سۆز و خۆشەویستییەکەی بۆ حەزرەتی فاتیمە

لە ئیسلامدا جیاکاری نێوان کوڕ و کچ بوونی نییە. پێغەمبەری خواش خۆی بەکردەیی ئەمەی خستە بەرچاو. ئاخر کەی ڕەوایە جیاکاری، لەکاتێدا گەر یەکێکیان حەزرەتی محەممەد بێت، ئەوی تریان حەزرەتی خەدیجەیە. گەر یەکێکیان ئادەم بێ ئەوی تریان حەوایە. گەر یەکێکیان عەلی بێ بێشک ئەوی تریان فاتیمەیە.

ئەو فاتیمەیەی کچی پێغەمبەری خوایە و دایکی تێکڕای ئالوبەیتە هەتاوەکو ڕۆژی پەسڵان. لە هەمان کاتدا دایکی ئێمەشە.

جا بۆیە هەرکات فاتیمە نازدار و نازەنینەکەی بهاتایە بۆ لای، لەبەری هەڵدەستا و دەستی دەگرت و بەوپەڕی ڕێزەوە لە شوێنەکەی خۆی دایدەنیشاند. ئینجا دەکەوتە هەواڵ پرسینی و دەستی بە سەر و سیمایدا دەهێنا. لە ڕۆشتنەوەشدا بە هەمان شێوە بەڕێی دەکرد.

جارێکیان حەزرەتی عەلی ویستی بچێتە داخوازی کچەکەی ئەبو جەهل. ڕاستە ئەم ژنە موبارەکە هاوشێوەی عیکریمەی برای هاتبووە ناو ئیسلامەوە و خۆی گەیاندبووە کاروانی ئەبەدیەت، بەڵام لەوانەبوو حەزرەتی فاتیمە بەم هاوسەرگیرییە ئاسوودە نەبێت. لەوانەشە حەزرەتی عەلی هەر بە بیریشیدا نەهاتبێت کە وەها هەنگاوێك بەو رادەیە فاتیمە بێزار دەکات. حەزرەتی فاتیمە دەچێتە خزمەت پێغەمبەر، دۆخەکەی بۆ ڕوون دەکاتەوە و گوزارشت لە بێتاقەتی خۆی دەکات. وەختێك باوکی میهرەبان دڵشکاویی کیژە تاقانەکەی دەبینێت، زۆر خەمبار دەبێت. بۆیە ڕاستەوخۆ دەچێتە سەر مینبەر و وتارێك پێشکەش دەکات: "بیستوومە عەلی دەیەوێت ژن بەسەر فاتیمەدا بهێنێت. ئەگەر عەلی سوورە لەسەر ئەم نیازەی، ئەوا دەبێت فاتیمە تەڵاق بدات. چونکە ئەم کارە فاتیمەی خەمبار کردووە. فاتیمە پارچەیەکە لە من؛ ئەوەی ئەو بڕەنجێنێت منی ڕەنجاندووە. ئەوەشی ئەو دڵخۆش بکات منی دڵخۆش کردووە."

لەناو ئەو کۆمەڵەدا کە گوێبیستی ئەم قسانە بوون حەزرەتی عەلیش ئامادەبوو.. دەستبەجێ لە نیازەکەی پێشووی پاشگەز بووەوە و گەڕایەوە بۆ لای فاتیمەکەی.[1]

لەڕاستیدا حەزرەتی عەلی هەروەك گلێنەی چاوی کچەکەی پێغەمبەری خۆشدەویست، بەدڵنیاییەوە فاتیمەش ئەوی لە خۆی خۆشتردەویست و هەستی بەو وابەستەییەش کردبوو کە هاوسەرەکەی هەیەتی بۆی. وەك بشلێی ئەم ئافرەتە نیانە بەدەر لەوەی ببێتە تۆوێك بۆ سەرجەم ئەولیا و ئەصفیا، ئەرکێکی تری نەبێت.. هەموو بایەخ و پەرۆشییەکی بۆ باوکی و بانگەوازەکەی بوو. ئەوکاتەی پێغەمبەری خوا لە دوا ساتەکانیدا هەواڵی وەفاتی خۆیی پێدا، ئەوەندە گریا دونیای هێنایە لەرزە؛ وەختێکیش ڕازی ئەوەی بەگوێدا چرپاند کە ئەو یەکەم کەس دەبێت دوای خۆی وەفات دەکات و پێی شاد دەبێتەوە، لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بکات. دەی چ شتێك جگە لە خۆشەویستی دەتوانێت ڕاڤەی ئەم دیمەنە بکات؟[2]

بەڵێ، باوك کچەکەی و کچیش باوکی زۆر خۆشەویست. سەرباری ئەمەش پێغەمبەری خوا هاوسەنگی دەپاراست و هەردەم لە چوارچێوەی کۆمەڵە پێوەرێکدا هەڵسوکەوتی دەکرد و ئامادەی دەکرد بۆ جیهانگەلێك کە دەبوو ڕۆحی ئینسان هەڵبکشایە بۆیان. چونکە پێکەوەیی هەتاهەتایی تەنها لەوێدا دەهاتە دی. هاودەمیی حەزرەت و فاتیمەی کچی لە دونیادا تەنها ٢٥ ساڵی خایەند. ئەوەبوو شەش مانگ دوای وەفاتی باوکی و لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا ئەویش ماڵئاوایی لە دونیا کرد.[3]

---

١. البخاري، نكاح ١٢، ١٦؛ مسلم، فضائل الصحابة ٩٣-٩٦.

٢. البخاري، مناقب ٢٥؛ مسلم، فضائل الصحابة ٩٨-٩٩.

٣. حاكم، المستدرك ٣/١٧٦-١٧٧؛ إبن حجر، الإصابة ٨/٥٤، ٥٧.

## ٣. ئامادەکردنی منداڵەکانی بۆ ژیانی هەمیشەیی

پێغەمبەری خوا بەو سروشتە خۆڕسکەی کە خاوەندی دلۆڤان لە ناخی هەموو ئینسانێکدا دایناوە، ئاواتەخوازی ژیانی هەمیشەیی بوو. بەڵێ، مرۆڤ بۆ ئەبەدییەت بەدیهێنراوە. مەحاڵیشە لە غەیری ئەبەدییەت و ئەو زاتەی کە ئەبەدییە بە شتێکی تر تێر ببێت. بۆیە غەیری ئەو زاتە دڵی بۆ شتێکی دیکە ناشنێت.. هەستیشی پێبکات یان نا، هەردەم خوازیار و عەوداڵی ئەومیە. هەتاوەکو ئەبەدییەتیشی پێ نەبەخشی، ئەستەمە هەستەکانی تێرببن و سۆراغی گیانی ئەمریخوازی ئۆقرە بگرێت.

بەڵێ، چەندین خواست و ئارەزووی بێسنوور و ناکۆتا لە ناخی ئەم ئینسانەدا ڕەگیان داکوتاوە. هەرچییەکی دەدەیتێ بیدەرێ، هێشتا هەر ناتوانیت تێری بکەیت. جا خۆ بناغەی پەیامی تەواوی ئایین و پێغەمبەرانیش هەر ئەم کۆڕێسا ئەودیو دونیاییەیە. پێغەمبەری خوا لە لایەکەوە بە چەپکی ئاسوودەیی گوڵبارانی دەکردن و لەملاشەوە سستی نەدەنواند لەوەی ئامادەیان بکات بۆ بەختەوەریی هەمیشەیی. دیارترین نموونەی ئەمە لەم بەسەرهاتەی خوارەوەدا دەبینین:

جارێکیان دایکە فاتیمەمان ملوانکەیەکی لە ملدا دەبێت و دێتە خزمەت پێغەمبەری خوا. لە ڕیوایەتێکدا سەروەرمان ملوانکەکە لە ملی لێدەکاتەوە. لە ڕیوایەتێکی تردا ملوانکەکە لە دەستی حەزرەتی فاتیمەدایە و پێغەمبەری خوا پێی دەڵێت:

”حەزدەکەیت خەڵکی بڵێن: -لێرەدا چ جیاوازییەك نییە لەوەی مەبەست لە خەڵکی، مرۆڤەکان بێت یاخود ڕۆحانی و فریشتە و هاونشینانی ئاسمانەکان- کچەکەی پێغەمبەری خوا ملوانکەیەکی ئاگرینی لەدەستدایە؟“

بەڵێ، لە لایەك ڕێزی لێدەگرتن و لە لایەکی تریشەوە تەواوی ڕوانین و بایەخیانی ڕووەو ئاخیرەت و خوا و جوانییە جاویدانییەکان وەردەگێڕان. فاتیمە ئەوەندەی بەس بوو. ئاخر ئەمە قسەی کەسێك بوو کە لە دڵیدا جێی کردبووەوە

و هەموو لایەنە ناسکەکانی ناخی فەتح کردبوو. بۆیە حەزرەتی فاتیمە دەڵێت: "هەر لەوێدا ملوانکەکەم فرۆشت.. ئەوجا کۆیلەیەکم پێکڕی و ئازادم کرد.. پاشان چوومە حزووری حەزرەت و چیم کردبوو بۆم گێڕایەوە. شادومانی لە ڕوخساریدا دەرکەوت، ئینجا دەستەکانی بەرزکردەوە و بەمشێوەیە ستایشی پەروەردگاری کرد: "اَلْحَمْدُلِلّٰهِ الَّذِي أَنْجَى فَاطِمَةَ مِنَ النَّارِ" "سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە فاتیمەی لە ئاگر ڕزگارکرد."[1]

گومانی تێدا نییە حەزرەتی فاتیمە بەو ملوانکەیەی کردبوویە ملی کارێکی حەرامی ئەنجام نەدابوو. بەڵام پێغەمبەری خوا دەیویست لە بازنەی موقەررەبین، واتە نزیکانی پەروەردگاردا بیهێڵێتەوە. واتە بەئاگاهێنانەوەکەی لە سۆنگەی تەقوا و قوربییەتەوە بووە. ئەمە بۆخۆی لە ڕوویەکەوە تابلۆی دونیانەویستی و زیاد لەوەش، نموونەی ئەو هەستیارییە بوو کە دەکەوتە ئەستۆی دایکی ئەو کۆمەڵەی کە تا ڕۆژی قیامەت نمایندەییان دەکرد و پێیان دەگوترا ئالوبەیت.

هەڵبەتە دایکایەتی کردنی کانگای ڕۆشنایی خواپەرستانێك لە وێنەی حەسەن و حسێن و زەینولعابدین کارێکی هەروا ئاسان نەبوو. پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هەر لەوکاتەوە ئامادەی دەکرد بۆ ئەوەی ببێتە دایکی ئالوبەیت و مەردانێکی هاوشێوەی شاهی گەیلانی و محەممەد بەهائەددین نەقشبەندی و ئەحمەد ریفاعی و ئەحمەد بەدەوی و شازەلی و چەندانی دیکە. وەك ئەوە وابوو پێی بڵێت: "کچی خۆم، تۆ دەچیتە ماڵە مێردێکی وەها و دەبیتە بوکی خانەیەکی وا، لە زنجیرەبەندییەکەیدا هێندەی دونیایەك ئەڵقەی زێڕین دێتە مەیدان. تۆ واز لەو ملوانکە ئاڵتونە بێنە و چاوت لەوە بێت ببیتە دایکی ئەوانە." ئەڵقەی زێڕینی نەقشبەندی و رافیعی و شازەلی و سەدان تەریقەتی پایە بڵندی دیکە...

بەڵێ، شتێکی هەروا سانا نییە ببێتە دایکی ئەولیا و ئەبرار و موقەررەبین. بۆیە لەم ڕووەوە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەرامبەر ئەندامانی

---

١. النسائي، زينة ٣٩؛ أحمد بن حنبل، المسند ٥/٢٧٨-٢٧٩.

خێزانەکەی هەستیارتر و پێداگرتر بوو. ئەو بەم ڕەفتارانەی هاودەم لەگەڵ سۆز و نەرمونیانییەکەیدا، ڕووی وەردەگێڕانە دواڕۆژ و دیوێکی دیکەی ڕاستەڕێی وەبیردەهێنانەوە. هەروەها ئاگاداری دەکردنەوە لە داخستنی دەرگا و پەنجەرەکانیان بەڕووی هەموو جۆرە خراپە و بەدڕەفتارییەکدا و پێی ڕادەگەیاندن کە: "خوایە مەقسود و ئامانجی ئێوە!" دواتر لەنێو ڕێبوارانی ئەم ڕێیەدا کەسانێکی وا هەڵدەکەوتن، تەواوی تەمەنیان بە تاسەی دیدار و کۆششی قوربەتەوە بەسەر دەبرد و لەتاو شەیدایی خوا ویردی زوبانیان دەبووە:

"بەهەشت بەهەشتیانە خەڵکی
سێ چوار کۆشکە و چەند حۆری
خوایە کێ خوازیارە بیدەرێ
من تۆم گەرەکە تۆ!"

بەم پێیە، پێغەمبەری خوا وەك یەکێك لە داخوازییەکانی خۆشەویستی ڕاستەقینە، خۆشەویسترین کەسەکانی لە هەموو چەشنە چەپەڵییەکی دنیایی پاکژدەکردەوە و بواری نەدەدا تۆز و خۆڵی دنیاویستی بپرژێتە دامەنیان و هانی دەدان بۆ پێکەوەیی ئەودنیا. بەڵێ وایە، "مرۆڤ لەگەڵ ئەوەدایە کە خۆشی دەوێت."[1] گەر حەزرەتی محەممەدتان خۆشدەوێت، ئەوا لەسەر ئەو ڕێ و ڕێبازە دەبن کە ئەوی لەسەر بووە. ئەوانەی لەسەر ڕێ و ڕێبازی ئەون لەودنیاش لەگەڵی دەبن.

وەك ئاماژەمان پێدا، لەپێناو ئەو پێکەوەییەدا لە لایەکەوە لەئامێزی دەگرتن و لە دەریای خۆشەویستی بێ سنووری بەهرەمەندی دەکردن، لەولاشەوە زۆر بە جوانی سوودی لەو خۆشەویستییە وەردەگرت. "خۆشمدەوێیت.. ئازیزی دڵ و بینایی دیدەمی. خوا تۆی کردووەتە سەرداری ئەم ئوممەتە. پایەی تۆ وەك پایەی حەزرەتی مەریەمە بۆ بەشەریەت." لە ڕیوایەتێکی لاوازیشدا: چۆن

---

١. مسلم، بر ١٦٥. (بە دەربڕینێکی جیاواز لێرەشدا هاتووە: البخاري، فضائل الصحاب٦.)

گەورەیی حەزرەتی مەریەم وای لە پێغەمبەری خوا کرد بڵێ: ”گەر لەنێو ئافرەتاندا پەیامبەرێك بهاتایە، بێگومان حەزرەتی مەریەم دەبوو.“ دەی تۆش ئافرەتێکی لەو ئاستەدا.. کەوابێت پێویستە لایەنی کەم هێندەی ئەو بەرامبەر دونیا سەربەرز و هاوسەنگ بیت.

ئەوە سۆز و خۆشەویستی.. ئەوە بە دڵ و بە گیان لەئامێزگرتن، بەڵام هێندەی تۆزقاڵێك سستی نابینیت لە بابەتە قیامەتییەکاندا. جا ئەوەی پێی دەڵێن ڕاستەڕێ و دروسترین ڕێگا ئا ئەمەیە! ڕێگایەك کە رسول الله (صَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) پێشەنگی ڕێبوارانیەتی..

## ٤. حەزرەتی فاتیمە و داواکردنی خزمەتکار

پێشەوا بوخاری و موسلیم لە صەحیحەکانیاندا تابلۆیەکی ترمان لە سیستەمی پەروەردەیی پێغەمبەری خوا دەخەنە پێشچاو.. حەزرەتی عەلی بەسەرهاتەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

”لە ماڵەوە خزمەتکارمان نەبوو. فاتیمە خاتوون هەر خۆی هەموو کارەکانی ناوماڵی دەکرد. ماڵەکەمان لە تەنها ژوورێکی بچووك پێکهاتبوو. لەو ژوورە بچووکەدا ئاگردانی خۆشدەکرد و هەر لەوێشدا خواردنی سازدەکرد. زۆرجار کە دادەنەویەوە بۆ خۆشکردنی ئاگرەکە، پزیسکی ئاگرەکە بەر جلەکانی دەکەوت. لەبەرئەوە جلەکانی کون کون ببوو. ئیشەکانی هەر ئەوەندە نەبوو. نانکردن و ئاوهێنانیشی خستبووە سەرخۆی. ئەوجا لەتاو بادانی دەستاڕ و ئاوهێنان دەست و پشتی ئاوسابوو.“

جارێکیان لە کۆتایی جەنگێکدا کۆمەڵە دیلێکیان هێنا بۆ مەدینە. پێغەمبەری خواش کەوتە دابەشکردنیان بەسەر ئەوانەی داوایان لێدەکرد. منیش بە فاتیمەم وت سەردانی باوکی بکات و داوای لێبکات خزمەتکارێکی بداتێ تا لە کاروباری

ناوماڵدا هاوکاری بکات. ئەویش بەقسەی کردم و چووە سەردانی، بەڵام لە ماڵ نەبوو. حەزرەتی عائیشە پێی وتبوو: "کە هاتەوە خەبەری دەدەمێ."

ئەوەندە نەبوو چووبووینە ژێر جێگاوە کە پێغەمبەری خوا خۆی کرد بە ژووردا. هەرچی هەوڵماندا ڕاست ببینەوە بەڵام ئەو نەیهێشت.. ئەوجا هاتە نێوانمانەوە دانیشت. تەنانەت هەستم بە فێنکیی قاچەکانی دەکرد لەسەر سنگم. لە داخوازییەکەمانی پرسی، فاتیمەش وەك خۆی بۆی گێڕایەوە. لەپڕێکدا پێغەمبەری خوا ڕەنگی ئاخیرەتی گرت و ئەم چەند وتەیەی لە زار هاتەدەر:

"ئەی فاتیمە، لە خوا بترسە و کەمتەرخەمی مەنوێنە لە فەرمانبەرییەکانی سەرشانت و فەرزەکان بە جوانی بەجێبهێنە. لەگەڵ مێردەکەشتدا بەردەوام ڕاستگۆ بە و گوێڕایەڵی بکە و ڕەچاوی مافەکانی بکە بەسەرتەوە. (واتە تۆ دوو ئەرکت لەسەرشانە: بەندایەتی خوا، پاشان گوێڕایەڵی مێردەکەت) ئینجا با شتێکی تریشت پێ بڵێم: کە چوویتە ژێر جێگاوە ٣٣ جار سبحان الله و ٣٣ جار الحمد لله و ٣٣ جار اللهُ أکبر بڵێ. بزانە ئەمە زۆر لە خزمەتکار باشترە بۆت."[1]

واتای ئەمە ئەوەبوو: من ڕوانینی تۆ بەرەو ژیانی دوارۆژ وەردەچەرخێنم.. جا بۆ ئەوەی لەوێ بە من بگەیت و لەگەڵ من بیت، دوو ڕێگا هەیە یەکەمیان: بەندایەتییەکی تێر و تەواو بۆ پەروەردگار. دووەمیشیان: بەجێهێنانی ئەو ئەرکانەی دەکەونە سەرشانت بەرامبەر مێردەکەت. ئەگەر لە ئەرکەکانی سەرشانت بەرامبەر مێردەکەت خزمەتکارێك جێی تۆ بگرێتەوە و لەبری تۆ ئەو ئیشەکان ئەنجام بدات، ئەمە لە ڕوویەکەوە دەبێتە هۆی کەمتەرخەمیت. لەکاتێکدا تۆ دەبێت (ذو الجناحین) واتە جووت ڕەهەندی بیت. ئینسان چۆن دەگاتە پلەی کامڵترین بەندە و بە باشترین شێوە پەرستش ئەنجام بدات؟ ئینسان چۆن دەگاتە پایەی تەواوترین ئینسان و بە تێروتەسەلی ئەرکەکانی بەجێ بگەیەنێت؟ دەی ئەوەی لە ئەستۆی تۆدایە گەڕانە بەدوای وەڵامی ئەمانەدا.

---

١. البخاري، فرض الخمس ٦، دعوات ١١؛ مسلم،ذکر ٨٠.

تۆ سەرەتا بەندایەتییەکەت بە جوانترین شێوە ئەنجامبدە و هەوڵبدە ببیتە بەندەیەکی کامڵ. ئەوجا بەرامبەر عەلی، ئەو مرۆڤە مەزنەی کە تەواوی دۆستانی خوا تا ڕۆژی دوایی لە وەچەی ئەون، ئەرکەکانت بەجێبهێنە و ببە بە مرۆڤێکی کامڵ. ببە تاوەکو لە نشینگەی سەرجەم کامڵی و کامڵەکان کە بەهەشتە، لەگەڵ مندا بیت.

دەمەوێت لێرەدا کەوانەیەك بکەمەوە و ئاماژە بە لایەنێك بدەم کە تایبەتە بە حەزرەتی عەلی. عەلی ئەو ئینسانەیە کە پێغەمبەری خوا بێ هیچ دوودڵییەك کچەکەی خۆی داوەتێ. چونکە شایستەیی و لێهاتنی ئەوەی تێدا بوو ببێت بە مێردی کچی پێغەمبەر و زاوای پێغەمبەر. ئاخر ئەو شاهی ئەولیا بوو.. بە تایبەتمەندییەکی واشەوە بەدیهێنرابوو توانا و ئامادەگی ئەوەی هەبێت ببێت بە باوکی ئەولیا. ئەوەتا جارێکیان پێغەمبەری خوا لەبارەیەوە دەفەرموێت: "وەچەی هەر پێغەمبەرێك لە خودی ئەو پێغەمبەرە خۆیەوە بەردەوام بووە. هەرچی ئەوەی منیشە لە عەلییەوە بەردەوام دەبێت."[1] واتە ئەوە ئاودێری درەختی وەچەم، ئەو پێی دەگەیەنێت و هەر ئەویش دەیدورێتەوە. سەرەنجام ئەوانەش کە بەروبومەکە دەچننەوە، لەگەڵ مندا لەناو ئالوبەیتدا یادی ئەویش دەکەنەوە. بۆیە گەر لەم ڕووەوە تەماشای مەسەلەکە بکەین، دەبینین گوێڕایەڵی حەزرەتی عەلی ڕاستەوخۆ گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوایە. گوێڕایەڵی پێغەمبەری خواش بەمانای گوێڕایەڵی خوای گەورە دێت.

جگە لەمە، لە جێیەکی تردا کاتێك پێغەمبەری خوا بە شێوەیەکی گشتی باس لە مافی مێردایەتی دەکات، دەفەرموێت: "ئەگەر کڕنووشبردن بۆ غەیری خوا جائیز بوایە، ئەوا فەرمانم دەکرد بە ژنان کڕنووش بۆ مێردەکانیان ببەن."[2] خۆ ئەگەر شتێکی لەوجۆرە ڕێگەپێدراو بوایە، ئەوا دەمێك بوو حەزرەتی عەلی ئەو شایستەییەی بەدەستهێنابوو. بەڵێ، ئەگەر کڕنووشبردن بۆ پیاو لە ئارادابوایە،

---

١. طبراني، المعجم الكبير ٣/٤٣؛ ديلمي، المسند ١/١٧٢.

٢. أبو داود، نكاح ٤١؛ دارمي، صلاة ١٥٩.

حەزرەتی عەلی لە پێشی پێشەوە دەبوو. جا ئەگەر حەزرەتی عەلی و خزمەتکردنی تا بەو ڕادەیە گرنگ بێت بۆ ئەوەی حەزرەتی فاتیمە ببێت بە ذو الجناحین، لە بارێکی وەهادا بەکارهێنانی خزمەتکار لە لایەن حەزرەتی فاتیمەوە بە واتای شکانی یەکێك لە باڵەکانی و لەدەستدانی یەکێك لە ڕەهەندەکانی دەهات. دەی کەسێکی وەها تاك باڵ و یەك ڕەهەند نەیدەتوانی دایکایەتی حەزرەتی حەسەن و حسێن و شاهی گەیلانی و سەرجەم ئەو ئەقطاب و موجەددیە و مجتهدانە بکات کە تا قیامەت هەڵدەکەوتن. جا بۆیە بە مەبەستی ئەوەی بۆ وەها ئەرکێکی مەزن ئامادەی بکات، هەموو وابەستەییەکانی بە دونیاوە دەپساند و ڕووی وەردەچەرخاندە ئاخیرەت. دەی خۆ پەروەردگاریش هەر بەوجۆرەی لێکردبوو و هەر بەو شێوەیەش پەروەردەی کردبوو.

بەڵێ، بەرلەوەی بێتە دنیاوە باوکی بردەوە.. ئیدی وەختێك چاوی هەڵهێنا پشت و پەنایەکی نەبوو بەناوی باوکەوە. کە گەیشتیشە تەمەنی شەش ساڵیش کۆڵەکە و پشتیوانەکەی تری بردەوە.. بەم شێوەیە هەر لە سەرەتای ژیانیەوە پەروەردگار لە نێوەندی نووری تەوحیددا، دەروازەکانی ڕێی نهێنیی ئەحەدییەتی بەڕوودا والاکرد.

ئەگەرچی وەك پەردەیەك بۆ شکۆ و مەزنی پەروەردگار و شەرەف و پایەیەکی گەورەش بۆ ئەو کەسەی چاودێری دەکرد، ماوەیەك لەژێر چاودێریی عەبدولموتەلیبدا بوو بەڵام ئەمە لە ڕوانگەی هۆکارە پەرت پەرتبووەکانەوە چیدی بایەخێکی ئەوتۆی نەمابوو بەلای ئەوەوە. هەرچی سەرپەرشتی و چاودێری ئەبوتالیبیشە لە چوارچێوەی مامێتی نەترازابوو.. لە ڕووە قیامەتییەکەشیەوە بەخششێك بوو لە شێوەی ئەرکدا، لەبەرئەوە پێی بەخشرابوو کە باوکایەتی حەزرەتی عەلی دەکات. هەر لە سایەی ئەم نزیکییەوە ڕۆژێك دەهات ئەویش عەلی دەبردە لای خۆی و شای مەردان.. حەیدەری کەررار.. و سەرداری پیاوچاکانی لێ دروست دەکرد. خوای باڵادەست بەو جۆرەی لەگەڵ کرد و پەردەی هۆکارەکانی گشت بەجارێك لەبەرچاو لابرد و ڕووی وەرچەرخاندە خۆی. تۆ هی ئەوە نیت لە

دونیای هۆکارەکاندا بێیت و بچیت، دەبێت تۆ لە هەموو هەنگاوێکتدا تەمسیلی حەقیقەتی:

﴿رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ﴾

(الممتحنة: ٤)

"پەروەردگارا، هەر پشتمان بە تۆ بەستووە و هەر بۆ لای تۆش گەڕاوینەتەوە، سەرەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە."

بکەیت و متمانەت بە خوا بێت و پشتیش هەر بەو ببەستیت.

فاتیمە کچی بوو. بۆیە بەخۆی ڕەوا نەدەبینی کچەکەی لەو چاکە و بەخششانە بێبەش بکات کە پەروەردگاری لە ڕووی پەروەردەکردنەوە پێی بەخشیبوو. چ کچێك؟ ئەو کچەی هەر لە حەزرەتی حەسەنەینەوە هەتا دەگاتە خاتم الاولیاء، دەبووە دایکی هەموویان. لەبەرئەوە پێویست بوو ماهییەتی پێگەیاندنەکەی بە چەشنێك بێت شیاوی ئەوەبێت ببێتە ناوك و تۆو بۆ ئەو میوە موبارەکانە.

## ٥. کەشی پەروەردەیی خانەی بەختەوەری

لە ماڵە پڕ بەختەوەرییەکەی پێغەمبەردا بەردەوام بۆن و بەرامەی لەخواترسان دەپرژا. هەستان و دانیشتنەکان، سەرجەم جووڵە و بزاوتەکان ڕەنگی لەخواترسانیان گرتبوو. ئەوانەی چاویان دەگەیشتە ئاسۆی ڕوانینەکانی ئەو سەرورە، هەمووکات دەگەیشتن بە کەمەندکێشیی بەهەشت و ناخ هەژێنیی دۆزەخ، بگرە تەنانەت دەیانتوانی هەستی پێبکەن و بیبینن. خشوع و ملکەچیی ناو نوێژ، لەرز و خرۆش لەتاو سام و ترسناکی دۆزەخ، هەروەها شاباڵ گرتن لەتاو ناز و نیعمەتەکانی بەهەشت، لە تایبەتمەندییەکانی ئەو خانەیە بوون و لەو شتانە بوون کە بەردەوام دەبینران.

بەڵێ، ئەوەی تەماشای بکردایە هەموو ئان و ساتێك پەروەردگاری وەبیردەهاتەوە. پێشەوا نەسائی بۆمان دەگێڕێتەوە: "وەختێك پێغەمبەری خوا نوێژی دەکرد دەنگێکی وەك مەنجەڵی کوڵاوی لێوە دەبیسترا."[1] بەردەوام بە چاوێکی پڕ فرمێسك و ناخێکی سوتاوەوە لە حزووری کردگاردا دەوەستا و بەو جۆرە نوێژی دەکرد. دایکە عائیشەمان زۆرجار دەیبینی لە حزووری پەروەردگاردا چووەتە سوجدەوە و سەرتاپای گریە و لەرزینە.[2]

بەدڵنیاییەوە ئەم حاڵەتەی ئەو بە ئەرێنی کاری دەکردە سەر ئەندامانی خانەوادەکەی و لە ڕووی پەروەردەوە دەستکەوتگەلێکی باشی دەستدەخستن. هەمان ترس و چاودێری لە هاوسەران و منداڵانی ئەو پێغەمبەرە نازدارەدا دەبینرا کە لە هەموو کەس زیاتر ترسی خوای هەبوو. هۆکاری ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی ئەو شتەی دەیوت لە خۆیدا بوونی هەبوو قسەکانیشی بە کردەوەکانی نموونەدار دەکرد. خانەوادەی پێغەمبەر باشترین و دیارترین نموونەی ئەو شوێنکارەیە کە قسەیەکی بەکردارکراو لە دەروونی دوێنراودا جێیدەهێڵێت. گەر سەرجەم پەروەرشیاران و پەروەردەکارانی دونیا بێن و چی زانست و زانیاری پەروەردەییان هەیە بیخەنەگەڕ، هێشتا ناتوانن بگەنەوە بەو ئاستی کاریگەرییەی کە لەو خانەیەدا بەکاربووە.. لەڕاستیدا تا ئێستاش نەیانتوانیوە پێی بگەنەوە.

بەڵێ، ئەو شتانەی پێغەمبەری خوا دەیویست بیانکات یاخود ڕایانبگەیەنێت، زیاتر بە زمانی ڕەفتارەکانی گوزارشتی لێدەکردن. ئەوجا لەدواییدا دەبووە تەرجومانی ئەو حەقیقەتانەی لە ڕەفتارەکانیەوە دەچۆڕان. ترس و ملکەچی و شەرمەزاری بەندە لە حزووری پەروەردگاردا دەبێت چۆن بێت.. دەبێت ئینسان ناوێتە لەگەڵ چ هەستێکی قووڵدا سوجدە بەرێت و چۆن دەرك بە بچووکی خۆی بکات.. ئەی گریە و ئاهوناڵەی شەوان مانای چییە و بەندە چۆن دڵی خۆی هەڵدەڕژێت.. پێغەمبەری خوا هەموو ئەمانەی لە ماڵەکەی خۆیدا دەکرد،

١. أبو داود، صلاة ١٥٦، ١٥٧؛ نسائي، صحو ١٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢٥/٤.

٢. مسلم، صلاة ٢٢١، أبو داود، صلاة ١٤٧.

ئەوجا لە کۆڕی هاوەڵانیدا دەیفەرموو: "پێویستە مرۆڤەکان وەها بکەن و بەوجۆرە گرنگی بە ڕۆڵەکانیان بدەن. هەروەها پێویستە بەم شێوەیە حەق و حەقیقەت ڕوونبکەنەوە." ئیدی بەمجۆرە گشت گوفتارەکانی، چ لە بازنەی خانەوادەکەی خۆی یان لەناو خەڵکیدا، ڕەنگی دەدایەوە و لە دڵ و دەروونی دوێنراوەکانیدا جێی خۆیان دەکردەوە.

پێش هەموو شتێك ئەو باوك و باپیرەیەکی ناوازە و بێ هاوتا بوو. ئەم لایەنەی ژیان کە ڕەنگە بەلای ئێمەوە شتێکی سادە و سانا بێت، خۆی لە بنەڕەتدا یەکێکە لە قورسترین ئەو بەربەستانەی کە پێویستە هەموو مرۆڤێك تێی بپەڕێنێت.. پێغەمبەری خواش یەکەمین باوك و باپیرە کە بە ئاسانترین شێوە ئەم بەربەستەی تێپەڕاندووە.

ئەوەتا ڕۆڵەگەلێکی وەهای پێگەیاندووە، هەرچی ئەڵقەی زێڕین هەیە لە زنجیرەی وەچەکانیان، هەر هەموویان لە ئاسۆی مرۆڤایەتیدا دەڵێیت مانگ و خۆر و ئەستێرەن بە سەدە یەك لەدوا یەکەکاندا پەرشبوونەتەوە. ئەمەش بۆخۆی بەهرەمەندییەکی تایبەتی پێغەمبەرە کە پەروەردگار لەمەشدا بێ هاوتا و تاقانەی کردووە. وەچەیەك کە هیچ پاشگەزبوویەکی لە دین تێدا هەڵنەکەوتووە.. یاخود بە دەربڕینێکی تر، تاکە نەوەیەك کە هیچ مورتەدێکی تێدا نەبووە نەوەکەی پێغەمبەری خوایە، ئەمە وێڕای ئەوەی کە ژمارەیان ملیۆنەهای تێپەڕاندووە.

چەندین پیاوچاکی وا هەیە خۆیان زۆر مەزن و پایەبەرزن، کەچی دەبینی لە ڕوانگەی ئەو ڕۆڵانەی پێیانگەیاندوون تا بڵێی هەژارن. ڕۆڵەکانیان یان ڕۆڵەی ڕۆڵەکانیان تووشی لادان بوون و کەوتوونەتە داوی شەیتانەوە. تەنانەت لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا سەدەها نموونەی ئەم حاڵەتەت بەرچاودەکەوێت. بەڵام ئەوە تەنها منداڵ و نەوەکانی پێغەمبەری خوایە کە هیچ کامێکیان خیانەتیان نەکردووە لەو خانەیەی تیایدا گەورەبوون و لەو سەرچاوە ڕۆحیانەش کە ئاسەی تینوێتیان پێ شکاندووە. چ جای ئەوەی خیانەت بکەن، بەڵکو لە

هەموو دەرفەتێکدا پتەویی ئەم پەیوەندییە سروشتییەیان سەلماندووەتەوە و بوونەتە نموونەی وەفاداری.

بەڵێ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەکی ترە لەسەر نبووەتی حەزرەتی محەممەد. چونکە هیچ مرۆڤێك با هەرچەند بەتوانا و بلیمەتیش بێت، هەرگیز ناتوانێت ببێتە پەروەردەکارێك لەو ئاستەدا.

## ج- پێگەیاندنی مرۆڤەکان و ڕەوشی گشتیی پەروەرشیارییەکەی

بەرلەوەی بچینە سەر تایبەتمەندی پەروەدەیی لەلای پێغەمبەری خوا، پێمان باشە ڕاڤەیەکی پوختی ئەم ئایەتە بکەین کە تیشك دەخاتە سەر بابەتەکەمان. چونکە بەبێ زانینی ئەو هەلومەرجەی پێغەمبەری خوای تێدا بووە و ئەوەش کە مرۆڤەکانی لە چ ئاستێکەوە بۆ چ ئاستێك بەرزکردووەتەوە و لە کەمۆڵەی پەروەردەدا تواندونیەتەوە، مەحاڵە بەتەواوی مانا دەرك بەو لوتکەیە بکەین کە لە ئامادەکردن و پێگەیاندنی نەوەکاندا پێی گەیشتووە:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ
وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴾

(الجمعة: ٢)

"هەر ئەو زاتەیە لەناو خەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبەرێکی لە خۆیان ڕەوانەکرد، ئایەتەکانی قورئانەکەی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە و دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکرا و نادیاریان پوختە دەکات، فێری قورئان و دانایی و شەریعەتیان دەکات، بەڕاستی ئەوانە پێشتر لەگومڕایی و سەرلێشێواوییەکی ئاشکرادا گیریان خواردبوو."

هەندێك لەو وشانەی لە ئایەتەکەدا هاتوون زۆر سەرنج ڕاکێشن:

سەرەتا بڕگەی (هُوَ ٱلَّذِی) بە ڕاناوێکی نادیار دەستپێدەکات. چونکە مرۆڤی ئەو سەردەمە خوایان نەدەناسی. خوا بۆ ئەوان لە حوکمی نەبوودا بوو -پەنا بە خوا- مرۆڤگەلێکی نەزان و دەشتەکی و دوور لە شارستانییەت بوون. تەنانەت خوا لە دڵ و دەروونیاندا لە شێوەی "ئەو"یشدا نەبوو. واتە وەك زاتێکی نادیار و سێیەمیش نەیاندەناسی. جا بۆیە ئایەتەکە لە سەرەتادا سەرنجمان بۆ ئەوە رادەکێشێت کە بەهۆی بێهۆشییان، واتە بەهۆی تاریکیی ماهییەت و ناخیان کە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ دوورییان لە خوا، نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستەی ببن بە دوێنراو یاخود خاوەن گوفتار.

دواتر دەڵێت "نەخوێندەوارەکان" خەڵکانێکی نەخوێندەوارن؛ نە دەزانن کتێب چییە نە زانست.. نە خوا دەناسن نە پێغەمبەر. کۆمەڵێکی نەخوێندەوار، کۆمەڵێکی سەخت و دژوار کە چاوەڕێی هیچ خێر و چاکەیەکیان لێ نەدەکرا. کەچی خوای گەورە حەزرەتی محەممەدی خاوەن ئیرادەی ناوازە و ڕۆحی مەزن و دڵی نیانیان بۆ دەنێرێت و لەو بارستە بێ بەهایانەی کە هەروەك بێگیانەکان وابوون کەسانێکی بلیمەت و دانسقەی وەها بەرهەمدێنێت کە لە توانایاندا بێت مرۆڤایەتی ببەنبەڕێوە. لە لایەکی ترەوە، سەرباری ئەوەی خوای گەورە لە هەموو شتێك زیاتر بایەخ بە کتێب و قەڵەم و خوێندنەوە دەدات، کەچی ئەوان لە هەموو شتێك زیاتر لەو شتانەوە دوور و تەرا بوون کە خوا بایەخی پێدابوو.

(مِّنْهُمْ) نێردراوێك لە خۆیان، واتە لە خۆیانە. بوونی پێغەمبەر لەوان تەنها لەو ڕوانگەیەوەیە کە شارەزای کتێب و خوێندنەوە نەبووە. ڕاستە پێغەمبەری خوا لە سەردەمی نەفامیدا ژیاوە، بەڵام ئەو هەرگیز لە گرۆی نەفامان نەبووە. لەو ڕووەوە کە داخراو بوو بەڕووی نووسین و خوێندنەوەدا ئەو یەکێك بوو لە ئەوان. هەر دەشبوو بەوجۆرە بێت. چونکە خوا دەبووە فێرکاری ئەو. لە زانستی بێ سنووری خۆی فێریدەکرد و پێغەمبەرەکەی خۆی کە پەروەردە و فێرکاریی نەبینیوە، لەوان جیادەکردەوە و پەروەردەی دەکرد و دەیکردە فێرکاری تێکڕای گەلانی نەخوێندەوار.

(يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ) پەیتا پەیتا ئایەتە ڕوون و ڕەوانەکانی بەسەردا دەخوێندنەوە و بۆی ڕاڤەدەکردن. هەروەها لەڕێی پەروەردەکردنیانەوە بەرەو ئاسۆی ڕۆحانی بوون و کەمالاتی مرۆڤانە ئاڕاستەی دەکردن و دەیویست بیانکات بە مرۆڤی ڕاستەقینە.. بەڵێ، لە لایەکەوە بە فێرکردنی کتێب و لە لایەکی تریشەوە بە پەروەردەکردنیان بەردەوام عەرشی کەمالاتی مرۆڤانەی پیشاندەدان.

(وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ) ئەگەرچی پێش هاتنی پێغەمبەر لەناو نەفامی و سەرلێشێواوی و گومڕایشدا نغرۆبووبن، پەروەردگار پوخت و پاڵفتەی دەکردن.. بەڵێ هەموو ئەمانەی بە دەستی نێردراوێکی نەخوێندەوار ئەنجامدەدا.

لێرەدا مەبەست لە فێرکردنی کتێب، قورئانی پیرۆزە. وەك چۆن ئەم کتێبە لە ڕابردوودا دەستی کۆمەڵێکی گرت و بڵندیکردنەوە بۆ پلەی مرۆڤایەتی، هەر بەوجۆرەش لە داهاتوودا، بەرە ڕۆشنرێکانی ئایندە دەگەیەنێت بە بەرزترین پلەی کەمالات. هەموو ئەو هزر و بیرانەی لەمرۆدا وادەزانرێت دانسقە و ناوازەن، بە وێنەی مۆمی لەبنهاتوو یەك یەك دەکوژێنەوە و نامێنن. ئەویش دەبێتە ئەو تاکە کتێبەی کە دەستنیشانکراوی ئەوەیە لە مەملەکەتی خۆرەکاندا بە سەرجەم خۆرەکان بڵێ: "ئاوا مەبن، من هەم!" لە ئاسۆی جیهاندا تەنها بەیداخی ئەو دەشەکێتەوە و تەواوی نەوەکان زنجیری کۆت و بەندی گەردنیان دەشکێنن و بەرەو ئەو دەکەونە پرتاو. هەر لە ئێستاوە سەرەتاکانی ئەو پرتاوە دەرکەوتووە... ئەوە ئیمپراتۆریەتی ڕووس و ئەوەش چین! گەر دە ساڵ پێش ئێستا ئەو شتانەتان ببیستایە کە هەنووکە ڕوودەدات، گومانتان دەبرد خەیاڵ بێت. دەی ئێستاکە بڕوانن ستەمکارە داپڵۆسێنەرەکان چۆن دەڕووخێن! وە بە چ شێوەیەك ئیمپراتۆرییەتەکان یەك لەدوای یەك تلۆر دەبنەوە.. وە چۆن قورئانیش سەرباری هەموو شتێك، هاوشێوەی پشکۆی ژێر خۆڵەمێش دەگەشێتەوە... ئەوەتا جیهانی مەزنی یەکتاپەرستی سەرلەنوێ زیندوو دەبێتەوە. وێڕای ئەو هەموو زوڵم و چەوساندنەوە و خۆسەپێنییەش، کەچی ئەوەتا ڕۆحییەتی

ئیسلام بە هەموو تازەییەکیەوە خۆی بە تەواوی دونیا دەناسێنێت و ناخەکان کەمەندکێشی خۆی دەکات.

بەڵێ، مانایەکی دیکەشی ئەوەیە: بۆ ئەوەی ڕەوانەکراوی خوا لەژێر شەبەنگی نوورپەخشی ئەم کتێبەدا دەروونی گەلەکەی ئاراستەی چەمکە بەرزەکان بکات، واتە بۆ ئەوەی بەرزیان بکاتەوە بۆ ئینسانییەت و لە ڕێگەی پەروەردەی ئینسانییەوە ڕوویان وەربچەرخێنێت بەلای ئەو ڕێگایانەی دەیانگەیەنێتە کەماڵ.. هەروەها بۆ ئەوەی ڕێگاکانی ئەو میعراجەیان پیشانبدات کە خۆی بۆی بەرزبووەتەوە و ئەوانیش بە ڕۆح دەتوانن بیکەن.. لەبەرئەوەش کە دەستی هەمووان بگرێت و میعراجیان پێبکات بەرەو قووڵاییەکانی ڕۆح و دڵ، خوای باڵادەست پێغەمبەرە پایەبەرزەکەی خۆی فێری کتێب کردووە. ئینجا با ئوممەتەکەی لەوەوپێش لە گومڕایشدا بووبن! ئەوەندە بەسە خاوەن ویستی ڕەها ویستی لەسەربێت. چونکە هەر ئەوەندەی ئەو ویستی لەسەر بوو خەڵووز دەکات بە ئەڵماس و خۆڵیش دەگۆڕێت بۆ زێڕ و ئاڵتون.. ئەوەتا خاوەن ڕۆحە خەڵووزیەکانی کردووە بە ئەڵماسی گەش و درەوشاوە.

بەڵێ، ئەو ئەوە زێڕینەی چاخی ڕۆشنایی کە لەوەوە هاتە مەیدان، وا ئەمڕۆ بە هەموو بریسکە و درەوشاوەییەکیەوە ئاوی چاوان دەبات. بەڵێ، ئەوە کار و ویستی خوایە و لەسەر دەستی پێغەمبەرە گەوهەرناسەکەی ئەنجامی داوە. بۆیە لە سۆنگەی ئەم ڕاستییەوە دەتوانین بڵێین ئەو کەسەی بەشەرییەتی بۆ پلەی مرۆڤایەتی و کەماڵاتی مرۆڤانە بڵندکردەوە، حەزرەتی محەممەد موستەفایە.

لەپاش ئەویش مرۆڤەکان بە هەر باڵێك لە باڵەکانی: ویلایەت، تەسەووف، تەزکیە، چاکە و لەخواترسان یاخود قوربەت بۆ هەر جێیەك باڵیانگرتبێت، بەیداخەکەی حەزرەتی محەممەد موستەفایان لەو جێیەدا بە شەکاوەیی بینیوە.

پێیان نابێتە هەر شوێنێك، بینیویانە پێشتر حەزرەتی محەممەد بەو شوێنەدا

تێپەڕیوە. ئیتر ئەوانیش بەدەم وتنەوەی "بارك الله"وە دەستەنەزەر لە حزووریدا وەستاون. لەمەودواش هەر دەوەستن.

ئەوە بۆخۆی هەڵەیە گەر وا تێبگەین کە پەروەردەی پێغەمبەر تەنها بریتی بووە لە تەزکیە و پاڵفتەکردنی دەروون لە چڵك و چەپەڵییەکانی. چونکە ئەو بە کۆڕێسایەکی پەروەردەیی گەردوونییەوە هاتبوو و ڕاگەیەنەری پەیامێك بوو سەرجەم دڵ و ڕۆح و ئەقڵ و دەروونەکانی بەرەو ئامانجی بەدیهاتنیان دەدایەبەر. بەڵێ، حەقیقەتە گەردوونییەکانی قورئانیش هەمان ئەم ڕاستییە دەردەبڕن. ئەوەتا گرنگی بە ئەقڵی مرۆڤەکان دەدات و گوڕ و تینی دەداتە بەر. ئەوجا بە گۆڕینەوەی بە ئەقڵێك کە لەژێر ڕۆشنایی تەوحیدا هەنگاو دەنێت و ئێمە بە "ئەقڵی سرووش ڕەهەند" ناوی دەبەین، دەیگەیەنێتە کۆتا خاڵ.. پاشان دێتە سەر ڕۆح و زۆر لەپێش ئەوانەوە کە تەنها کار لەسەر پەروەردەی ڕۆحی دەکەن، ئاڕاستەی چەمکە بەرزەکانی دەکات. ئینجا دڵ؛ دێت و ئەم دڵە لە قەدپاڵە بەهەشتییەکانی ئەو جیهانانەدا دەگەڕێنێت کە بە تاسەومیەتی.. بە هەمان شێوە، ئاوڕ لە هەست و لایەنە ناسکەکانی ئەم ئینسانە دەداتەوە و بەرەو بڵندیی بەرزەفڕیان دەکات. لەو جێیەشدا کە خەیاڵ پەکیدەکەوێت، بە هەست و لەتیفەکانی دەیانگەڕێنێت. هاوکات لەگەڵ بەرزکردنەوەی شاگردەکانی لە ڕووی ڕۆحی و هەستەکانیانەوە، دەرگای سەرجەم دامەزراوە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کارگێڕی و سەربازی و ڕامیاری و زانستییەکانیشیان بەڕوودا واڵا دەکات و کامڵترین بەڕێوەبەر و هەڵبژاردەترین ئابووریناس و سەرکەوتووترین سیاسەتمەدار و بلیمەتترین سەرکردەی سەربازییان لێ بەرهەمدەهێنێت.

بەڵێ، پێغەمبەری خوا بە پەیامێکی جیهانییەوە هات و وانەی ئابووری و کارگێڕی و پەروەردە و فێرکردن و دادوەری و مافی دەوڵەت و گەلانی وتەوە.

بەکورتی، ئەو پەیامەی هێنای، بە شێوەیەکی پوخت و ئاماژەدار سەرجەم پێشکەوتنەکانی ئەمڕۆی لەخۆ گرتبوو. بەڵێ، خۆ ئەگەر لەمڕۆدا لە بەشێکی ئەو تێڕوانینە پەروەردەییە گشتگیرەدا کە پەیڕەوی کردووە و پێشکەشی مرۆڤایەتی

کردووە کەموکورتییەك هەبوایە، ئەوسا مەبەستی هاتنی بەتەواوەتی نەدەهاتە دی. لەکاتێکدا ئەو خۆی فەرموویەتی:

"هەموو ئەو پێغەمبەرانەی تاوەکو ئێستا هاتوون، هەریەکەیان بەشێکی ئەم تەلارە ناوازەیان تەواو کردووە. بەڵام لە شوێنێکیدا کەلێنێك مابووەوە کە دەبوایە تەواوبکرایە. ئەوەی بەوێدا گوزەری دەکرد دەیوت: "داخۆ ئەم تەلارە کەی تەواو دەبێت؟" ئەوجا دەفەرموێت: "دەی ئەوە منم کە تەواوی دەکەم. بە هاتنی من تەلارەکە تەواوبوو."[١]

قورئانی پیرۆز لەمبارەیەوە سەروەرمان پشتڕاست دەکاتەوە و دەفەرموێت:

﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ﴾

(المائدة: ٣)

"ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەکەتانم بەکۆتایی گەیاند."

واتە، هەموو ئەو پێغەمبەر و بۆخواسوڵحاو و بەندە بژاردانەی کە تا ئێستا هاتوون، وتویانە: "ئەم تەلارە کەی تەواو دەبێت؟" منیش تۆم کرد بە تەواوکار و وەك کامڵکاری تەلارەکە رەوانەم کردیت. ئەوە تۆی تەواوی دەکەیت و دەیگەیەنیتە پایان. چۆن من بەم ئایینە ڕازیم، ئەوەهاش لەسەر کۆمەڵە بنچینە و بنەمایەك دامڕشتووە هەموو کەسێك لێی ڕازیبێت...

بەڵێ، پێغەمبەری خوا بۆ ئەوە هاتووە ناتەواوییەکان تەواوبکات. لەبەرئەوە ئەوانەی بەدوای کەموکورتی و ناتەواوییەکدا دەگەڕێن لەو پەیام و بنچینانەی هێناویەتی، وا باشترە سەرقاڵی سۆراغی ناتەواوی و بۆشیی مێشك و ڕۆحی خۆیان بن. ئەو تەواوکار و کامڵکار و چاکساز بوو. سەرجەم خوار و خێچیەکانی چاك دەکردەوە و کەموکورتییەکانی تەواودەکرد و ئەو شتانەشی کامڵ دەکرد کە تاوەکو ئەو ڕۆژە تەواو نەکرابوون.. لە ڕاستیشدا تەواوی کرد.

---

١. البخاري، مناقب ١٨؛ مسلم، فظائل ٢٠-٢٣.

گەورەیی پەروەرشیارێك لەم بوارانەی خوارەوەدا دەبینین:

## ١. بەرزکردنەوەی ڕۆح و نەفس و ژیری

یەکێك لەو لایەنانەی کە مەزنیی پەروەردەکار و ڕابەرێکمان پیشاندەدات، گەیاندنی ڕۆح و نەفس و ئەقڵی پەیڕەوانیەتی بە کۆتا خاڵی بەرزبوونەوەیان. مێژوو شاهیدە کە حەزرەتی محەممەد -بە پشتیوانی و کۆمەکی پەروەردگار- سەرکەوتوو بووە لەم کارەدا. بەڵێ، ڕۆح و نەفس و ژیریی قوتابی و پەیڕەوانی تا دواهەمین ئەو شوێنەی لە توانایاندا بووە پێی بگەن، بەرزکردووەتەوە و لەوێدا گەڕاندوونی.

لە قورئاندا باس لە دەروونی بەدخواز دەکرێت. ئەو دەروونەی لەڕێی ئەو جڵەوەوە کە لە گەردنی مرۆڤی تووند کردووە، بۆ کوێی بوێت ڕایدەکێشێت و بەردەوام لەژێر فشاری خۆیدا دەیهێڵێتەوە.. بەڵێ دەیهێڵێتەوە و دەبێت بە بارستەیەك لە گۆشت و خوێن، لەکاتێکدا لەڕێی هەست و هزریەوە دەیتوانی ببێت بە مرۆڤێکی ڕۆح زیندوو. ئەوەتا حەزرەتی یوسف لە دەست ئەم دەروونە بەدخوازە پەنای بە خوا گرتووە و وتویەتی:

﴿ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓ ﴾

(یوسف: ٥٣)

"بەڕاستی نەفس (ئەگەر بە نووری خواناسی ئاوەدان نەبێت) زۆر فەرماندەرە بەگوناهـ و هەڵە و تاوان، مەگەر نەفسێك کە پەروەردگارم ڕەحمی پێ کردبێت."

نەفس لە خودی خۆیدا فەرماندەرە. بەڵام دەکرێت لەم کەندەڵانەی کە هەر دەڵێیت دەریای مردووە، قوتاری ببێت و قۆناغ بە قۆناغ بەرەو لوتکەکان بەرزببێتەوە. قورئان لە جێیەکدا ئاماژە بەم حاڵەتانەی نەفس دەکات و دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴾

(الفجر: ٢٧-٢٨)

"(شایانی باسه به ئیماندارای سەرفراز له سەرەمەرگدا دەوترێت) ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ له ئارامی (ئەی ئادەمیزادی ژیر و هۆشمەند که له تەمەنی کۆتای دنیادا پەروەردگارت ناسی و بەجوانی دەتپەرست)، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت که تۆ لەو ڕازیت و ئەویش له تۆ ڕازیە."

هاوکات قورئانی پیرۆز ئاماژە به جۆرێکی دیکەی نەفسیش دەدات که ئەویش ئەو نەفسەیه له چوارچێوەی "أمارە" هاتووەته دەرەوە و بووە به نەفسێك که له خۆی دەپرسێتەوە. تەنانەت لەو ڕوانگەیەوە که تا ڕادەیەك ئەم حاڵەتەی پێ پەسەندە، سوێند به نەفسی "لوامە" دەخوات و دەفەرموێت:

﴿ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴾

(القيامة: ٢)

"سوێند دەخۆم به ویژدانی زیندوو و نەفسی ڕەخنه له خۆگر که لۆمەی خۆی دەکات."

هەروەها نەفسی "صافية" (واته نەفسی پوخته و پاڵفتەبوو)ش هەیه. ئەمە سیفەتێکه تایبەت به موقەڕڕەبین.. ئەربابی ئەم سیفەته هێندە ساف و ڕوون و بێ خەوشن، ئەوەی تەماشایان بکات وەك بڵێی خوای گەورە دەبینێت و تەماشای ئەو دەکات. نەفسی حەزرەتی محەممەد موستەفا ئا لەمجۆرە نەفسەیە. هەر ئەویش نەفسی زۆرێك له خاوەن لێهاتنەکانی -له چوارچێوەی پلەکانی خۆیان و ئەوەندەی که تواناکانیان دەستیدابێت- کردووە به نەفسی صافیه.

بەڵێ، پێغەمبەری خوا لەڕێی پەروەردە و تەزکییەوە بەرزترین ئەو ئامانجانەی پیشانی نەفسدا که دەتوانێت پێیان بگات، به پشتیوانی پەروەردگاریش بەرەو ئەو ئامانجانه بەرزیکردەوە. ئەمەش بۆخۆی بەڵگەی ئەوەیە که ئەو سەروەرە

لە پەروەرشیاریشدا هاوتا و هاوشانی نییە. وەختێك لە سۆنگەی ئاراستەکردنی ژیری و نەفسەوە بەرەو کۆتا ئامانجەکانیان، تەماشایەکی سەردەمە هەڵبژاردەکەی حەزرەت دەکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە پەیامە پەروەردەییەکەی ئەو زاتە هیچ لایەنێکی فەرامۆش نەکردووە.

## ٢. جیهانیبوونی پەیامەکەی

سەرکەوتوویی پەروەرشیار بەگوێرەی فراوانی پەیامەکەی و ڕەهەندی چەندێتی و چۆنێتی شوێنکەوتووانی مەزندە دەکرێت. حەزرەتی محەممەد هەر لە ژیاندا بوو کە ئەو فێرکار و بانگەوازکارە مویارەکانەی پێیگەیاندبوون، بوون بە دەستنیشانکراوی ئەوەی لە ڕووبەرێکی بەرفراواندا کە هەر لە مەراکیشەوە تا ڕووباری ئەمدیو دەریای نزیك بوخارا درێژدەبووەوە، حەق و ڕاستی بڵاوبکەنەوە. تۆ بڕوانن، لەو ڕووبەرە بەرفراوانەی ئەو ڕۆژگارەدا، تاکە ڕاگەیەنەر و فێرکار و پەروەردەکار حەزرەتی محەممەد موستەفا بووە.

هەموو ئەو کۆمەڵە یەك لەیەك جیاوازانەی کە لە هۆز و نەتەوەی هەمەچەشن پێکهاتبوون و دەتوت منارەی بابلن، لە سایەی ئەو کۆڕێسا ئیلاهییەی ئەو هێنابووی دەرمانی دەردەکانیان دۆزیەوە.. مرۆڤی سەر بە کلتوورە جیاوازەکانی وەك ئێران و توران، چین و ماچین، کە هەریەکەیان خاوەنی میزاج و مەشرەبی تایبەتی خۆیان بوون، بەرەو پیری دەچوون و بێ هیچ دوودڵییەك پەیامەکەیان قبووڵ دەکرد. ئەمەش دەرخەری ئەو ڕاستییە بوو کە بنەما و بنچینەی پەیامەکەی گەردوونییە و لەبارە بۆ ئەوەی ببێت بە دەرمانی دەردەکانی سەرتاپای بەشەریەت. کەوابێت حەزرەتی محەممەد کاریگەرترین پەروەردەکاری سەرجەم چاخەکانە و کاریگەرییەکەشی لە هەمووان بەرفراوانترە. بەدەر لەمە، هەڵسەنگاندنی ئێمە بۆ گەورەیی هەر پەروەردەکارێك بەگوێرەی کاریگەریی بنەما پەروەردەییەکانی ئەو پەروەردەکارەیە لە بەرامبەر تێپەڕبوونی کاتدا. دە ئێستا بڕوانن، وێڕای تێپەڕینی ئەو هەموو زەمەنە، کەچی ئەوەتا هێشتا زۆرینەی پەروەردەکراوانی پەروەردەی

محەممەدی لە ئاستێکدان فریشتەکان ئێرەییان پێدەبەن.. تەنانەت هەمان ئەو پەروەردەیە بەسە بۆ ئەوەی لەمڕۆشدا نەوەیەکی هاوشێوە بەرهەمبێنێتەوە.

با ئێستا بیرێك بکەینەوە: حەزرەتی محەممەد لەناو گەلێکدا سەرهەڵدەدات کە تا بڵێی دوور لە شارستانییەت و دەشتەکی و دڕندە بوون. دڕندەییەکەیان لە ئاستێکدا بوو پێش دڕندەیی گیانلەبەرە دڕندەکان دەکەوت. کەچی ئەو پێغەمبەرە هەر لەناو ئەو گەلە وەحشییە دەشتەکییەدا کەسانێکی فریشتە ئاسای وەها پێدەگەیەنێت کە بۆ چەندین سەدە مرۆڤایەتی بەڕێوەبەرن. لەمەوە دەگەینە ئەوەی بڵێین پەیامەکەی ڕێباز و بەرنامەیەك بوو لە تەکان و هەڵمەتێکدا مرۆڤایەتی ڕزگار دەکرد. من وەك خۆم لایەنداری ئەوە نیم وێنای شتانی نەشیاو و ناڕەوا بکرێت. بەڵام خۆ هەر دەبێت چەند نموونەیەك بخەینە پێشچاو تاوەکو لە قەبارەی ئەو دارمانە ئەخلاقییە تێبگەین کە مرۆڤی ئەو سەردەمە گرفتاری ببوو:

سەروەرمان لەناو گەلێکی وەهادا سەریهەڵدا دڕندەیی تێکەڵی خوێنیان ببوو و لەگەڵ سروشتیاندا یەکی گرتبوو: ئەرەقیان دەخواردەوە و قوماریان دەکرد و بە ئاشکرا زینایان ئەنجامدەدا، هیچ کام لەمانەشیان بە عەیب و نەنگی نەدەزانی. بەدڕەوشتی وەك پیشەیەکی ئاسایی لێهاتبوو. تەنانەت خانووی تایبەت تەرخانکرابوو بۆ ئەو کارە و لەبەردەمیاندا ئاڵا دەشەکایەوە.[1] پەستی و ڕسوایی لە ئاستێکدا بوو ئینسان شەرمی دەکرد لە ئینسانبوونی خۆی. وە چەندین شتی دیکە کە من لێرەدا باسیان ناکەم... جگە لەمە، کەسایەتی و پێکهاتەی دەروونییان بەجۆرێك بوو لەسەر بچووکترین شت فەرتەنەیان دەنایەوە و دەیانکرد بە هەرا. وەك بڵێی مەحاڵ بوو کۆببنەوە و تێکەڵی یەکتر ببن و یەکتری قبووڵ بکەن. وەك شاعیرێك دەڵێت: ”گەر یەکێکیان ددانی نەبوایە براکانی خۆی دەیانخوارد.“ هەرچی دەردی ناکۆکی و دووبەرەکیشە سەرتاپای دوورگەی عەرەبی گرتبووەوە و وەك دەردێکی بێ دەرمانی لێهاتبوو.

بەڵێ، هەرچی خراپەیەکتان بە مێشکدا دێت لەوێدا هەبوو. هەرگیز چاوەڕێش

---

١. البخاري، نكاح ٣٦؛ أبو داود، طلاق ٣٣.

نەدەکرا کەسیان گوێ بۆ حەزرەتی محەممەد موستەفا بگرن. کەچی ئەو هات و هەرچی خووی ناپەسەند و خەسڵەتی دزێویان هەیە هەر هەموویی لەبن دەرهێنا و فڕێی دانە ئەودیو کێوی قافەوە. پاشان بە جوانترین ڕەوشت و نایابترین تایبەتمەندی رازاندنیەوە و لە کورتترین ماوەدا پێش هەموو جیهانە شارستانییەکان کەوتن، بگرە بوون بە مامۆستاشیان.

بەڵێ، لەو کۆمەڵە نەفام و سەرەتاییەوە گەلێکی وەها مەدەنی دروستکرد، تەنانەت شارستانییەتی ئێستاش دەستەوسانە لەوەی نموونەیەکی هاوشێوەی بخاتەوە. مۆلێر ناحەقی نییە کە لەبارەیەوە دەڵێت:

"مەحاڵە کۆمەڵێکی دیکە هەبێت هاوشێوەی کۆمەڵەکەی حەزرەتی محەممەد نالەبار و بێ زەمینە بێت بۆ پرۆسەی چاکسازی. مەحاڵێکی دیکەش ئەوەیە لە ماوەیەکی کورتی وەك ٢٣ ساڵدا بێیت ئەو کۆمەڵە بکەیت بە مرۆڤانێکی تەندروست. ئەمە مەگەر تەنها بۆ حەزرەتی محەممەد دەستی دابێت."

ڕۆژئاواییەکی دیکەش بەمجۆرە گوزارشت لە هەستەکانی دەکات: "مرۆڤایەتی لەو ڕۆژەوەی هاتووەتە بوون تاوەکو سەردەمی حەزرەتی محەممەد لە سەدا ٢٥ ی ئەو هەڵکشانەی بەخۆیەوە دیوە کە لە چارەی نووسراوە. کەچی ئەم ڕێژەیە لە سەردەمی ئەودا بە ستوونی بەرز دەبێتەوە و دەبێت بە لە سەدا ٥٠. تەواوی ئەو هەوڵ و تەقەلایەنەی لەو سەردەمەوە تاوەکو ئەمڕۆ بەگەڕخراون، تەنها توانیویانە ئەو ڕێژەیە بۆ لە سەدا ٧٥ بەرزبکاتەوە."

بەگوێرەی ئەم دانپێدانانە ڕاستەقینەیە بێت، هەر لە حەزرەتی ئادەمەوە هەتا پێغەمبەری خوا، بەری ڕەنجی هاوبەشی سەرجەم پێغەمبەر و فەیلەسوف و سەرکردە و زاناکان یا گەشتووەتەوە یان نەگەیشتووەتەوە بەو دەرەنجامەی کە پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە ماوەی ٢٣ ساڵدا بەدەستیهێناوە. واتە، سەرباری ئەو هەموو پێشکەوتنە زانستی و تەکنەلۆجییە، کەچی لە ١٤ سەدەی ڕابردوودا مرۆڤایەتی دەستی گەیشتووە بە تەنها لە سەدا ٢٥ ئەو دەرەنجامە. ئەگەر دونیا عومری باقی بێت ئەوا لە سەدا ٢٥ ەکەی تریش بەدەستدەهێنێت.

---

شانازیی مرۆڤایەتی - نووری ئەمر ٤

جا ئیتر حەزرەتی محەممەد ئا ئەمەیە! خاوەن ویژدانە ساغ و سەلیمەکانیش تا ئەو رادەیە ئاشنای ئەو خزمەتانەن کە پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردووە. مەوسوعەی بەریتانیش سەبارەت بەم بابەتە دەڵێت: "لە مێژووی بەشەریەتدا چەندین چاکسازی بەژن باڵا هەڵکەوتوون. لەنێویاندا پێغەمبەرانیشی تێدایە. تا ڕادەیەکیش توانیویانە سەرکەوتووبن. بەڵام هیچ کامێکیان ئەو سەرکەوتنەی بەدەستنەهێناوە کە حەزرەتی محەممەد بەدەستیهێناوە."

"وەیڵ"یش کە لێکۆڵەرێکی بە ویژدانە، لەمبارەیەوە قسەی خۆی هەیە: "هەموو کەسایەتییە مەزنەکان لەپاش خۆیان شوێنەوارێکیان جێهێشتووە. ئەوەتا نێردراوانی خوا، چاکسازان، نوێخوازان و کاربەدەستانی گەورەی وڵات هەریەکەیان بۆخۆی شوێنەوارێکی هەیە. حەزرەتی محەممەدیش خاوەن شوێنەوارە. بەجۆرێك، وەختێك باس لە "شوێنەوار" دەکرێت یەکەم کەس کە دێت بە بیردا ئەوە. لە ئاستێکیشدایە کەسی پێ بەراورد ناکرێت."

لە هەمان کاتدا وەیڵ زانایەکی ناسراوە و خاوەنی چەندین خەڵاتە لە بوارە زانستییەکاندا. ئەوەتا دۆست و دوژمن دان دەنێن بە گەورەییەکەیدا، جا نازانم کاڵفامەکانی لای خۆمان چی دەڵێن...

خوای باڵادەست وەسفی خۆیمان بۆ دەکات بە:

﴿يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ﴾

(الأنعام: ٩٥)

"زیندووش لە مردوو دەردەهێنێت."

(توانای ژیان دەبەخشێت بە دار و بەرد و لە خەڵوزدا جیلوەی ئەڵماس پیشان دەدات.)، وەك بڵێی خواوەندی مەزن لەرێی ئەم سیفاتە سەرسوڕهێنەر و ناوازەیەوە دڵنەوایی حەزرەتی محەممەد دەکات... لەو بیابانی نەفامییەدا و لەناو ئەو دەشتەکییانەی نیمچە دوورگەی عەرەبیدا، حەزرەتی محەممەد لە دار و بەرد

و خۆڵ و خەڵوز مرۆڤگەلێکی سروشت ئاڵتوونیی هاوشێوەی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و خالید و عوقبەی کوڕی نافیع و طارقی کوڕی زیادی بەرهەم هێنا (رضيَ اللهُ عَنْهُم).

هەتا ئەوکاتەی خۆری نبووەت لەو ناوچەیەدا هەڵدەهات و هاوچەرخەکانی ئاشنای ئەم پێغەمبەرە مەزن و بێ وێنەیە دەبوون، هەڵبەتە ئەوانیش توانا و لێهاتنی ئەقڵی و قەلبی و ڕۆحی و ویژدانییان هەبووە. پێغەمبەری خوا هەرگیز نەهاتووە ئەم توانا و ئامادەگیانە پەکبخات. بەڵکو بە پێچەوانەوە، بەگەڕی خستوون و لە جێگەیان کۆمەڵە توانا و بەهرەیەکی زۆر لەوانەی خۆیان سەرسوڕهێنەرتری بنیات ناوە. وەك یەکێك لە بیرمەندە گەورەکان ئاماژەی بۆ دەکات، باشترین نموونەی ئەمە: "عومەری پێش ئیسلام و عومەری پاش ئیسلامە!" عومەری پێش ئیسلام عومەرێك بوو ڕووی لە گەورەیی و خاوەن ئیرادەیی بوو. لەگەڵ ئەم و ئەودا پێشبڕکێی دەکرد و زۆرانی دەگرت، تەنانەت دەنیشایە سەر ملی وشتران و تەختی زەوی دەکردن. هەموو ئەمانە لە ڕوانگەی دەرخستنی چییەتی حەزرەتی عومەر و ئەوەش کە چ توانستێکی لە خۆیدا هەڵگرتووە جێی بایەخە. هەرچی عومەری پاش ئیسلامیشە عومەرێکی ڕۆح ناسك و هەستیارە کە تەنانەت پێ نانێت بە مێرووڵەشدا و ئازاری مێرووش نادات. میهرەبانی و هەستیارییەکەی هێندە بەرین و گشتگیرە، ئەوەتا دەڵێت: "ئەگەر مەڕێك بەلای فوراتدا بڕوات و بکەوێتە ناو ئاوەکەوە و بخنکێت، خوای گەورە حسابەکەی لە عومەر دەپرسێت."[1]

عومەریش و ئەوانەش کە وەك ئەو وان، بەو پەروەردەیەی لە پێغەمبەرەوە وەریانگرتبوو گەیشتن بەو ئاستە. بەڵێ، پێغەمبەری خوا لەو گرۆ نەفام و دڕندە و نەریت پەرستانەوە -کە دەمارگیرییان بۆ نەریت و خووە باوەکانیان تێکەڵی خوێنیان ببوو- مرۆڤی ئاوەهای دروستکرد.

ئێستاش با بە نموونەیەکی بچووك بابەتەکە زیاتر ڕوونبکەینەوە: هەموو

١. أبو نعيم، حلية الأولياء ١/٥٣.

توانا و ئیمکانیاتی دەوڵەتمان خستووەتە گەڕ بۆ ئەوەی خوویەکی بچووکی وەك جگەرەکێشان بنەبڕ بکەین. کەچی هێشتا دەستەپاچەین لەوەی بگەینە ئەنجام. بنەبڕکردن بەلایەك، بگرە ناتوانین بەر بە خێرایی تەوژمی بەکاربردنی بگرین و دایبەزێنین بۆ ئاستی ئاسایی. ئەمە تەنها لای ئێمە وا نییە، تەواوی دونیا گیرۆدەی ئەم دیاردەیەیە. ئەمە لەکاتێکدا ڕۆژ نییە سیمینار و کۆنفرانس لەسەر زیانەکانی جگەرە نەبەسترێت. جیهانی پزیشکیش هاودەنگە لەسەر ئەوەی کە جگەرە هۆکاری شێرپەنجەی قوڕگ و بۆری هەناسە و دەمە.. ئامارەکانیش ئاماژە بەوە دەدەن کە ئەم ڕێژەیە بۆ لە سەدا ٩٥ بەرزبووەتەوە. کەچی خەریکە بڵێین هەموو ماندووبوونەکان بێ ئاکام دەردەچن و کەس لەم خووە ناپەسەندە ناگێڕنەوە.

دەی مرۆڤی ئەو سەردەمە ئالودەی هەزاران خووی وەك جگەرە بووە و بە وێنەی خوێنیش لەگەڵ سروشتیاندا تێکەڵ ببوو. کەچی ئەم پێغەمبەرە دێت و بە یەك هەڵمەت و لە تاوێکدا هەموو ئەو خووانە لەبن هەڵدەکێشێت و لە جێیاندا جوانترین ڕەوشت و پەسەندترین خەسڵەت جێگیردەکات. هەم بە چەشنێك ئەم کارەی کرد فریشتەکانی ئاسمان بەچاوی ئێرەییەوە بۆی بڕوانن. ئەوانەی چاویان پێیان دەکەوت دەیانوت: "ئای خوایە، خۆ ئەمانە فریشتە نین، کەچی لە فریشتەش لەپێشترن." ئەوجا بڕواننە ئەو ساتەوەختەی کە بە پردی سیراتدا تێدەپەڕن و نوور و درەوشانەوەیان بە هەموو لایەکدا پەخش دەبێت و ئەوەندەی نامێنێت ئاگری بڵێسەداری دۆزەخ خامۆش بکات. لەو ساتەدا سەرجەم فریشتەکان لە سەرسامیدا نازانن چی بکەن، هەر ئەوەندەیان بۆ دەکرێت بڵێن: "داخۆ ئەمانە پێغەمبەرن یاخود فریشتە؟" نە پێغەمبەرن وە نە فریشتە. ئەوانە تەنها ئوممەتی حەزرەتی محەممەدن و پەروەردەی بەرنامەکەی ئەون.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود گەنجێك بوو مەڕ و ماڵاتی عوقبەی کوڕی

ئەبی موعیتی دەلەوەڕاند.[1] پێغەمبەر ئەویشی خستە ناو بازنەی تەدریسەکەیەوە و لەو شوانە سادەیە پێشەوایەکی وەهای بەرهەمهێنا، دەکرێت بوترێت مەدرەسەی کوفە شاکاری ئەو هاوەڵە پایەبەرزەیە. عەلقەمە و نەخاعی و حەمماد و سەوری و ئەبو حەنیفە هەموو لە قوتابییانی ئەو مەدرەسەیەن. ئەم کەسایەتییە مەزنانە کە هەریەکەیان لە بوارەکەی خۆیدا لوتکەیە، بە ڕێژەیەکی بەرچاو هەگبەی زانست و زانیارییەکانیان لە سەرچاوە سازگارەکەی ئیبن مەسعودەوە پڕکردووە. ئەو ئیبن مەسعودەش کە باسی دەکەین شوانی وشتر بووە. (گیانی شیرینمان قوربانی ئەو شوانە بێت!) لە شوانی وشترێکەوە پێغەمبەر بلیمەتی ئاوای پێدەگەیاند.

هەر لەدێر زەمانەوە چەندین گەورە زانای ئیسلام هەن کە جیهانی زانستیی ڕۆژئاوایان بە خۆیانەوە سەرقاڵکردووە و چەندین بەرگیان لەسەر نووسراوە. یەکێك لەوانەش -بەو ناوبانگەی کە لە بواری یاسانسیدا هەیەتی- ئیمامی ئەعزەم ئەبو حەنیفەیە. وەك خاوەن ئیدراکێکی مەزن دەڵێت، سۆڵۆن و حامورابی دەبنە شاگردی... کەچی ئەبو حەنیفە بە هەموو گەورەیی خۆیەوە، قوتابیی قوتابیی قوتابییەکەی ئیبن مەسعود، شوانی وشترە کە ئەویش بۆخۆی قوتابی پێغەمبەری خوایە. پەنا بەخوا وا تێنەگەن کە مەبەستم بچووك نیشاندانی ئەبو حەنیفە بوویێت. چونکە وتەکانمان لە ڕوانگەی دەربڕینی گەورەی و مەزنیی مامۆستای مامۆستایانە. بەڵێ، ئەوە لە سایەی پەروەردە و پێگەیاندنی سەروەرمانەوەیە لە کەسانێکەوە کە هیچ نەبوون، کەسانێك هاتنە مەیدان کە هەموو شتێکن. لە مردووەوە زیندوو و لە خەڵوزیشەوە ئەڵماس دەرهێنراوە.

دیسانەوە هەر لە سایەی ئەو پەروەردەیەوەیە کە کۆیلەیەکی بەربەری قەڵای هیرەقلی بەزاند و ناوەکەشی گۆڕی.. وە شتانێکی بۆ دونیای ئەودیو دەریاکان باسکرد کە تاوەکو ئەو ڕۆژە نایانبیستبوو. شتانێکی سەرسوڕهێنەری ئەوتۆشی پیشاندان کە سنووری تێگەیشتنیانی تەی دەکرد. هزری ڕۆژئاوا هەتا

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ٣٧٩/١؛ ابن سعد، الطبقات الكبرى ١٥٠/٣.

موسوڵمانانی نەناسیبوو بێئاگا بوو لە شتانێکی وەك: بەکەمزانینی ژیان، خولیای شەهیدبوون و تاسەی مردن. هەربۆیە ئەو ڕۆژە نە لە پێشڕەویی تاریق بەرەو ئەندەلوس تێگەیشتن، نە ئەوەشبوو ئاوەزیان پەی بەرێت بە سووتاندنی کەشتیەکان و.. ڕووبەڕوو بوونەوەی لەشکری ۹۰ هەزار سەربازی سوپای ئیسپانیا بە یەکەیەکی ڕووماڵیی ٥ هەزار کەسییەوە و چاونەترسانی لە دژوارترین حاڵەتدا. دوژمن لەتاوا توشی پەشۆکان هاتبوو. بەڵام وا باشە ئێوە نەپەشۆکێن! لە بەرامبەر سوپای دوژمندا کە ۲۰ هێندەی سوپاکەی دەبوو جەنگاوەرەکانی کۆکردبووەوە و پێی دەوتن:

"ئەی سەربازە نەبەردەکانم، بزانن کە لە پێشمانەوە دوژمنێکی وەك دەریا و لە پشتیشمانەوە دەریایەکی وەك دوژمن چاوەڕێمانە. یا ئەوەتا هەڵدێن و لەدواوە دەپێکرێن و سەرشۆڕانە دەمرن، یان ئەوەتا دەجەنگێن و سەرکەوتن بەدەستدەهێنن و بە خوای خۆتان شاد دەبنەوە."

مێژوونووسان بۆمان دەگێڕنەوە: "لە ماوەیەکی کەمی چەند سەعاتیدا تاریق و لەشکرەکەی سوپای دوژمنیان تەفروتونا کرد..."

ئەوجا پاش کەمێك تاریق خۆی لە کۆشکی "تۆلیدۆ"دا بینییەوە، ئەو کۆشکەی کە گەنجینەکانی پادشای لێبوو. دەسا بڕوانن بۆ حاڵی ئەمڕۆی کۆیلەکەی دوێنێ.. بڕوانن تا لە مەودای ئەو واتایانە تێبگەن کە ئیسلام دڵ و دەروونەکانی پێ دەنەخشێنێت! تاریق قاچ دەخاتە سەر گەنجینەکانی پادشا و لەبەرخۆیەوە دەڵێت:

"تاریق، هەتا دوێنێ کۆیلەیەکی گەردن بەند بوویت. خوا ئازادی کردیت و کردیتی بە سەرکردە. وا ئەمڕۆ ئەندەلوست ئازادکردووە و لەناو کۆشکی پادشادایت. بەڵام ها بیرتنەچێت، سبەینێ دەچیتەوە حزووری پەروەردگار."

پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگار! ئەمە چ فامێکی قووڵ و ناوازەیە! لە بنەڕەتدا ئەو کەسانەی لە ڕابردوویاندا دەستوپێوەند بوون و لە ڕووی پلەبەندی

کۆمەڵایەتییەوە لە ئاستێکی نزمدا بوون، وەختێك دەگەنە لوتکە و پایەیەك بەدەستدێنن، دەبینی جۆرێك لە گرێی دەروونی و هەستی خۆبەکەمزانینیان تێدا دەجوڵێت... فیز لێدەدەن و بەخۆیانەوە دەنازن و بەردەوام لەبەرچاوی کەسانی تر خۆیان دەنوێنن. (بە هەموو ڤێژەونییەکیەوە ئەم حاڵەتە بەزۆری لەو کەسانەدا دەبینین کە خۆیان بەسەر گەلدا سەپاندووە!)

ئەمە چ پەروەردەیەکە وا دەکات کۆیلەیەك کە هەموو جۆرە هەڵپە و چاوبرسێتییەکی لێ چاوەڕوان دەکرێت، مەردێکی نەفس بەرز و ئەوپەڕی چاودێر و لەخۆپرسەرەوەی لێ دەربچێت!

عوقبەی کوڕی نافیعیش یەکێکی ترە لە پەروەردەبووانی پەروەردەی محەممەدی. وەختێك عوقبە لە ئەمپەڕی ئەفریقاوە بۆ ئەوپەڕی فەتح دەکات و دەگاتە کەناراوەکانی ئۆقیانوسی ئەتڵەسی و ئەژنۆی ئەسپەکەی لەناو ئاودایە و ڕووشی لە ئاسمانە، هەستە قووڵەکانی بەرامبەر پەروەردگار بەم چەند وشەیە دەردەبڕێت: "خوایە، گەر ئەم دەریای تاریکییە نەهاتایەتە ڕێم، ئەوا ناوی پیرۆزت کە سەرچاوەی هەموو نوور و ڕووناکییەکە، بە سەرتاپای جیهاندا بڵاودەکردەوە و دەمگەیاندە دونیای ئەودیو دەریاکان."[1]

شاعیر عەبدولحەق حامید قسە لەسەر ئەم هەڵوێستە دەکات و دەڵێت: "نازانم ئەم قسەیەی عوقبەی کوڕی نافیع بەرزتر بووە یان دەنگی ئەو ڕۆحانییانەی کە لە ئاسماندا دەنگیان دەبیسترا؟"[2]

بە بۆچوونی بەندە، فریشتەکانیش دڵبەندی هەمان مەبەست بوون و بۆ ئەوە ئۆقرەیان لێبڕابوو. بەڵام عوقبە عوقبەیەکی تر بوو.. عوقبە لە بازنەی تەدریسی حەزرەتی محەممەددا دەرسی وەرگرتبوو و شاگردێك بوو لەوانەی ئەو پێیگەیاندبوون...

---

١. ابن الأثير، الكامل في التاريخ ٣/٤٥١/

٢. عبدالحق حامد ترهان، تارق (فتح الأندلوس).

مامەڵەی ئەو لەگەڵ ئینساندا مامەڵە بوو لەگەڵ تەواوی هێز و توانستە ئەقڵی و قەلبی و ڕۆحی و ویژدانییەکانیدا.. هیچکام لەو هەستانەشی فەرامۆش نەکردووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، برەوی پێداون و بزواندوونی.. لە بەدنیازترین و سروشت خراپترین کەسیش کەسانێکی بەرهەمهێناوە کە خاوەنی ناوازەترین سروشت و دەروون بوون. تۆمارکردنی سەرکەوتن و پێکانی بڕیارەکانی لە ئاڕاستەکردنی ئەو هەموو خاوەن توانا و لێهاتنانەدا، مەگەر تەنها بە "پێغەمبەرێتییەکەی" لێکبدرێتەوە. چونکە لە هیچ ڕەفتار و ڕێکارێکیدا چەوتی نەبینراوە.

## د. سیستەمە پەروەردەییە جیهانییەکەی پێغەمبەری خوا

### ١. بزاوت و کردار

لە فەرمایشتێکدا کە شایانی وردبینی و سەرنجە، پێغەمبەری خوا سەبارەت بە بزاوت و کردار دەفەرموێت: "إِنَّ اللّٰهَ تَعَالَى يُحِبُّ الْعَبْدَ الْمُؤْمِنَ الْمُحْتَرِفَ" "خوای گەورە ئەو بەندە باوەڕدارەی خۆشدەوێت کە لە کارەکانیدا کارزان و دەست ڕەنگینە."[١]

بەڵێ وایە. ڕێشی تێنەدەچوو جگە لەوە شتێکی دیکە بڵێت. چونکە خوا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ ﴾

(التوبة: ١٠٥)

"بەو خەڵکە بڵێ: ئێوە هەرچی دەتوانن لە کار و کردەوە ئەنجامی بدەن، چونکە خوا کار و کردەوەتان دەبینێت و (ئاگادارە بە نهێنی و ئاشکرای)، هەروەها پێغەمبەرەکەشی (ئاگادار دەکات کاتێك لە ژیاندایە، دوای وەفاتیشی

---

١. طبراني، المعجم الأوسط ٣٨٠/٨؛ بيهقي، شعب الإيمان ٨٨/٢.

بۆ خوای گەورە ئاسانە کە نیشانی بدات)، هەروەها ئیماندارانیش (ئاسەوار و دەرئەنجامی دەبینن)."

واتە، کار و کردەوەکانتان بەگوێرەی کۆمەڵە پێوەرێك دەنرخێنرێن. لە مەیدانی حەشر و لێپرسینەوەدا سەرجەم کردەوەکان نمایشدەکرێن. ئەوجا خەڵکی دێن و دەیانبینن و لێیان ورد دەبنەوە تا بزانن داخۆ ئەو شتانەی ئەنجامدراون شایانی ئەوەن پێیان بوترێت کردەوە یان نا! بۆیە پێویستە ئینسان بەو هەست و شعورەوە کارەکانی ئەنجامبدات.

لە فەرمایشتێکی دیکەشدا هاتووە: "خوای گەورە کارێکی پێخۆشە بە ئیتقانەوە، واتە بەتەواوەتی و بێ کەموکورتی ئەنجام درابێت."[1]

ئەو ئایەتەی پێشتر هێنامان یەکێکە لەو موعجیزانەی کە لە ڕوانگەی بنەماکانی هاندانی زانستەوە پێویستە بوەستین لەسەری.. وە بە بڕوای من هێندە بەڵگەنەویست و پاراوە، شایانی ئەوەیە لە پێشەکی هەموو کتێبێکدا دابنرێت. دیوێکی ئەو بەڵگەنەویستییەش لەسەر شێوەی ئەو دەنگەیە کە لە پێغەمبەری خواوە دێت: "إِنَّ اللهَ تَعَالَى يُحِبُ الْعَبْدَ الْمُؤْمِنَ الْمُحْتَرِفَ" "پەروەردگار ئەو بەندە باوەڕدارەی خۆشدەوێت کە لە کارەکانیدا کارزان و دەستڕەنگینە."

فەرموودەیەکی لاوازی تریش هەیە کە ئەویش وتەی بەنرخی "اَلْكَاسِبُ حَبِيبُ اللهِ"یە. بەڵێ، ئەم فەرموودە لاوازەی کە زۆربەمان لە چوارچێوەمان گرتووە و بە دیواری ماڵ و دوکانەکانماندا هەڵمانواسیوە، ماناکەی ئەمەیە: "کاسبکار، واتە ئەو کەسەی لەڕێی کارکردنەوە بژێوی خۆی بەدەستدەهێنێت، خۆشەویستی خوایە."

بەڵێ، خوای باڵادەست ئەو کەسانەی خۆشدەوێت کە بەگوێرەی شەریعەتی فیتری دەجوڵێنەوە و لە بازنەی حەڵاڵدا ماندوو دەبن و ڕزق و ڕۆزی خۆیان بەدەستدێنن. دەتوانین ئەم باسە لەژێر تیشکی سورەتی(العصر)یشدا شرۆڤە بکەین:

---

١. أبو يعلى، مسند ٣٤٩/٧؛ طبراني، المعجم الكوسط ٢٧٥/١.

﴿وَٱلۡعَصۡرِ ۝١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾

(العصر: ١-٣)

"سوێند به زەمانه، سوێند به کاتی عەسر. بەڕاستی ئادەمیزاد له زەرەرمەندی و خەسارەتمەندیدایه. بێجگه لەوانەی که باوەڕیان هێناوه و کار و کردەوه چاکەکانیان ئەنجامداوه و ئامۆژگاری یەکتریشیان کردووه که هەمیشه پابەندی حەق بن (پابەندی حەقیش پێویستی به خۆگری هەیه)، لەبەر ئەوه بەردەوام ئامۆژگاری یەکتریان کردووه تا هەمیشه و بەردەوام، خۆگر و ئارامگریش بن."

ئیمان، کردەوەی چاك، پەیوەستبوون به حەقەوه، ئامۆژگاریی یەکتر بۆ کاری ڕاست و دروست، هەروەها ئارامگری و وابەستەبوون به خۆڕاگری، هەریەك لەمانه بۆخۆیان بزاوت و کردەوەن.. ئەو کەسەشی بەم کارانه هەڵدەستێت خوا خۆشیدەوێت. له جیهانبینی حەزرەتی محەممەد و تێڕوانینی بۆ چەمکی بزاوت و جووڵەدا، هەوڵدان باشترینی کردەوەکانه و چاپووکترین ئامرازە، بەنده دەگەیەنێت به خۆشەویستی پەروەردگاری. له فەرهەنگی ژین و ژیانی ئەودا هەرگیز ڕێتناکەوێت له دەستەواژەگەلێکی هاوشێوەی: "وەك ڕاهیبەکان خۆتان بخزێننه کونجی کڵێسا، توخنی هاوسەرگیری مەکەون، دەستبەرداری خواردن و خواردنەوه ببن و گرنگی به دونیا مەدەن تاوەکو بگەن به خوا!" هێزی شەهوەت و ئارەزووی ناو ناخی ئینسانی هێناوه و بەرەو بازنەی پەسەند و ڕێگەپێدراو ئاڕاستەی کردووه. ئەوەتا دەفەرموێت: "تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ" "لەگەڵ ئافرەتێکدا هاوسەرگیری بکەن یەکترتان خۆشبوێت و وەچەخەرەوه بێت."[1] له فەرموودەیەکی تریشدا هاتووه: "تَنَاكَحُوا تَكْثُرُوا فَإِنِّي أُبَاهِي بِكُمُ الْأُمَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ" "هاوسەرگیری بکەن و زۆر ببن. چونکه له ڕۆژی قیامەتدا

١. أبو داود، نكاح ٤؛ نسائي، نكاح ١١.

بەرامبەر ئوممەتانی تر بە زۆریی ئێوەوە شانازی دەکەم.[١٤٤] واتە، ئێوە چەندە زۆر بن منیش ئەوەندە دڵخۆش دەبم. دڵشاد و بەختەوەر دەبم کاتێك بۆ دوای خۆم دەڕوانم و کۆمەڵانێکی زۆر دەبینم لەوانەی بۆ خوای خۆیان چەمیونەتەوە و سەریان خستووەتە سەرزەوی و بە سەدای "الله اکبر.. الله اکبر" هاتوونەتە جۆش.

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) نەهاتووە هەستی هاوسەرگیری و ئارەزووی مرۆڤ بۆ ڕەگەزی بەرامبەر خەفە بکات و لە ڕێڕەوی سروشتیی خۆی بیترازێنێت و کپی بکاتەوە. ئەمەش مانای وایە پەنای نەبردووەتە بەر ئەو ڕێگایانەی کە سەر دەکێشن بۆ گرێی دەروونی و لادان لە سروشتی مرۆڤانە. بەڵکو هاتووە ڕێڕەوی ئەم هەستەی وەرچەرخاندووە بۆ سەر ڕێچکەیەکی ئەرێنی و مەشروع. تەنانەت لەم خاڵەشدا ڕێبازێکی وەهای داناوە ئوممەتی محەممەد بگەیەنێت بە ڕەزامەندی و خۆشنوودیی پەروەردگار. بۆیە دەتوانین بڵێین، ئاڕاستەکردنی سروشت بەرەو ئەو ئامانجانەی لەپێناویدا بەدیهێنراوە، بەردی بناغەی سیستەمە پەروەردەییەکەی حەزرەتی محەممەد پێکدەهێنێت.

## ٢. بازرگانی، کشتوکاڵ، جیهاد

لە بابەتی هاوسەنگکردنی کارەکانیشدا دیسانەوە ئەو بێ هاوتایە. لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت:

"إِذَا تَبَايَعْتُمْ بِالْعِينَةِ وَأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ الْبَقَرِ وَرَضِيتُمْ الزَّرْعَ وَتَرَكْتُمُ الْجِهَادَ سَلَّطَ اللهُ عَلَيْكُمْ ذُلاًّ لَا يَنْزِعُهُ حتّى تَرْجِعُوا الَى دِينِكُمْ"

"کاتێك مامەڵە و کڕین و فرۆشتان لەسەر بنەمای (عینة) کرد و دوای ڕەشەوڵاخەکانتان کەوتن (واتە تەنها خەریکی ئاژەڵداری بوون) و کشتوکاڵتان بەلاوە سەروزیاد بوو و وازتان لە جیهاد و تێکۆشان هێنا، ئەوسا خوای گەورە

١. عبدرازاق، المصنف ٦/١٧٣.

سەرشۆڕییەکتان بەسەردا زاڵدەکات تا نەگەڕێنەوە بۆ ئایینەکەتان خوا ڕزگارتان ناکات لێی."[1]

"عینة" شێوازێکی مامەڵەیە کە دەکرێت بەم جۆرە ڕوونی بکەینەوە: کاتێك کەسێك شتێك لە کەسێکی تر دەکڕێت بە پێشەکی، دواتر ئەو کەسە هەڵدەستێت بە نرخێکی گرانتر ئەو شتە دەفرۆشێتەوە بە هەمان ئەو کەسەی کە شتەکەی لێکڕیوە. لەنێوان زۆرێك لە پێناسەکانیشیدا پێموابێت ئەو ڕوونکردنەوەی سەرەوە بەس بێت. جا ئیتر ئەمە بە سوویەکی ناڕاستەوخۆ دابنرێت یان هەر جۆرە ناوێکی دیکە، هەرچۆنێك بێت لە لایەن دانەری شەریعەتەوە ڕێگەی پێنەدراوە... وادەزانم ئێمە لەدوای شۆڕش و بوژانەوەی جووڵەی پیشەسازی توانیمان لە ئاماژە و ڕەهەندەکانی ئەم فەرموودەیە تێبگەین. ئەویش ئەگەر دروست لێی تێگەیشتبین.. ئەوە جیهاد هەر مەپرسە، چونکە لە زووەوە لەبیرمان کردبوو. بەدەم خۆ خەریککردن بە پیشەسازیشەوە کشتوکاڵ و ئاژەڵداریشمان فەرامۆش کرد و خۆمان لە نێوەندی ناهاوسەنگییەکی تردا دیتەوە.

لەکاتێکدا ئەوەی دەبوو بکرایە ١٤ سەدە لەمەوبەر لە لایەن پێغەمبەری خواوە هەواڵی لەبارەوە درابوو. هاوشێوەی سەرجەم بابەتەکانی تر، لەم بابەتەشدا تا بڵێی هاوسەنگی پارێز بوو.

بەدڵنیاییەوە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری لەو شتانەن کە دەبێت هەبن. تەنانەت لە چەندین فەرمایشتی پیرۆزدا هانی ئەو جۆرە کارانە دراوە. بەڵام ئەوەی دروست نییە ئەوەیە کە هەموو هەوڵ و تواناکان لەوێدا چڕبکرێنەوە.

مەودای ئەم دەربڕینە گشتگیرە، کە هەر لەو کەسەوە بیگرە کە تێکەڵی ژیانی ناو شار نابێت و خۆی دەخزێنێتە کونجی ئەشکەوتێکەوە و خەریکی ڕۆحانیاتی خۆی دەبێت، هەتاوەکو ئەو جوتیار و ئاژەڵدارەی کە توانای وەبەرهێنانی نییە، وانەیەکی گرنگی ئابووریمان فێر دەکات. جگە لەوە، لەبەرئەوەی نەتانتوانی

١. أبو داود، بيوع ٥٦؛ أحمد بن حنبل، المصنف ٨٤/٢.

هێزی پێویست بەدەستبهێنن بۆ خۆجێکردنەوەتان لە هاوسەنگییە نێودەوڵەتییەکاندا و وازتان لە جیهاد هێنا، یان کە جیهادتان وازلێهێنا و لە هاوکێشە نێودەوڵەتیەکاندا سەنگتان نەما، ئەوکات خوای گەورە گیرۆدەی سەرشۆڕییەکتان دەکات پێوەی بتلێنەوە و لەژێر کۆتی بەندی و چەوساوەییدا بناڵێنن. هەتا ئەو وەختەش کە دەگەڕێنەوە بۆ ئایین، ئیسلام دەکەنەوە بەرنامەی ژیانتان ئەم دۆخە هەروا بەردەوام دەبێت.

ئەو نموونەیەی هێنامانەوە -لەگەڵ دانانی بە بەرتەنگی ڕاڤەکەیدا- دڵۆپێکە لە دەریایەك و پێغەمبەری ئازیز چەندین فەرمایشتی تری هەیە لەوبارەیەوە. بەڵام ئێمە لێرەدا بەمەندە دەستهەڵدەگرین. ئەو سەروەرە وەك چۆن بەهرە و لێهاتنەکانی لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا سنووریەند نەکردووە، هەر بەو شێوەیە هێز و توانستە جەستەییەکانیشی بەکەم نەزانیوە. بەڵکو بە پێچەوانەوە فەرموویەتی:

"اَلْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ"

"باوەڕداری بەهێز (ئەو باوەڕدارەی لەشساغ و تەندروستە) لە باوەڕداری لاواز چاکتر و خۆشەویستترە بەلای خواوە."[١]

ئەوانەی دەخوازن لەلای خوا خۆشەویست بن، پێویستە لەسەریان هاودەم لەگەڵ ساغی و پاکی دڵ و دەرووندا، خاوەنی ساغی جەستە و لەگەڵ تەندروستیی لاشەشدا خاوەنی تەندروستی ڕۆحیان بن. وەك دەبینن نافەرموێت: "دەبێت کێشتان دابەزێنن، پارێز بکەن، توانا جەستەییەکانتان وەلانێن تاوەکو خوا لێتان رازیبێت." بەڵکو دێت لە بەرامبەر گۆشەگیری ڕاهیبانە و خەفەکردنی هەستەکاندا ڕێچکەیەکی واقیعی و سروشتی دەگرێتە بەر و لە چوارچێوەی سروشتی مەسەلەکان خۆیاندا مامەڵە لەگەڵ مەسەلەکان دەکات و ئێمەش بەرەو ئەو ڕێبازە هاندەدات.

١. مسلم، قدر ٣٤؛ ابن ماجه، مقدمة ١٠؛ زهد ١٤.

## ٣. سەرنجێك لەسەر زانست

ئەو شتانەی پێغەمبەر لەبارەی ژیانی زانستی و فیکرییەوە هێناونی، هەروەها ئەو دەستکەوتانەش کە بۆ دونیای زانستی بەدەستهێناوە، دیسان دەرکەوتەیەکی تری جیهانی بوونی پەیامەکەین.

قورئانی پیرۆز بایەخ بە زانست دەدات و هانی سەرجەم مرۆڤەکان دەدات بۆ بەدەستهێنانی و دەفەرموێت:

﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾

(الزمر: ٩)

"ئایا ئەو کەسانەی کە دەزانن و شارەزان، وەك ئەوانەن کە هیچ نازانن و شارەزاییان نیە؟"

بۆیە بەردەوام زانایانی -بە ئەندازەی زانینەکەیان- لەوانە بەرزتر ڕاگرتووە کە نازانن.

ئایەتێکی تر:

﴿ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ ﴾

(فاطر: ٢٨)

"بەڕاستی هەر زاناکان پەی بەو نهێنییانە دەبەن و لەناو بەندەکانی خوادا هەر ئەوان لەخوا دەترسن (لە سەردەمی عیلم و زانستیدا ئەم ڕاستییە ڕوونە چونکە زانا و پسپۆڕان کاتێك وردەکاری بەدیهێنراوان پەی پێ دەبەن، زۆر هەست بە گەورەیی و دەسەڵاتی خوا دەکەن)."

لە (قرآة)ێکی شازدا کە دەدرێتە پاڵ ئەبو حەنیفە، لەفزی (ٱللَّهَ) بە مەرفوعی دەخوێندرێتەوە.[1] لە وەها حاڵێکیشدا واتاکە بەمجۆرەی لێدێت:

---

١. قرطبي، الجامع الأحكام القرءان ٣٤٤/١٤؛ قاسمي، محاسن التأويل ٤٩٨٤/١٤؛ إيسماعيل حقى بورصوى، روح البيان ٣٤٤/٧.

"خوای گەورە تەنها ڕێزی بەندە زاناكانی دەگرێت." هەڵبەتە دەبێت بزانین كە ئەم ڕێزە شتێكە لەسەرروو تەسەووری مرۆڤانەی ئێمەوەیە و بەجۆرێكە شایانی پاك و بێگەردی و بەرز و بڵندیی زاتی ئولوهییەتە. وەك وتمان، (قرآة) ەكە شازە. بەڵام لەو ڕووەوە كە پەنجەرەیەكی ترمان بەڕوودا واڵا دەكات بۆ ڕوانینە واتای ئایەتەكە، شایانی ئەوەیە لەسەری بوەستین.

فەخرەددینی ڕازی لە ڕاڤەی بڕگەیەكدا سەبارەت بە زانست، سەرنجمان بۆ لای خاڵێكی ورد ڕادەكێشێت و دەڵێت: "هەرسێ مەزهەبەكەی دەرەوەی مەزهەبی مالیكی "سەگ" بە (نجس العین) دادەنێن. واتە سەگ بەتەواوی مانا گڵاوە. لەبەرئەوە ڕاگرتنی لە ماڵدا جائیز نییە. بەڵام ئەگەر سەگەكە (كلب المعلم) بێت، واتە سەگێك بێت فێری ڕاوكردن كرابێت و ڕاهێنرابێت لەسەر پاسی مەڕ و ماڵات، ئەودەم شتێكی ترە. ئەو نێچیرەی بە دەم دەیگرێت و دەیهێنێتەوە دەخورێت. ئەو شوێنانەی پێیدا دەڕوات و لێی دەخشێت بە پاكژ دادەنرێت، ئەمە سەرباری ئەوەی ڕاگرتنی لە ماڵدا كێشەیەكی ئەوتۆ دروست ناكات..."

لەم خاڵەدا پێشەوا ڕازی هەڵوێستەیەك دەكات و دەڵێت: "ئەگەر سەگێك تەنها ئەوەندە لە زانست فێربووبێت كە ڕاو بكات.. وە بەم فێربوونەش لەوە بچێتە دەرەوە كە بە گڵاو دابنرێت، بگرە لەناو ماڵدا وەك یەكێك لە ئەندامانی خێزانی لێبێت، ئیتر ئێوە خۆتان بیخەمڵێنن ئەو مرۆڤەی فێری زانست دەبێت بۆ چ ئاستێك بەرزدەبێتەوە."[١]

ئەوە تێڕوانینی شەرع و ئەوەش پەیامی ئیسلام و ئەو بنەمایانەی حەزرەتی محەممەد هێناونی!

نەزان و نەفامان خوای گەورە ناناسن. هەركەسێك خوا بناسێت و ملكەچی فەرمانەكانی بێت، "زانا"یە. بەگوێرەی ئایین و شەرع بەو كەسانە ناوترێت "زانا" كە خوا ناناسن و نازانن پێغەمبەر چییە. هەرچی ئەوانەش كە خوا و پێغەمبەر

---

١. رازي، مفاتح الغيب ٢/١٩٣-١٩٤.

دەناسن -با کەمیش بێت- لە ڕوویەکەوە بە زانا دادەنرێن. جا ئیتر ڕێز بە چ مانایەك بێت و چ جۆرە مامەڵەیەك بخوازێت، خوای گەورە بەوجۆرە مامەڵە لەگەڵ ئەوانەدا دەکات کە پێغەمبەرەکەی و زیندووبوونەوە و کتێبە ئاسمانییەکان و بەهەشت و دۆزەخ دەزانن و باوەڕیان پێیەتی. واشدەبینم گرفتێك نەبێت لەوەها ڕاڤەیەکدا گەر وشەی (یخشی) وەك (لازم المراد) تەماشا بکرێت...

سەبارەت بە فیکر و تێڕامانیش بەم فەرموودە پیرۆزە دەستهەڵدەگرین: "تَفَكُّرُ سَاعَةٍ خَيْرٌ مِنْ عِبَادَةِ سَنَةٍ" "سەعاتێك بیرکردنەوە و تێڕامان لە ساڵێك پەرستش خێرترە."[1]

ڕۆژئاوا تاوەکو ئێستا نە ئەمەی بینیوە، وە نە درکی پێکردووە، وە نە گەیشتووشە بەو خاڵە. بە شێوەیەکی بەرنامەڕێژ و سیستەمدار سەعاتێك بیردەکەیتەوە، شتێك دەدۆزیتەوە و دەیخەیتە خزمەتی مرۆڤایەتی، یاخود لە ڕوانگەی ژیانی مەعنەوی و ڕۆحی و بەختەوەریی دواڕۆژ و ژیانی هەتا هەتاییەوە، لە کەشێکی ئەرێنیی ڕێگەپێدراودا ڕۆدەچیتە بیرکردنەوە، ئەوجا بەرهەمی بیرکردنەوە و تێفکرینەکەت بە قازانجی دونیا و دواڕۆژ هەڵدەسەنگێنیت.. بەڵێ، ئەگەر توانیت سەرکەوتوو بیت لەمانەدا، ئەوا پاداشتی ساڵێك عیبادەتت دەست خۆت خستووە.

ساڵانێکە بێگانە بووین بە بیرکردنەوە و لەم عیبادەتە قووڵ و هەمەلایەنە دابڕاوین یاخود دابڕێنراوین. سوچی ئەم دابڕانەش لە ئەستۆی موسوڵمانانە نەك ئیسلام. حەزرەتی محەممەد موستەفا دەرگا و پەنجەرەکانی هزر و بیرکردنەوەی خستووەتە سەرپشت و فەرموویەتی: "أُدْخُلُوهَا بِسَلَامٍ امِنِينَ" "بە دڵنیایی و ئارامییەوە بچنە ناوی." ئێمە ئەو وەختە ساویلکە و ئاوەزکۆتا دەرچووین کە دوورکەوتینەوە لە هزر و زانست. بەم هۆیەشەوە لە بەرامبەر ڕۆژئاواییەکاندا پێگەی خۆمان لە هاوکێشەکاندا لەدەستدا. وەك دەرئەنجامێکی ئاسایی ئەمەش قسە بوو بە قسەی ئەوان. بێگومان ئێمەش بووین بە گوێگریان. بەڵام سەرباری

---

١. الغزالي، إحياء علوم الدين ٤٢٣/٤؛ القرطبي، الجامع الأحكام القرمان ٣١٤/٤.

هەموو شتێك من باوەڕم وایە کە ئەم ئوممەتە، ئەم ئوممەتەی کە لە بناغەکەیدا مەعنەوییات و لە ڕەگ و ڕیشاڵەکانیشیدا پتەوی و ڕەسەنایەتی هەیە، ڕۆژێك دێت سەرلەنوێ چەکەرە دەکاتەوە و دیسان هەڵدەکشێتەوە و دەبێتەوە بە ژمارەیەکی سەنگین لەنێو هاوکێشە نێودەوڵەتییەکاندا.

بەڵێ، پێغەمبەری خوا پەیامی ڕەوشت و پەروەردەی هێنابوو. ئەم کارەشی بەدوور لە قەزەمکردنەوە و شێواندنی سروشتی توانا و لێهاتنی مرۆڤەکان ئەنجامدەدا. ئەمەش بۆخۆی شتێکی زۆر دەگمەن و سەرنجڕاکێش بوو بۆ مرۆڤی ئەو سەردەمە و ببووە مایەی بزواندنیان. هۆکاری ئەمەش ئەوەبوو لە سیستەمە پەروەردەییەکەیدا شتێك نەبوو ناوی دژیەك هاتنەوە بێت لەگەڵ فیترەتدا. بۆیە هەر پەیامێکی ڕۆڵی وزەیەکی بزوێنەری دەبینی. جێی باسە هەموو ئەو ڕێکارانەی لەناو کۆمەڵگەیەکدا پەیڕەو دەکرد کە هیچ شتێکیان دەربارەی ڕەوشت و پەروەردە نەدەزانی. لە دەلاقەی ئەو نموونانەوە کە دەیخەینە ڕوو بۆمان دەردەکەوێت کە پێغەمبەری خوا لە کوێوە بردوونی بۆ کوێ و چۆن بەرزیکردوونەتەوە.

## هـ- چەند نموونەیەک لە سیستەمە پەروەردەییەکەی:

### ١. پیاوێك لە مزگەوتدا میزدەکات

بوخاری و موسلیم ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕنەوە: "ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا لە مزگەوت دانیشتبوو. لەوکاتەدا پیاوێکی دەشتەکی خۆی کرد بە ژووردا. ڕەنگە بەنیازی ئەوە هاتبێت پرسیارێك بکات و شتێك فێرببێت. کەچی ئەوەندەی نەبرد کابرا لە سووچێکی مزگەوتەکەدا دەستیکرد بە میزکردن. ئەوانەی لەوێدا بوون یەکسەر ئاگاداریان کردەوە و پێیان وت: "مَهْ مَهْ" واتە: "ڕاوەستە دەست هەڵگرە!" کەچی پێغەمبەر ڕووی تێکردن و فەرمووی: "وازیلێبێنن میزەکەی پێ مەبڕن." خۆ ئەگەر بێیتە سەر ڕاستی، کابرا دەشتەکییەك بوو دەیانتوانی

هەستن و تێر لێی بدەن. بەڵام وەها ڕەفتارێك ڕەفتارێكی دەشتەكییانە دەبوو. دەی خۆ یارانی سەروەر دەشتەكی نەبوون. ئەوجا فەرمووی: "سەتڵێك ئاو بهێنن و بیكەن بەسەر میزەكەدا، ئاو پیسییەكە پاك دەكاتەوە و ئەوناوەش خاوێن دەكاتەوە."[١]

بەڵێ، لە كۆمەڵە مرۆڤێكەوە كە زۆربەیان تا ئەو رادەیەی لەناو مزگەوتدا میز بكەن نەفام و دەشتەكی بوون، ئەو كۆمەڵە نموونەییەی بەرهەمهێنا. ئێمە چوزانین، بۆی هەیە ئەو دەشتەكییە باوكی تاریقی كوڕی زیاد، شورەحبیلی كوری حەسەنە، یاخود عوقبە بوو‌بێت...

## ٢. بەهای ئافرەت لە دیدی ئەودا

چیدی سەردەمی نەفامی ببوو بە بەشێك لە ڕابردوو و هەموو شتێكیشی یان بە داخ و حەسرەتێكی تاڵەوە دەگێڕدرایەوە، یان ببووە بابەتی بەزمەسات و گاڵتەجاڕی. بەڵێ، وەختێك باسی ئەو سەردەمە دەكرا، واژە و دەربڕینەكان یان ڕەنگی شادی و خەندەیان دەگرت، یان ماتەمیان لێ دەنیشت و ڕەنگیان دەبزڕكا. نەوەبوو جارێكیان دەشتەكییەك هاتە مزگەوت و چەند شتێكی بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە. لەنێو قسەكانیدا ئەم بەسەرهاتەشی تێدابوو: "ئەی پێغەمبەری خوا، منیش ئا بەم دەستانەی خۆم كچەكانم زیندەبەچاڵ كردووە." كابرای دەشتەكی ئەمەی وت و كەوتە گێڕانەوەی بەسەرهاتەكەی:

وەختێك كچەكەم پێگەیشت، دەستیم گرت و بردم بۆ بیابان. تا توانیم لە چاوی خەڵكی دووركەوتمەوە. ئەوجا بە پاچ و خاكەناز كەوتمە هەڵكەندن. كچی بەستەزمانم ئاگای لە هیچ نەبوو. ئەویش لەگەڵمدا چاڵەكەی خۆی هەڵدەكەند. (وەختێك كابرا ئەم دیمەنانەی دەگێڕایەوە، پێغەمبەر وەك بەهارە هەور پڕببوو و فرمێسك لە چاوانی دەهاتە خوار) كاری هەڵكەندن تەواوبوو و كچەكەشم بێئاگا

---

١. البخاري، وضوء ٥٧، مسلم، طهارة ٩٨-١٠٠.

لەوەی چاوەڕێی دەکرد دەیڕوانییە چاڵەکە. لەپڕ کێشام بە پشتیدا و هەڵمدایە ناو چاڵەکەوە. بەدەم کەوتنەوە هەر هاواری دەکرد: "بابە گیان.. بابە گیان!" کاتێك یاران بینییان حەزرەت لەتاو کاریگەریی ڕووداوەکە دەگری، کەوتنە سەرکۆنەی کابرا و پێیان وت: "کابرا بۆ ئازاری پێغەمبەری خوا دەدەی!"[1]

بەڵێ، بارودۆخی ئینسانی ئەو سەردەمە بەوجۆرە بوو. ئافرەت مافی ژیانی نەبوو. جا ئیتر پێغەمبەری خوا لەناو کۆمەڵگەیەکی ئاوادا سەرهەڵدەدات. قۆڵی لێ هەڵدەماڵێت و بەها بۆ هەموو شتێك دەگەڕێنێتەوە، پێگە و بەهایەکی هێندە بڵندیش دەبەخشێت بە ئافرەت کە هەرگیز بەخۆیەوە نەدیوە.

بەڵێ، لەو سەردەمەدا ئافرەت بە سووك تەماشا دەکرا و وەك کاڵایەکی بێ ئەرزش مامەڵەی لەگەڵ دەکرا. باوك ڕووی لێ گرژ دەکرد و کچانی تازە لەدایکبوو لە باوکانیان دەشاردرانەوە. لەڕاستیدا لەو ڕۆژگارەدا سەرژمێری بوونی نەبووە و ئامارێکی لەو شێوەیە نەکراوە. بەڵام پێمwaیە لە سەدا ٥٠ ی ئەو ئافرەتانەی کە لە ژیاندا مابوون، ئەوانە بوون کە بێ ئەوەی پیشانی باوکیان بدرێن ڕفێندرابوون. ڕەنگە تەنها کەسانێکی سروشت ساغ و ڕۆح پاکی هاوشێوەی حەزرەتی ئەبوبەکر منداڵەکانی خۆیان نەکوشتبێت. گەرنا زۆرێك لەوانەی لە گەنجیدا موسوڵمان نەببوون، هەر هیچ نەبێت بکوژی منداڵێك بوون. دەی لە وەها کۆمەڵگەیەکدا پێغەمبەر دێت و کچان بەرز دەکاتەوە بۆ بڵندترین پایە.

سەرنجێك بدەنە ئەو بەسەرهاتەی کە نەسائی لە عائیشەی دایکمانەوە بۆمان دەگێڕێتەوە: "جارێکیان کچێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا و عەرزی کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، بێ ئەوەی ویستی خۆمی لەسەر بێت باوکم منی داوە بە کوڕی مامەکەم." بە بیستنی ئەم قسەیە ڕاستەوخۆ سەروەرمان باوکی کچەی بانگ کرد: "مافی ئەوەت نییە کچەکەت بەزۆر بدەیت بەشوو!" باوکەکەش یەکسەر پەشیمان بووەوە و وتی: "چۆن دەفەرموون با وا بێت ئەی پێغەمبەری

---

١. دارمي، مقدمة ١.

خوا."[1] چاوەڕێش نەدەکرا صەحابی بە جۆرێکی تر بیربکاتەوە. لەوانەیە باوکەکە ویستبێتی بەو کارەی برازاکەی لە گرفتێك یاخود بارێکی گران قوتار بکات، بەڵام قسەی پێغەمبەر لەسەرروو هەموو شتێکەوە بوو. جا وەختێك باوکەکە قسەکانی تەواوبوو کچەکە هەستایە سەرپێ و وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا، مەبەستی سەرەکی من بەرپەچدانەوەی ویستی باوکم نەبوو. بەڵکو ویستم بزانم حوکمی ئەم مەسەلەیە چییە لە ئیسلامدا و لە بابەتی بەشوودانی کچدا باوك تا چ سنوورێك مافی هەیە."

هەر ئەو کیژەی وا دوێنێ زیندەبەچاڵ دەکرا و بە سووك سەیر دەکرا و مافی زەوت دەکرا، لەپاش ماوەیەکی کەم وای لێدێت بچێتە حزووری پێغەمبەر و سەربەستانە داوای مافی خۆی بکات. داخۆ باوکی مافی ئەوەی هەبوو بەزۆر بیدات بەشوو؟ بەدوای وەڵامی ئەمەدا دەگەڕا. ئەگەر چەند ساڵێك لەوەوپێش شتێکی وەها بوترایە، خەڵکی بڕوایان نەدەکرد، یان دەیانوت ئەو کەسە دێوانەیە. بەڵام هەموو ئەو شتانە ڕوویاندا.

## ٣. سونبولی چاوتێری و بێ نیازی لە خەڵك

پێشەوا موسلیم و ئەبو داود لە عەوفی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە: عەوفی کوڕی مالیك دەڵێت: "ڕۆژێکیان لە خزمەت پێغەمبەردا بووین.. نزیکەی ٨-٩ کەس دەبووین. پێی فەرمووین: "بەیعەتم بدەنێ!" ئێمە هەمووومان سەرسام بووین بەم قسەیە. مەگەر ئێمە تا ئێستا چەندین جار بەیعەتمان نەدابوو؟ بۆیە پرسیمان: "لەسەر چی بەیعەت بدەین ئەی پێغەمبەری خوا؟" لە وەڵامدا فەرمووی: "أَنْ تَعْبُدُوا اللهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَتُصَلُّوا الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ وَأَنْ لَا تَسْأَلُوا النَّاسَ شَيْئًا" "بەیعەتم بدەنێ لەسەر ئەوەی کە خوای مەزن بپەرستن و هیچ هاوبەشێکی

---

١. نسائي، نكاح ٣٦.

بۆ بڕیار نەدەن، هەروەها پێنج فەرزەی نوێژ بکەن و هیچ شتێك لە کەس داوا نەکەن."[١]

لە دوایەمین ڕستەدا دەنگی خۆی بەتەواوەتی نزم کردەوە، وەك ئەوەی نەیەوێت کەسانی تر گوێیان لێبێت. دیاربوو کە نەیدەویست دەوروبەرەکەی بیبیستن.

گەر گوێیان لێبوایە ڕەنگە ئەو هاوەڵانە هەستیان بە شەرم بکردایە. ئاخر پێغەمبەری خوا تا بڵێی مرۆڤێکی هەستیار بوو. هیچ کات پەردەی نێوان خۆی و یارانی لانەدەدا.

ساڵان دێت و ساڵان دەڕوات، زۆرێك لەم مرۆڤانە گیرۆدەی هەژاری بوون. ڕاستە هەژار و نەدار بوون، بەڵام لە بابەتی داوانەکردندا هێندە وردمامەڵە و هەستیار بوون، گەر یەکێکیان لەسەر ئەسپەکەیەوە قامچییەکەی لەدەست بەربوایەتەوە، بە کەسی نەدەوت بیداتەوە دەستی، چونکە تەنانەت ئەو هێندەشیان بە داواکردن دادەنا. پێدەچێت دوای ئەو پەیمانە هیچ کامیان پەرداخە ئاوێکیشیان لە کەس داوا نەکردبێت.

پێشەوا بوخاری لە صەحیحەکەیدا بۆمان دەگێڕێتەوە: "حاکمی کوڕی حیزام هاتە خزمەت پێغەمبەر و داوای شتێکی لێکرد. ئەویش داواکەی هێنایە جێ. بەڵام داوای حیزام دوایی نەهات. لە یەك کاتدا چەند جارێك لەسەر یەك داواکەی دووبارە کردەوە.. هەرچییەکی داواکردبوو پێغەمبەری خوا پێی بەخشی. پاشان فەرمووی: "ئەم دونیایە جوان و شیرین و سەوزاییە. ئەگەری هەیە زۆرێکتان خۆتان بدەن بەدەمیەوە و ئەویش ڕاپێچتان بکات. بەڵام بزانن ئەو کاتە بەرەکەتدار دەبێت کە بێ داواکردن پێتان بدرێت. ئەگەر لەبەرئەوە پێتان بدرێت کە داواتان کردووە، ئەوسا دەبێت بە بار بەسەرتانەوە و دەکەونە ژێر منەتیشەوە. جا ئاگادار بن داوا مەکەن!"[٢]

لەدواییدا ئەم کەسە تووشی هەژاری بوو و وای لێهات سواڵ بکات. بەڵام

١. مسلم، زكاة ١٠٨؛ أبو داود، زكاة ٢٧.

٢. مسلم، زكاة ١٠٨؛ أبو داود، زكاة ٢٧.

چ حەزرەتی ئەبوبەکر، چ حەزرەتی عومەر، نەك هەر نەیانتوانی قایلی بکەن بە وەرگرتنی سەدەقە و زەکات، بگرە ئەو بەشەشی وەرنەدەگرت کە لە غەنیمەتەوە دەهات.[1]

## ٤. دیمەنێك لە سەردەمی نەفامی

ئەو زاتە بە سەدان پەردەی چڕ و تاریکی نەریتی نەفامی تەی دەکرد و چاخێکی تاریکستانی دەگۆڕی بۆ سەردەمی نوور و ڕۆشنایی.

بە مەبەستی تیشك خستنە سەر ئەم بابەتە، لێرەدا ئاماژە بە وتەکانی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب دەکەین لە بەرامبەر نەجاشیدا: "ئەی پادشا، ئێمە هۆزێك بووین خوێنمان دەخواردەوە و.. مردارەوەبوومان دەخوارد و.. بەدڕەوشتیمان دەکرد و.. دزی و جەردەییمان ئەنجام دەدا و.. پیاومان دەکوشت و پیشەمان تالانی بوو.. بەهێز لاوازی دەچەوساندەوە و چەندین شتی دیکەی ئابڕووبەرمان ئەنجام دەدا..." وەختێك جەعفەر ئەم بەدکارییانەی دەژمارد، لە هەمان کاتدا ئاماژەی بۆ ئەو شەپۆلی تاریکییە یەك لەسەر یەکانەش دەکرد کە بەر لە هاتنی حەزرەتی محەممەد بەژنی مرۆڤایەتی داپۆشیبوو.

بەڵێ، لە وەها کۆمەڵگەیەکدا لەسەر شتێکی بچووك دەکرێت بە قیامەت.. لەسەر بانگەشەی حەقداری دوو کۆمەڵ بەیەکدا هەڵدەپژێن و قڕ دەخەنە یەکتری.. دیسان لەناو ئەو کۆمەڵگەیەدا بەدڕەوشتی دەرگای بۆ دەخرێتە سەرپشت و.. گەندەڵی پەسەند تەماشا دەکرێت.. ژمارەی ئەوانەشی مەینۆش نین، ژمارەی پەنجەکانی دوو دەست یان تێپەڕ دەکەن یان نا.

دەی لەناو کۆمەڵگەیەکی وەهادا کە تا بڵێی ئالوودەی نەریتە ناپەسەندەکانیان بوون و لە ڕادەبەدەریش دەمارگیرییان هەبوو بۆ نۆرم و خووە نامرۆڤانەکانیان، ئەو

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ١/٢٠١-٢٠٢.

سەرومرە دێت و لە کەمترین ماوەدا ئەو ڕەوشتە خراپ و خووە گەنیوانە لەناویاندا ڕیشەکێش دەکات و لە جێیاندا جوانترین خەسڵەت و بەهادارترین سیستەمی ئەخلاقی جێگیر دەکات. ئەفلاتون لە "کۆمار"ەکەیدا و کەسانی تریش (بە وێنەی تۆماس مۆر) لە یوتۆپیاکانیاندا هەر خەریکی خونجەکردنی وەها کۆمەڵگەیەک بوون. کەچی حەزرەتی محەممەد موستەفا لە زوویەکەوە ئەو کۆمەڵگەی فەزیلەتەی لەسەر ئەرزی واقیع هێنابووە دی.

ئاشکرایە هێنانە کایەی کۆمەڵێك کە مامۆستایەتی مرۆڤایەتی بکەن لە ڕووی مەدەنییەتەوە لە کۆمەڵە خەڵکێکی نەفام و دەمارگیر لە نەفامیەکەیاندا، بگرە خەڵکانێك کە جگە لە نەفامی شتێکی دیکە نازانن، شتێکە هاوشێوەی هێنانەکایەی خۆری پرشنگدارە لە هەناوی تاریکستانی ئەنگوستەچاوەوە. دەی ئەوەتا حەزرەتی محەممەد بە ڕێوشوێنە ناوازەکانی ئەمەی کردووە و پیشانی داوین کە خۆشی زاتێکی موعجیزەیە.

ئێمەیەك کە دەستەوسانین لەوەی خووی کەسێك بگۆڕین کە چەندین ساڵ ژیاوە لەگەڵمان، لە بەرامبەر حەزرەتی محەممەددا کە خوو و نەریتی لەگەڵ خوێن تێکەڵبوو و بەسروشتبووی ئەو مرۆڤانەی لە ڕەگ و ڕیشەوە دەرهێنا، دەستەنەزەر دەوەستین و ئەو شایەتییەمان جارێکی تر نوێ دەکەینەوە کە ئەو فرستادە و نێردراوی ڕاست و حەقی پەروەردگارە. بەڵێ، بە ئەندازەی خانە و گەردیلەکانی بوونمان هاوار دەکەین و دەڵێین: "ئەو پێغەمبەری خوایە!"

من وەك خۆم بەتەواوی مانا سەرکەوتوو نەبووم لەوەی لە نزیکترین کەسەکانی دەوروبەرمدا ببمە هۆکاری ڕەنگدانەوەی ئەو "سیستەمی پەروەردە" نموونەییەی کە لە ئەندێشەمدا نەخشەم بۆ داڕشتووە -بێگومان هەر ئەو ئیلهام بەخشمە و سەرچاوەکەی مەدینەیە- هەر "فەزیلەت.. فەزیلەت"م بوو.. پێستی زوبانم سوا کەچی هەر نەمتوانی بەڕووی فەزیلەتدا بێداریان بکەمەوە. دەی ئەوە چ هێزێکی نایاب و چ وزەیەکی بێ وێنەیە کە پێغەمبەری خوا گرۆیەك ئادەمی لە نەفامییەوە بەرەو شارستانییەت و لە پەستییەوە بەرەو بڵندی و

لە دەشتەکێتییەوە بەرەو مەدەنیەت ئاڕاستە دەکات. بەوەشەوە ناوەستێت، بەڵکو دەیانکات بە مامۆستای گەلانی خاوەن شارستانییەت. پێشموایە کەسانی هیچ لەدەست نەهاتووی وەك من و ئەوانەش کە لە ماڵدا گوێیان بۆ ناگیرێت زۆر چاك لە گەورەیی و مەزنیی ئەو نازدارە تێبگەن کە بە هەڵمەتێك مرۆڤایەتی بەرزکردەوە و ئیلهامی ڕۆحی خۆی لە سینە و دەروونیاندا خاڵی کردەوە... ئەوەندە هەیە کە نەکەوینە داوی بڕیاری پێشوەختە و گیرۆدەی دەردی کەللەڕەقی نەبین.

هەر لە سەردەمی خۆیدا گەیشتە ئێران و توران. لەکاتێکدا چ ئێران، چ توران و تورك و ڕۆما، هەریەکەیان لەژێر کاریگەریی کلتوری جیاوازدا بوون. کەچی پەیامەکەی وەك پۆشاکێك بە بەریان دووراببێت، ئاوەها بۆیان گونجاو بوو. ئەمەش خۆی لە خۆیدا ڕووداوێکی دەراسایە. بەڵێ، لەڕاستیدا بڵاوبوونەوەی پەیامەکەی بە سەرانسەری گۆی زەویدا و قسە ڕۆشتنی لە هەموو لایەکدا موعجیزەیەکی گەورەیە.. ئەو موعجیزەیەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو لە لایەن زاتی پەروەردگارەوە نێردراوە. واتە ئەو پێغەمبەری خوایە. مەبەستی ئێمەش هەر ئەمەیە.

ڕەنگە کەسێك لە ڕێگەی بلیمەتییەکەیەوە بتوانێت سروشتی سەدەکەی خۆی بخوێنێتەوە. بۆ نموونە، بۆی هەیە ئەسکەندەر تا ڕادەیەك دەرکی بەو سەدەیە کردبێت کە تیایدا ژیاوە. لەوانەشە قەیسەر و ناپلیۆن پێش سەردەمەکانی خۆیان کەوتبن.. وە هتد.. بەڵام ئەوە تەنها تایبەتمەندیی پێغەمبەری خوایە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) کە لەناو گەل و نەتەوە زۆر و زەبەندە و جیاوازەکانی دونیادا کە لەپاش خۆی هاتوونەتە سەر شانۆی ژیان، قسەی ڕۆیشتووە و پەیامەکەی لەگەڵ باری ڕۆحیاندا تەبا بووە و هەموویان بەجارێك "بەڵێ"یان بۆ کردووە. لە بەرامبەر ئەمەدا شتێکی دیکە شك نابەین مەگەر ئەوە نەبێت بڵێین بەڕاستی ئەمە موعجیزەیە.. دەربڕینێکی دیکەش نازانم وەسفی ئەم حاڵەتە بکات.

بەڵێ، ئاڵپەرسلان کە ٤-٥ سەدە پاش پێغەمبەری خوا ژیاوە، بە تەواوی بوونیەوە دەستلەملانی پەیامەکەی ببوو و خۆی تێدا دەبینییەوە. هەروەها سەرکردەیەکی وەك محەممەد فاتیح کە بە یەکێك لە ناودارترین سەرکردەکانی مێژوو دادەنرێت

و دەرگای لەسەر سەردەمێك كردووەتەوە و سەردەمێكیشی داخستووە، ئەویش بەوێنەی ئەوانەی پێش خۆی پەیامەكەی پێغەمبەری قبووڵ كرد. ئەوانەی دوای ئەویش بە هەستیارییەوە پەیڕەوی هەمان ڕێباز بوون و بە هەمان ڕێچكەدا هەنگاویان هەڵناوە. لەكاتێكدا هەریەك لەوانە لە كەسانی بلیمەت و هەڵكەوتووی ناو مرۆڤایەتیش بوون. كەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز سستییان نەنواندووە لە ملكەچیدا بۆ ئەو سەرومرە.

ئێستاش وا لە دەروازەی سەدەی ٢١ داین. كەچی تێپەڕینی چواردە سەدەی دوور و درێژ هیچ شتێكی لە مەسەلەكە نەگۆڕیوە. ئەوەتا لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا پەیام و بەرنامەكەی پەیامێكی تەڕ و پاراو و نفت و نوێیە و شتانێكی تازە بە دڵ و ڕۆحەكاندا دەچرپێنێت. چونكە ئەو پەیامانەی لەلایەن زاتێكەوە دەهێنا و پێی رادەگەیاندین كە خنورەی دڵمانی دەزانی و ئاگاداری ڕۆحمان بوو و خۆی بە ویژدانمان دەناساند و لەڕێی ئاسەوارەكانیەوە ژێریمانی تێردەكرد. دەنا دانانی سیستەمێك كە بۆ سەرجەم سەردەمەكان لەباربێت و داخوازی گشت چاخەكان دەستەبەر بكات، كارێكە لە وزە و توانای مرۆڤ بەدەرە، جا با ئەو مرۆڤە هەر كەسێك بێت.

## و- سیستەمی فێركاری لای پێغەمبەر

جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بدەین ئەو بنەما پەروەردەیی و فێركارییانەی كە پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هێناویی، بە دوور و درێژی و وردەكارییەكانییانەوە لە قورئان و سوننەتدا ڕوونكراونەتەوە. لەڕاستیدا گەر پێغەمبەر هیچ شتێكی دیكەی نەكردبێت جگە لەوەی قورئانی پیرۆزی گەیاندبێت و ڕوونی كردبێتەوە، ئەوا ئەمە بۆخۆی كارێكی ناوازە و سەرسامكەرە. قورئان بابەتی ئێستامان نییە، لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژە بۆ چەند خاڵێك دەكەین:

وەك ئاشكرایە پێغەمبەر (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەناو كۆمەڵگەیەكدا دەركەوت كە

نەزان و نەناس بوون بە خوێندن و خوێندەواری. وەختێك وەفاتیشی كرد، لەناو هاوەڵانیدا هەر لەومیانەوە كە تازە پێگەیشتبوو تاوەكو ئەو بەساڵاچووەیان كە ئەوەندەی نەمابوو ماڵئاوایی لە دونیا بكات، تاكێكیان تێدا نەمابوو نووسین و خوێندنەوە نەزانێت. هەنووكەش كە لە حاڵی كۆمەڵگەكەمان دەڕوانین، دەبینین سەرباری ئەو هەموو هەوڵ و كۆششەی دەدرێت، بگرە ئەو زۆرەملێ و ناچاركردنەش كە پیادە دەكرێت، كەچی هێشتا نەمانتوانیوە نووسین و خوێندنەوە فێری بەشێكی زۆر لە هاوڵاتیانمان بكەین. ئەمە سەرباری ئەوەی ٦٥ ساڵ تێپەڕیوە بەسەر پەیڕەوكردنی پیتی لاتینی لە وڵاتدا. پێغەمبەری خوا لە ماوەی بیست و ئەوەندە ساڵدا كە لەڕاستیدا فەترەیەكی زەمەنیی كورتە، چاوی هەمووانی بەڕووی حەقیقەتدا كردەوە و فێری خوێندنەوە و نووسینی كردن. پێموابێت وەختێك ئەو سەرومرە بەرەو خانەی هەمیشەیی كۆچی كرد، لەنێو هاوەڵانیدا تاكە كەسێكیش چییە نەمابێت شارەزای خوێندنەوەی قورئان نەبووبێت. بەس خوێندنەوە نا، بەڵكو جوتیار و باخەوانانی بێستانەكانی مەدینە بەدەم زەوی كێڵانەوە قورئانیان بە هەر حەوت یان دە شێوازەكەی دەخوێندەوە. دەی لەمڕۆدا ئەم شێوازی خوێندنەوەیە كە بە "زانستی وجوە" ناسراوە، چەند كەسێكی كەم نەبێت كەسی دیكە شارەزای نییە، بە نووسەری ئەم دێڕانەشەوە.

ڕاستە خەڵكی ئەوكاتە بە فیترەت زیرەك بوون و خاوەن بیر و هۆشێكی تیژ و دەمەزەرد بوون، بەڵام ناكرێت ئەمە تەنها بە زرنگی و هێزی زاكیرە لێكبدرێتەوە. بەڵكو ئەوە دەرهاویشتەی سیستەمە فێركارییەكەی پێغەمبەری خوا بوو كە وایكرد بە دڵ و گیان و هەست و هۆشیان ئاوێزانی قورئان ببن.

ئاشكراشە پێشتر ئەو مرۆڤانە زەمینەیەكی لەباربوون بۆ هەموو جۆرە بەدڕەفتاری و دزێوییەك. كەچی پێغەمبەر بە هەڵسوكەوتە ناوازەكانی توانی هەموو نەریتە خراپەكانیان لە بێخەوە هەڵبكێشێت و لە قاڵبێكی تازەی ناوازەدا دایانبڕێژێتەوە.

بۆ نموونە خوای باڵادەست دەفەرموێت:

﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ﴾

(الإسراء: ٢٣)

"پەروەردگاری تۆ بڕیاریداوە کە جگە لەو کەسی تر نەپەرستن. هەروەها بڕیاریداوە چاکەکاریش بن لەگەڵ دایك و باوکتاندا."

ئەم فەرمانە خواییە شوێنکارێکی وەها بەسەر ئەو کەسانەوە جێدەهێڵێت کە تا دوێنێ ئازاری دایك و باوکیان دەدا و ناڕەواترین ستەمیان لێدەکردن بگرە دەشیانکوشتن، هی وایان تێدابوو دەهاتە خزمەت پێغەمبەر و پرسیاری ئەوەی لێدەکرد ئایا گوناهبار دەبێت گەر باوکی تەماشای بکات و ئەم خەندەی بەڕوودا نەنوێنێت.

هەروەها لە قورئاندا هاتووە:

﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴾

(الأنعام: ١٥٢)، (الإسراء: ٣٤)

"نزیك ماڵ و سامانی هەتیو مەکەون مەگەر بەچاکی و لە قازانجی نەبێت."

لەژێر کاریگەریی ئەم ئایەتەدا زۆرێك لە موسوڵمانان دەهاتنە لای سەروەرمان سامانی ئەو هەتیوانەیان تەسلیم دەکردەوە کە لەلایان بوو. لەلایەکی ترەوە، ئەگەر لە ئایەتەکە ورد ببینەوە دەبینین نافەرموێ: ماڵی هەتیوان مەخۆن. بەڵکو دەفەرموێت: "توخنی ماڵی هەتیوان مەکەون." بۆیە لە بابەتێکی وەها هەستیاردا هاوەڵان هەڵدەستان بە نیشاندانی هەستیاریی تایبەت بە خۆیان و ئەستۆی خۆیان لەو ماڵ و سامانە پاك دەکردەوە کە تایبەت بوو بە هەتیوان. ئەو خەڵکە چ شتێکیان لێ بەسەرهاتبوو! خۆ تا دوێنێ پەلاماری ماڵی هەتیوانیان دەدا و بێ پەروا دەیانخستە سەر ملۆی سامانی خۆیان. چ شتێك وای لێکردن وا لەپڕ بگۆڕێن!..

زینا و بەدڕەوشتیش -هاوشێوەی کارە دزێوەکانی تر- ڕەواجی سەندبوو و وەك شتێکی پەسەند لەناو کۆمەڵدا تەماشا دەکرا. کەسێکی ئەوتۆش نەبوو ڕەخنە لەم حاڵەتە بگرێت. کەچی قورئانی پیرۆز پاش ماوەیەك لە نازڵبوونی، بە ڕوونی فەرمووی:

﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ﴾ (الإسراء: ٣٢)

"هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیك ببنەوە."

لەگەڵ ئەم ئایەتەدا پەتی هەموو پەیوەندییە ناشەرعییەکان پسا و کۆتایی بەو ڕەوشتە نالەبارە هات.. بەڵێ، لەپاش ئەوە مەگەر تەنها یەك دوو حاڵەتی لەوجۆرە ڕوویاندابێت.

هەرچی دزی و جەردەییشە ببووە نیشانەی ئازایەتی و پاڵەوانی. بەڵام هەر کە فەرمانی:

﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا ﴾ (المائدة: ٣٨)

"دەستی پیاوی دز و ئافرەتی دز ببڕن."

دابەزی، بارودۆخەکە سەرلەبەر گۆڕا. من بزانم، لەپاش ئەم ئایەتە جگە لە یەك دوو حاڵەتی زانراو کە بە دەست بڕین کۆتایی هاتووە، هیچی دیکە ڕووی نەداوە...

دیسان قورئانی پیرۆز ڕووی گوفتاری کردەوە ئەو کۆمەڵە بکوژەی کە کوشتنیان بەلاوە وەك ئاوخواردنەوە وابوو و پێی فەرموون:

﴿ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ ﴾ (الإسراء: ٣٣)

"کەسێك نەکوژن کە خوا کوشتنەکەی حەرام کردبێت."

ئیدی ئەم ئایەتە بەس بوو بۆ بنبڕکردنی کوشتار و خوێنڕشتن. بەدرێژایی هەموو ئەو سەردەمەش دوو حاڵەت ڕوویدا: یەکێکیان موسوڵمانێك بە ئەنقەست

جوولەکەیەکی کوشت. ئەوی تریشیان کوشتنێکی بەهەڵە بوو.

ئێستا وەرن بیربکەنەوە: لە ماوەی بیست و سێ ساڵی پێغەمبەریدا تەنها چەند ڕووداوێکی وەك: زینایەك کە خاوەنەکەی دانی پێداناوە و کوشتنی جوولەکەیەك و بڕینی دەستی ئافرەتێك بینراوە. لەکاتێکدا -وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا- کۆمەڵگەیەك بوون مردارەوەبوویان دەخوارد و وەك خوێنمژ خوێنیان دەنۆشی.

ئا لەو کۆمەڵگەیەوە پێغەمبەر کۆمەڵگەیەکی تری بێگەردی وەك ئاوی گەوارای هەڵێنجا و کۆمەڵە قامەتێکی هاوڕێنەی: ئەبوبەکر و ئەبو هورەیرە و تەنانەت ماعیز و خاتوونە غامیدییەکەشی دروستکرد کە ئێمە تاوەکو ئێستا بە سەرداری خۆمانیان دەزانین. لەو زەلکاو و قوڕاوەوە کۆمەڵگەیەکی نووارنی سەرهەڵدەدات. جا ئەگەر ئەوە موعجیزە نەبێت ئیدی موعجیزە چییە؟

ڕاستییەکەی ناتوانم لێرەدا ئەم بابەتە قووڵ و بەرینە بەتەواوی لایەنەکانییەوە بخەمە بەر باس و لێکۆڵینەوە. لەبەرئەوە گەر ڕێمبدەن دەمەوێت تیشك بخەمە سەر چەند بنەمایەکی ڕەوشتە بەرز و بڵندەکەی و یەك دوو نموونەش بهێنمەوە تاوەکو مەودای مەزنیی ڕێکارە نەبەوییەکان بۆ هەموو لایەك دەربکەوێت.

## ١. بەخشندەیی و جوامێری

ئێمە باس لە کۆمەڵگەیەك دەکەین کە جگە لە بەرژەوەندی و قازانجی خۆی بیری لە هیچ شتێکی تر نەکردووەتەوە. هاوکاریکردنی کەسانی تر و درێژکردنی دەستی یارمەتی بۆیان لەو شتانەن کە نەبووەتە میوانی خەونەکانیشیان. بەتایبەت خەسڵەتی "ئیثار" کە بریتییە لە پێشخستنی کەسانی تر بەسەر خوددا، خەسڵەتێك بوو نە بیستبوویان نە دەشیانزانی چییە. بەڵام وەك چۆن ریسالەتی ئەحمەدی زۆر شتی لەناویاندا گۆڕی، هەر بەوجۆرە ڕژدی و دەستنووقاویشی تێدا دەرهێنان و لە جێگەیدا دەست و دڵ فراوانی و جوامێری چاند.

شێرەکەی دەوس کە ئەبو هورەیرەیە، بۆمان دەگێڕێتەوە: "ڕۆژێکیان یەکێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ). لێی نزیکبووەوە و عەرزی کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا چەند ڕۆژێکە پاروویەك بە گەرووما نەڕۆشتووەتە خوارەوە و لەسەریەك بە برسێتی بەڕۆژوو بووم." پێغەمبەر چاوێکی گێڕا بە دەوروبەریدا، بەڵام کەسێکی شك نەبرد میوانداری کابرا بکات. هەرچۆنێك بێت پاش ماوەیەك ئەبو تەڵحە کە یەکێك بوو لە خۆشەویستانی پێغەمبەر، هەستایە سەرپێ و وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا من میوانداری دەکەم." ئەوجا لەگەڵ خۆی بردیەوە بۆ ماڵەوە.

شتێکی ئەتۆ لە دەستی ئەم خانەوادە جوامێرەدا نەمابووەوە، چونکە هەموو شتێکیان لەپێناو ئیسلامدا خەرجکردبوو.. جارجار گەر ببوایە شۆربایەکیان لێدەنا. ڕەنگە ئەو ڕۆژە ئوم سولەیم تاسێك شۆربای بۆ منداڵەکانی لێنابووبێت. وەختێك میوان هاتە ماڵ، ژن و مێرد لەنێوان خۆیاندا کەوتنە وتووێژ: "با ئەمشەو شۆرباکە دەرخواردی میوانەکەی پێغەمبەر بدەین. هەرچۆنێك بێت خۆمان دەتوانین بە برسێتیش بەڕۆژوو بین. بۆیە وا باشە منداڵەکان قایل بکەین و بیانخەوێنین. با ڕۆژ هەڵبێت خوا کەریمە چارەیەك دەدۆزینەوە."

ئەوەی پێی هەڵدەستان ئەمەبوو: "کە خوان ئامادە بوو خاتوونی ماڵ بە هەڵە مۆمەکەی دەکوژاندەوە و خاوەن ماڵیش کەوچکەکەی بە بەتاڵی دەهێنا و دەبرد.. ئاخر شۆرباکە بەشی ئەوەی نەدەکرد دوو کەس تێر بکات.. ئیتر بەمجۆرە میوانەکە تێری دەخوارد. پلانەکەیان وەك خۆی چووە سەر. دواجار کاتی نوێژی بەیانی هات و لە پشت پێغەمبەری خواوە بۆ نوێژ وەستان. لەدوای نوێژ پێغەمبەر ئاوڕی دایەوە بۆ دواوە و چاوی بۆ ئەبو تەڵحە و میوانەکەی گێڕا. ئەوجا پرسی: "ئەوە ئەمشەو چیتان کردووە وا ئەم ئایەتەتان لەسەر دابزیوە؟":

﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾

(الحشر: ٩)

"حەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان دەکەن، فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە هەژارو نەداریشن."[1]

خەسڵەتگەلێکی هاوشێوەی: پێشخستنی کەسانی تر، تێرکردنی برسی، پۆشتەکردنی موحتاج، ژیان لەپێناو ئەوەی کەسانی تر بژین، دەستبەرداری لە چێژ لەبەرئەوەی کەسانی تر چێژ وەربگرن، کۆمەڵە واتایەك بوون لە فەرهەنگی مرۆڤی سەردەمی نەفامیدا بزر بوون. ڕاستە بزر بوون، بەڵام پێغەمبەر هات و فێریکردن، پێی ڕاگەیاندن و بەوێنەی نەخشی سەر مەڕمەڕ ئەم هەستانەی لە ڕۆحیاندا هەڵکۆڵی. تۆ دەتوانی ناوی ئارامگری یاخود تەسلیمییەت لەم ڕۆحییەتی خەمخۆرییە بنێیت، ناوەکەی هەرچییەك بێت ئەنجامەکەی نەگۆڕە.

بەڵێ، با جارێکی تر ئەم وتە بەپێزە بیر خۆمان بخەینەوە: "ئیمان داخوازی تەسلیمبوون و.. تەسلیمبوونیش داخوازی تەوەککول و.. تەوەککولیش داخوازی بەختەوەری دونیا و دواڕۆژە."[2] ئەگەر باوەڕتان هێنابێت ئەوا بەدڵنیاییەوە تەسلیم دەبن و خۆتان دەدەنە دەست خوا. هەرکاتیش خۆتان دایە دەست خوا، پشتی پێدەبەستن و متمانەتان پێی دەبێت... تا ئەوکاتە بە کامەرانی هەردوو دونیا شاد دەبن.

## ٢. پاڵەوانێتی خەنسا

خەنسا بەو شین و لاواندنەوانەی کە بۆ مەرگی براکەی دەیهۆنینەوە، دونیای هێنابووە گریان. ئەودەم ئەم ئافرەتە مەزنە هێشتا لە تەمومژی نەفامی ڕزگاری نەببوو و حەزرەتی محەممەدی نەدەناسی. تا ئەو وەختەش گوێی نەدابووە پەیامە ئەفسووناوییەکەی قورئانی پیرۆز و بەڕوویدا نەکرابووەوە. کاتێك قورئانی ناسی بەجارێك گۆڕا. بەڵام چ گۆڕانێ! ئەو خاوەن ڕۆحە مەزنەی لە نەفامیدا

---

١. البخاري، تفسير (٥٩) ٦؛ مسلم، الأشربة ١٧٢-١٧٣.

٢. بەدیعوززەمان. وتەکان، وتەی ٢٣، باسی یەکەم، خاڵی سێیەم.

داستانی بۆ مەرگی براکەی دەهۆنیەوە، لە قادسیەدا هەر چوار کوڕەکەی بەدوای یەکدا شەهید بوون. کەوتنی هەر یەکێکیشیان کزەی لە سینەی دایکی ئیلهامناس دەهێنا.. بەڵام سەرباری هەموو شتێك بەوپەڕی تەسلیمیەتەوە ئەم وشانەی لەزار دەهاتە دەر:

"خوایە سوپاس بۆ تۆ. تا لە ژیاندابووم دەرفەتی ئەوەت پێبەخشیم هەر چوار کوڕەکەمت پێشکەش بکەم."[1]

جا فەرموون بە چاوی خۆتان بڕواننە ئەو گۆڕانەی کە حەزرەتی محەممەد بەسەر مرۆڤەکاندا هێنای و موعجیزەی ئەو دەستە ببینن کە ئەو گۆڕانکارییە گەورانەی هێنایەکایەوە.. هەروەها ببینن چۆن لە هەناوی تاریکییەوە ڕووناکی دەرهێنا و لە جەرگەی تاریکستانیشدا درەوشانەوەی نووری دەرخست... دیسانەوە دەیڵێمەوە: "گۆڕینی ئینسانەکان بەو خێراییە موعجیزە نەبێت چییە؟"

## ٣.ئەو قارەمانانەی لە ساتێکدا بە بۆیەی محەممەدی ڕەنگداربوون

### عیکریمە

لەگەڵ فەتحی مەککەدا عیکریمە هەڵهات، هەرچۆنێك بێت دواتر لە لایەن هاوسەرەکەیەوە قایلکرا بەوەی بگەڕێتەوە. وەختێك ئەم نەیارە سەرسەختەی پێغەمبەر هاتە حزوور، حەزرەت بزمیەکی بە ڕوودا نواند و پێی وت: "مَرْحَباً بِالرَّاكِبِ الْمُهَاجِرِ."[2]

ئەم وتەیە بەس بوو بۆ فەتحکردنی دڵ و دەروونی. بۆیە هەر لەوێدا پەیمانی

١. إبن كثير، أسود الغابة ٧/٨٨-٩٠؛ إبن حجر، الإصابة ٤/٢٨٧-٢٨٨.

٢. "سڵاو لە سواری کۆچبەر" ( ترمزي، إستيمان ٣٤؛ الطبراني، العجم الكبير ١٧/٣٧٣.)

به خۆی دا كه: چ خۆی و چ عامری تاقانه كوڕی له‌و ڕێیه‌دا گیانی خۆیان به‌خت بكه‌ن. له‌ یه‌رموكدا وه‌ختێك دوا ساته‌كانی ژیانی ده‌ژمارد، هاتنه‌ لای و پێیان وت عامری كوڕی شه‌هید بووه‌. له‌گه‌ڵ بیستنی ئه‌م قسه‌یه‌دا عیكریمه‌ له‌ جێی خۆی ڕاستبووه‌وه‌. پێده‌چێت خۆشه‌ویست خۆی پیشان دابێت و ئه‌ویش عه‌رزی كردبێت: ''ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا (صَلَّیَ‌اللّٰهُ‌عَلَیْهِ‌وَسَلَّمَ)، په‌یمانم پێدابووی كه‌ له‌م ڕێیه‌دا كوڕه‌كه‌شم بكه‌مه‌ قوربانی. جا ئایا سواری كۆچبه‌ر په‌یمانی خۆی برده‌ سه‌ر؟'' ئاخر شتی وا ده‌بێت له‌ كوڕه‌كه‌ی ئه‌بو جه‌هله‌وه‌ "سواری كۆچبه‌ر" دروست ببێت؟ ئاخر چۆن له‌و مرۆڤه‌ تاریك ویستەوه‌ كه‌ له‌ هه‌موو ده‌رفه‌تێكدا سه‌نگه‌ری له‌ پێغه‌مبه‌ر ده‌گرت و گه‌وره‌ترین ئاواتی ئه‌وه‌بوو له‌ناوی به‌رێت، "سواری كۆچبه‌ر"ێكی وه‌ها ده‌هاته‌ مه‌یدان كه‌ پێشی فریشته‌كانیش بداته‌وه‌؟ تومه‌ز شتی وا ده‌بوو.. هه‌ر به‌ڕاستیش بوو.

ئه‌وێك كه‌ له‌ سه‌رده‌می نه‌فامیدا دارا و خاوه‌ن هێز بوو و لاواز و بێده‌سه‌ڵاته‌كانی ده‌چه‌وساندەوه‌ و ڕێی پێده‌گرتن. جا خۆ لاواز مافی ژیانی هه‌ر نه‌بوو. ئافره‌ت ئه‌وه‌ كه‌ به‌ هیچ شێوه‌یه‌ك مافی ژیانی نه‌بوو. له‌ولاشه‌وه‌ منداڵان له‌پێناو هیچدا ده‌كوژران. هه‌زار ده‌سه‌ڵاتی ئه‌وه‌ی نه‌بوو بڵێ: ''ئاخر منیش مرۆڤم و مافی خۆم هه‌یه‌!'' ئه‌وه‌ نه‌بێت یاسا و ڕێسا له‌ناویاندا نه‌بووبێت. وه‌ك هه‌میشه‌ هه‌بووه‌. به‌ڵام به‌رده‌وام وه‌ك ئامرازێك له‌ دژی داماو و بێده‌سه‌ڵاته‌كان به‌كارده‌هێنران. (مه‌گه‌ر له‌ ڕۆژگاری ئه‌مڕۆشماندا هه‌ر هه‌مان چیرۆك نییه‌..؟!) ده‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا له‌م مرۆڤه‌ بێ به‌زه‌ییه‌ داد و ماف نه‌ناسانه‌وه‌ كه‌سانێكی فریشته‌ ئاسای وه‌های پێگه‌یاند كه‌ بوونه‌ ئاوێنه‌ی دادگه‌ری.

## حه‌زره‌تی عومه‌ر

عومه‌ر، جێنشینی پایه‌به‌رز.. له‌ لوتكه‌ی فه‌رمانڕه‌وایی ده‌وڵه‌تێكدا بووه‌ سه‌رێكی خاكه‌كه‌ی له‌ یه‌مه‌ن و سه‌ره‌كه‌ی تریشی له‌ نزیك بوخارا بووه‌. جارێكیان له‌نێوان ئه‌م حه‌زره‌تی عومه‌ره‌ و ئوبه‌ی كوڕی كه‌عبدا جۆرێك له‌

لێکتێنەگەیشتن دروست دەبێت. نوبەی دەڵێت: "ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا ناهەقی دەکەیت!" ئەویش پێشنیازی ئەوە دەکات بچنە لای دادوەر و لەوێ مەسەلەکەیان یەکلایی بکەنەوە. زەیدی کوڕی سابیت دەبێتە داوەریان. پێکەوە دەڕۆن بۆ ماڵی زەید. وەختێك خەلیفە دەچێتە ژوورەوە، قازی مەدینە وەك ڕێزێك ئاماژە بە جێیەك دەکات لە لای سەرەوە و دەڵێت: "ئەی پێشەوای باوەڕداران فەرموون لێرە دابنیشن!" لە بەرامبەردا حەزرەتی عومەر ناوچەوانی گرژ دەکات و قسەیەك دەکات کە هەق وایە وەك گوارە بکرێتە گوێی مێژوو: "هَذَا أَوَّلُ جَوْرٍ جُرْتُ فِي حُكْمِكَ" "هەر لە ئێستاوە یەکەم ناهەقیت لە حوکمەکەتدا کرد!"[1]

***

پوختەی قسە: لەڕاستیدا ئێرە جێی ئەوە نابێتەوە سەرجەم ڕەوشت و یاسا و ڕێساکان ڕیز بکەین. چونکە بە سەدان یاسا و بنەمای ڕەوشتداری بوونی هەیە. لێرەدا تەنها ئاماژەمان بە چەند دانەیەکیان کرد. خۆ ئەگەر بواری ئەوە هەبوایە یەکە بەیەکەی پرەنسیپە ئەخلاقییەکان ڕیز بکەین، پێموایە دیدگایەکی ڕوونترمان دەبوو بۆ ئەو ڕێکارە سەرو ئادامییانەی سەروەرمان پیادەی کردوون. چونکە وەك دەزانین، هەرچی بەهای ئەخلاقی و بنەمای ڕەوشت هەیە مرۆڤی ئەو سەردەمە بە پێچەوانەی ئەوانەوە جووڵاوەتەوە. سەروەری هەردوو جیهانیش هات و هەموو ئەو نەریتە دزێوانەی لە بێخ دەرهێنا و بە هەرچی خەسڵەتی پەسەند و بەرز هەیە پۆشتەیکردن.

پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە بواری پەروەرشیاریشدا نموونەیەکی دەراسای خستە بەرچاومان و کۆمەڵە بنەمایەکی پەروەردەیی وەهای دانا -کە دەکرێت لە ڕێی بەراوردکردن و چواندنەوە زیاتر و قووڵتریان بکەینەوە- تەواوی مرۆڤایەتی و سەرجەم سەردەمەکانی لەخۆ گرتبوو.

بە بڕوای ناچیزی بەندە، ئەگەر بتوانین پەی بە قووڵی و کرۆکی پشت ئەو

---

١. بیهقی، السنن الکبری ١٠/١٤٤.

بنەمایانە بەرین و بەڕاستی لێیان تێبگەین، ئەوا مانای وایە گەیشتووین بە ئاستێك فریشتەکانیش خۆزگەمان پێ بخوازن. بەڵام چی بکەین، وەك "حەمیدە قوتب" دەڵێت: "ئێمە هێشتا لە ڕێگەداین." ڕیوایەت کراوە حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێبێ) سەرسامی خۆی بۆ خوا دەردەبڕێت و دەڵێت: "پەروەردگارم! دەبینم زۆر لە خەڵکی هیدایەت وەردەگرن و ڕێگەی تۆ دەگرنە بەر، کەچی -زۆر سەیرە- لەپڕ ڕێگەکەیان دەگۆڕن و ڕوودەکەنە شوێنی تر!"

خوای میهرەبانیش بە کەماڵی دانستەوە دەفەرموێت: "ئەی موسا! ئەوانە هەرگیز بەرەو لای من نەهاتبوون و منیان نەدۆزیبووەوە و نەگەیشتبوون بە من. ئەوانە کەسانێك بوون هێشتا بە ڕێگەوە بوون و ڕێگەیان گۆڕی."

لە خوای میهرەبان دەپاڕێینەوە لەوانەمان نەکا کە لە ڕێگە لادەدەن و ڕێ ون دەکەن. بەڵێ، هیچ دڵنیاییەکمان نییە. کەسیش ناتوانێت دڵنیایی ئەوە بدات بە کەس کە لە ڕێ ناترازێت و لانادات...

جڵەوی هەموو شتێك بەدەست خوایە.. بۆیە لێی دەپاڕێینەوە لە لادان و گومڕایی بمانپارێزێت و بۆ چاوتروکانێکیش چییە نەمانداتە دەست دەروونی خۆمان. هەروەها داوای لێ دەکەین ئەم ئوممەتە ڕەسەنە بێ هاوتایە سەرکەوتوو بکات لەوەی پێگەی شیاوی خۆی لەنێو گەلاندا بەدەستبهێنێتەوە!

بەڵێ، هەرکات ئەم ئوممەتە پایەی مێژوویی خۆی وەرگرتەوە، ئەوسا بەشێوەیەکی متمانە بەخشتر و لە ئاستێکی باڵاتردا دەرفەتی ئەوەمان بۆ دەڕەخسێت ڕەوشتی ئیسلامی و بەها قورئانییەکان پیادە بکەین. ئیدی ئەو دەم مرۆڤایەتی دەبینێت ئەوەی ئەم لە یوتۆپیاکاندا بەدوایدا گەڕاوە، چەندین سەدە پێشتر هاتووەتە بوون. ئەم ڕاستییە دەبینێت و سەراسیمە دادەمێنێت.

کە پەڕاوی "کۆماری ئەفلاتون" دەخوێنینەوە دەبینین چۆن ئەفلاتون پێشنیاری ئەوە دەکات فەلسەفە هەڵبستێت بە بەڕێوەبردنی وڵات. ئەوە بە لایەك، ئێمە دەزانین لە چەندین قۆناغی مێژوودا دەوڵەت بە شێوەیەکی وەها بەڕێوەبردراوە تەنانەت

خەیاڵی فەیلەسوفانیشی ناگاتێت. ئەوە سەردەمی سەرەتای ئیسلام! لە مێژووی دەوڵەتی ئیسلامدا چەندین لاپەڕەی پرشنگدار هەن. خۆ ئەگەر فریشتەکانیش لە ئاسماندا دەوڵەتێکیان پێکبهێنایە هەروا دەبوو.

بەڵام تا ئەو کاتەی ئێمە دەگەین بەو ئاستە، گەلان گوێی خۆیان دەئاخنن و گوێمان لێ ناگرن. ڕاستە ڕێژەیەکی کەمیان لە ئەنجامی نووری بەهێزی قورئان و بەرکەوتنی لەگەڵ ویژدانیان موسوڵمان دەبن، بەڵام لە لایەن ئەو گەلانەوە موسوڵمان بوونێکی دەستەجەم ڕوونادات، مەگەر ئەو کاتەی کە ئەم ئوممەتە ڕەسەنەمان پێگەی شیاوی خۆی لەنێو گەلاندا دەکاتەوە و لەبەرچاوی هەموو جیهاندا هەڵدەستێت بە جێبەجێ کردنی بنەماکانی ئیسلام..

دەگەڕێمەوە و دەڵێم: "پێغەمبەری نازدار کودەتایەکی وەها بێ وێنەی بەسەر ئەو کۆمەڵگە نەفامەدا کرد، کە تا بینەقاقایان لەناو نەریتی نەفامیدا نوقم ببوو ئەقڵەکان لە ئاستیدا دەستەپاچە دادەمێنن. ئەو کودەتایەش کودەتایەکی گشتگیر بوو هەموو بوارەکانی ژیانی لە ئامێز گرتبوو.."

لای هەمووان ئاشکرایە کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا چەندەها بلیمەت هەڵکەوتوون، هەندێکیشیان لە بەرپاکردنی هەندێك گۆڕانکاری لە چەند بوارێکی ژیاندا سەرکەوتوو بوون، بەڵام ئەو گۆڕانکارییە لە سنووری بوارەکەی خۆی نەترازاوە. لەوانەیە بلیمەتێك لە کۆمەڵناسیدا دەرکەوتبێت و نەوەکانی سەردەمی خۆیی لەو بابەتەدا گەیاندبێتە لوتکە. بەڵام دەبینی لە بواری ئابووریدا هەنگاوێك نەیبردوونەتە پێش، لە بواری پەروەردە و دەروونناسیشدا شتێکی ئەوتۆی پێشکەش نەکردوون. لە کایە ڕۆحییەکەدا ئەوە کە هەر مەپرسە! یان بۆ نموونە بلیمەتێك لە زانستی ئابووریدا هەڵدەکەوێت و سەرکەوتوو دەبێت لە بەرزکردنەوەی ئاستی ئابووری وڵاتدا بۆ ئاستێکی دیاریکراو بەڵام دەبینی هەمان ئەو بلیمەتە لە بواری کۆمەڵایەتیدا سوودێکی بۆ کۆمەڵگاکەی نییە و لە بابەتەکانی پەروەردە و چاودێریی دەروونیدا شتێکی نییە بۆ وتن. بەم شێوەیە، یەکێك لە بوارێکدا و یەکێکی تر لە بوارێکی تردا ئەسپی خۆی تاو دەدات.. بەڵام کەسیان نەیانتوانیوە

لە تەواوی یەکە و مەیدانەکانی ژیاندا بگەنە پلەی کەماڵ. تەنها حەزرەتی محەممەد نەبێت کە هەموو لایەنەکانی ژیانی لەخۆ گرتووە و هەڵی کشاندوون بۆ لوتکە و گرەنتی ئەوەی داوە کە بۆ هەتا هەتایە لەوێدا بمێنێتەوە.

بەڵێ، پێغەمبەر لوتکەیە لە ئابووریدا.. لوتکەیە لە کۆمەڵناسیدا.. لوتکەیە لە سەرکردایەتی جەنگدا.. لوتکەیە لە موحاسەبەی نەفسدا.. لوتکەیە لە بانگەوازی خەڵکدا.. لوتکەیە لە پاراستنی هاوسەنگی نێوان دونیا و قیامەتدا.. لوتکەیە لە ڕۆچوون بەناو کاکڵە و کرۆکی شتان و ڕووداوەکاندا.. لوتکەیە لە ڕۆچوون بەناو قووڵایی ئەودیوی بوونەوەراندا.. لوتکەیە لە هەموو شتێکدا.

بەڵێ، هیچ هەستێکی مرۆڤانە نییە لە سیستەمە پەروەردەییەکەی ئەودا بە جێهێڵراوی مابێتەوە. هیچ شتێکیش نییە فەرامۆش کرابێت. بە پێچەوانەوە، گرنگی داوە بە هەموویان و بەرەی پێ سەندوون و ڕێبازی گەشە و کامڵبوونی لەبەردەمدا واڵا کردوون.. بە کۆمەکی و پشتیوانی پەروەردگار لە سەرجەم بوارەکاندا کامڵترین و باشترین نموونەی مرۆڤی پێگەیاندووە.

# بەشی سێیەم

## بێ وێنەیی پێغەمبەری خوا
## لە چارەسەرکردنی
## گرفتەکاندا

## أ- تایبەتمەندییەکانی سەرکردە

مەودایەکی دیکەی فەتانەتی پێغەمبەرمان بریتییە لە ناوازەیی ئەو سەروەرە لە چارەسەرکردنی هەموو ئەو کێشە و تەگەرانەی دەهاتنە ڕێی. گرێ کوێرە و گرفتەکان هەر جۆرێك بوونایە ئەو زۆر بە ئاسانی هاوشێوەی دەرهێنانی موو لە ماست چارەسەری دەکردن. ئەمەش خۆی بۆخۆی یەکێکی ترە لەو بەڵگانەی کە شایەتی لەسەر ڕاستیی پەیامەکەی دەدەن.

کۆمەڵێك مەرجی گرنگ هەیە پێویستە لە هەموو سەرکردە و پێشەوایەکدا هەبن. ئێمە لێرەدا ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکەین:

١. نابێت هیچکام لەو پەیامانەی ڕابەر یان سەرکردە دەیانخاتە بەردەم شوێنکەوتووانی دژایەتی لەگەڵ سروشتی ژیاندا هەبێت. هەروەها دەبێت دڵنیابێت لە کارایی پەیامەکەی لە ئێستا و داهاتووشدا.

هەروەك چۆن کەسێك دەتوانێت بەوپەڕی متمانە و دڵنیاییەوە ڕووداوێك باس بکات کە بەچاوی خۆی دیویەتی و لەوە ناترسێت بەدرۆبخرێتەوە، چونکە بڕوای بە خۆی هەیە، هەر بەوجۆرە، پێویستە کەسی سەرکردەش لە گەیاندنی پەیامەکەیدا هەڵگری هەمان هەست بێت و بە هەمان ئەو دڵنیاییەوە قسە بکات. بگرە دەبێت زیاتر لەو شتانە باوەڕی پێبێت کە بە چاوی خۆی دەیانبینێت. تەنانەت بۆ سەرکەوتن بەتەنها بڕوا و متمانەی خۆی بەس نییە، بەڵکو دەبێت پەیامەکەی هیچ جۆرە دژیەك هاتنەوەیەکی لەگەڵ دەستوورەکانی ژیاندا نەبێت. واتە لە نێوەندی چەرخە خلۆکەکانی ژیاندا ڕێك وەك کرانەوە و داخرانی دەرگا نهێنییەکان پێویستە ئەو جووڵانە بە ئاڕاستەی سوودی خۆی هەڵبسەنگێنێت و لێیان نەگیرێت..

٢. سەرکردە و پێشەوا دەبێت سووربێت لەسەر بانگەوازەکەی. هەروەها پێویستە تەواوی هەوڵ و کۆششەکانی بۆ پێگەیاندنی ئینسان تەرخانبکات و پانتایی

سەرقاڵییەکانی بگرێتەوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئاستی فەرهەنگی و کلتووری خۆی هەمیشە بەرزڕابگرێت..

٣. لەسەر سەرکردە پێویستە زانیاریی تەواو لەبارەی ئەندامانی کۆمەڵەکەیەوە بزانێت. واتە دەبێت زۆر چاك بزانێت بەرپرسیارێتی چ شتێك بە چ کەسێك دەدات و چاوەڕوانییەکانی چین و لە چ ئاستێکدان و چ کارێك دەسپێرێت بە کێ. هاوکات سەرکردایەتی داخوازی ئەوەیە سەرکردە بە چەشنێك ڕەوتی بەڕێوەچوونی کارە نەخشە بۆ دارێژراوەکان ڕێکبخات، نە ئەوەی لە ئاستێکی ناوەندداپە و نە ئەوەش کە لە هەڕەتی چست و چالاکیدایە هیچکامیان وەڕس نەبن و لە ڕەوتی کار بێزارنەبن. هەروەها دەبێت سەرکردە کاروباری ئەمڕۆ لە دوێنێوە و هی بەیانیش لە ئەمڕۆوە ببینێت، تا ئەوەی بەرنامەی کاروباری ئەمڕۆ نەبێتە مایەی پەکخستنی کارەکانی سبەی. ئەگەرنا کارەکان دژە ئاڕاستە دەبنەوە و ئەمیان دەبێتە ڕێگر لە جێبەجێ کردنی ئەویتریان. بەڵێ، سەرکردەی ڕاستەقینە دەبێت لە ڕوانگەی گۆڕانکاری و پێشهاتەکانی ناو کۆمەڵگەوە هەر لە ئێستاوە پێشهاتەکانی چەندین ساڵ دواتر ببینێت. ئەگینا شتە چاوەڕوان نەکراوەکانی سبەینێ دەبنە کۆسپی بەردەم جێبەجێ کردنی کارەکانی ئەمڕۆ..

٤. پێویستە سەرکردە ساز و ئامادەبێت بۆ چارەسەرکردنی کێشە و گرفتی پەیڕەوانی. ئەو گرفتانەش لەوانەیە کێشەی تاك یان خێزانی، ئیداری یان یاسایی، ئابووری یان کۆمەڵایەتی بن. بۆیە پێویستە سەرکردە توانای بەسەر چارەسەری هەموو ئەو کێشانەدا بشکێت..

٥. سەرکردایەتی وا دەخوازێت ڕاسپاردە و فەرمانەکانی سەرکردە بە جۆرێك بن شیاوی جێبەجێکردن بن. سەرکردەی لێهاتوو هەمیشە خۆی بەدووردەگرێت لەو ڕاسپاردە خەیاڵیانەی کە لەگەڵ واقیعی زەمینەکەیدا یەکنا گرنەوە. هاوکات خۆیشی بەر لە هەمووان ڕاسپاردەکانی خۆی بە بچووکترین وردەکارییەکانییەوە دەهێنێتەجێ..

لایەنێکی دیکەی گرنگ ئەومیە ئەو دەستوور و بنەمایانەی سەرکردە کردوونیەتە ئامانجی ئەندێشە و ئاواتی هەرە باڵای ژیانی، نابێت ببنە پاشکۆی زەمەن و بە تێپەڕبوونی کات ڕەنگپەڕ و پەژموورده ببن. بەڵکو پێویستە بەردەوام پاراوی و زیندوویتی خۆیان بپارێزن. بە چەشنێك، مرۆڤی هەر سەردەمێك کاتێك ڕوویتێدەکات و دەیەوێت سوودی لێ وەربگرێت، یەکسەر چارەی هەموو گرفت و دەرمانی هەموو کێشەکانی تێدا دەستبکەوێت و هەروەك ئاوی ژیان نۆشیان بکات. تێپەڕبوونی ساڵ و سەدەکان نابێت ئاڵوگۆڕیان بەسەردابهێنێت، بگرە دەبێت لاوێتی و ڕەونەقیان زیاتربکات.

کاتێك چاوێك بەو بنەمایانەدا دەخشێنین کە بەشێکن لە مەرجەکانی سەرکردەی سەرکەوتوو بۆمان دەردەکەوێت کە سەرکەوتووترین سەرکردە لە هەموو مێژووی مرۆڤایەتیدا، خاوەن فەتانەتی هەرە مەزن، حەزرەتی محەممەدە. دیارە ئەم حوکمە سەرجەم پێغەمبەرانی تریش دەگرێتەوە. بەڵام ئەو سەروەرە ئەو کەسایەتییە هەڵبژاردە ناوازەیەیە کە هەموو ئەو خەسڵەتانەی لە باڵاترین ئاستدا نمایندە کردووە. لەمەشدا هیچ کەس پێی ناگاتەوە..

ئەم حەقیقەتەی کە ئێمە وەك ئیمان قەبووڵمان کردووە، وا ئەمڕۆ خۆرئاواییەکان تازە بەتازە لەڕێی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و ئەقڵی ئەلیکترۆنییەوە دەرکی پێدەکەن، -خۆشحاڵ دەبم گەر دۆزینەوەکانیان ئەوان و هاوشێوەکانیشیان قەناعەت پێبکات-.

بناغەی ئەم بۆچوونەش کە بەلای هەندێکەوە شتێکی نامۆ و سەمەرەیە، ئەمەی خوارەوەیە:

کۆمەڵە کەسایەتییەکی مەزنی مێژوو دیاریکران. ئەوجا هەموو ئەو تایبەتمەندی و خەسڵەتانە دەستنیشانکران کە بوونەتە هۆی مەزنییان و لە چواچێوەی بەرنامەیەکی کۆمپیوتەریدا زانیارییەکان ڕێکخران. مەبەست لەم هەوڵەش دەستنیشانکردنی مەزنترین کەسایەتی بوو لە ناویاندا بە گوێرەی پێوەرەکانی مەزنێتی. لەپاش چەندین هەوڵ و تاقیکاری یەك لەدوای یەك،

هەموو شاشەی کۆمپیوتەرەکان یەکەمیی کەسێکیان پیشاندا، ئەو کەسەش مایەی شانازی مرۆڤایەتی، حەزرەتی محەممەد بوو.

گومانی تێدا نییە ئەویش مرۆڤ بوو بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەو وەك مرۆڤ نەژیا. ئەو گەورەترین سەرکردە و گەورەترین پێشەوا و گەورەترین پێشڕەو بوو.. وەك خۆی لەدایك بوو هەر وەك خۆیشی ژیا.

ئێستاش با بە چەند نموونەیەك بەرجەستەی ئەو لایەنە تیۆرییانە بکەین کە لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد:

پێغەمبەرمان پەیامی وەهای بۆ مرۆڤایەتی هێناوە هیچکام لەو پەیامانە پێچەوانە یاخود دژی ژیان نەبوون. هەروەها هەرچی قسەیەکی کردووە بە ئەوپەڕی بڕوا و متمانەوە کردوویەتی و هیچ کات تووشی گومان و دڵەڕاوکێ نەبووە.

لەنێوان ئەو فەرمایشتانەدا کە فەرمووونی باس و ڕاڤەی چەندین مەسەلەی کردووە؛ هەر لە عەرشەوە تا فەرش.. لە بەهەشتەوە بۆ دۆزەخ.. لە یەکەم ئینسانەوە تاوەکو هەڵسانی قیامەت و چەندین بابەتی تر. بەتایبەت ئەو ڕووداوانەی کە تایبەتن بە ئوممەتەکەی، یەکە بەیەکە بژاردوونی و جاری واش هەیە ناوی هێناون. بگرە بە ڕوونییەکی وەها لێیان دواوە هەر دەڵێیت لەسەر شاشەیەك تەماشای کردوون و بەو شێوەیە گێڕاونیەتەوە. بەڵێ، ئەو هەموو کات دڵنیابوو لەو قسانەی دەیکرد. ئاخر خوای گەورە کیتابی موبین و ئیمامی موبینی لەبەرچاو واڵاکردبوو و بڕێکی زۆری لە تابلۆ قەدەریەکان پیشاندابوو.. واتە شتەکەی دەبینی ئەوجا باسی دەکرد. بەم پێیە، گومانی تێدا نییە پەیامگەلێك زاتێکی وەها بیهێنێت، هەمیشە تەمەن دەبوو.

نەجیب فازڵی وێژەوان زۆر خۆش دەڵێت:

سبەی هی ئێمەیە. بێگومان هی ئێمەیە
خۆر هەڵبێت یان ئاوابێت ئەبەد هەر بۆ ئێمەیە

وشەکانی شاعیر گوزارشت لە بڕوا و متمانەی مرۆڤێکی باوەڕدار دەکەن بە بنەما و بیروباوەڕەکەی. خۆ ئەگەر بێت و ئەو وتەیەی سەرەوە لە ڕوانگەی بانگەوازەکەی پێغەمبەری خواوە بخوێنینەوە، ئەو دەم دەبینین چەندین مەودای قووڵ وەردەگرن. خۆر هەڵدێت و ئاوادەبێت. ئاساییە ساڵان و سەدەکانیش یەک لەدوای یەک دێن و گوزەر دەکەن. بەڵام ئەو پەیامەی پێغەمبەر هێناویەتی هەتا هەتایە بە نەمری دەمێنێتەوە!.

## ١. خاوەن متمانە و دامەزراو بوو.

ئیبن ئیسحاق دەگێڕێتەوە: قورەیشییەکان ڕۆشتن بۆ لای ئەبوتالیب تاکو دانوستان لەگەڵ پێغەمبەردا بکەن. ئەبوتالیبیش برازەکەی بانگکرد و پێیوت: "هؤُلَاءِ أَشْرَافُ قَوْمِكَ قَدِ اجْتَمَعُوا إِلَيْكَ لِيَعْطُوكَ وَلِيَأْخُذُوا مِنْكَ" "ئەوانە سەردار و گەورەکانی هۆزەکەتن، بەکۆمەڵ هاتوون بۆ لات تاکو قسەت لێ وەربگرن و ئەوانیش قسەی خۆیان هەبێت."

پێغەمبەری خوا لە ئەوپەڕی متمانە و دڵنیاییدا بوو.. وە زۆر باش دەیزانی کە چی دەوێت. بۆیە فەرمووی: "من تەنها یەک وشەم لە ئێوە دەوێت. بەو وشەیە حوکمی هەموو عەرەب و عەجەم دەکەن."

شاندەکەی قورەیش دڵخۆش بوون، بە پەرۆشییەوە وتیان: "بەفیدات بین ئەو وشەیە چییە؟ پێغەمبەری خواش لە نێوەندی هەمان جددییەت و ویقاردا فەرمووی: "بڵێن: (لا إله إلا الله) پێی دەبنە خاوەنی عەرەب و عەجەم."[١]

هەرواش بوو...

بەڵێ، بەڕاستی پێغەمبەری خوا بەوپەڕی متمانە و باوەڕەوە کۆمەڵە پەیامێکی وەهای گەیاند بە مرۆڤایەتی، کە هیچ سازشی لەسەر نەدەکراو دەستلەملانی ژیان

١ـ ابن هشام، السيرة النبوية ٢/٢٦٥.

بوو. لەگەڵ گەیاندنی پەیامەکەشیدا زۆر دڵنیا بوو لە ئەمڕۆ و سبەینێشی.. بۆیە دەیوت: "سبەی دەبنە فەرمانڕەوای هەموو عەرەب. ماڵە پیرۆزەکەش کە کەعبەیە، دەبێتە تەوافگەی سەرجەمی مرۆڤایەتی." لەکاتی خۆشیدا هەموو فەرمایشتەکانی وەك خۆیان هاتنەدی.

نەك تەنها کەعبە، بەڵکو ئەوەتا ئەمڕۆ گۆڕە نوورانییەکەی خۆشی -وەك گوزارشت لە ڕێز و خۆشەویستی- بووەتە سەردانگەی قودسییەکان. هەموو ساڵێك ملیۆنەها خەڵك وەك پەپولە بەدەوری ئەو پرشنگی نوورەدا پەرواز دەکەن. وەختێکیش پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەمانەی دەفەرموو هیچ نیشانەیەك یان هێمایەك لە ئاسۆدا دیار نەبوو. بۆیە زۆر پێویستە سەرکردە متمانەی تەواوی بە قسەی خۆی هەبێت، تاکو دڵنیایی و متمانە لە کەسانی تریشدا دروست بکات..

ئیمام حاکم لە "المستدرك"دا ڕووداوی عەدی کوڕی حاتەم دەگێڕێتەوە کە پێشتریش باسم کرد، بەڵام بەهۆی پەیوەندی بە بابەتەکەمانەوە داوا لە خوێنەری ئازیز دەکەم ڕێم بدات لێرەشدا باسیبکەمەوە: عەدی، کوڕی حاتەمی تائی بوو کە لە مێژووی عەرەبدا بە جوامێری و سەخاوەت بەناوبانگە.

عەدی ڕووداوێکی لەم جۆرەمان بۆ باس دەکات: لە خزمەتی حەزرەتدا دانیشتبووم، پیاوێك هاتە ژوورەوە و دەستیکرد بە سکاڵا لەدەست چەتە و ڕێگر، کە گوایە ڕێ بە کاروانیەکانیان دەگرن و دەست بەسەر سامانەکەیاندا دەگرن و چەتەییان کردووەتە پیشە. پاشان یەکێکی دیکە خۆی کرد بە ژووردا و سکاڵای ئەوەی کرد کە بێ بارانی و وشکەساڵی ڕووی تێ کردوون و خەریکە خەڵکی لە برسا لەناوبچن..

دوای ئەوەی پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) گوێبیستی سکاڵای هەردوو کابرا بوو ئەوجا ڕووی پیرۆزی کردە من و فەرمووی:

"هَلْ رَأَيْتَ الْحِيرَةَ؟ قُلْتُ: لَمْ أَرَهَا وَقَدْ عَرَفْتُ مَكَانَهَا"

"ئەی عەدی، ئەرێ تۆ "حیرە"ت دیوە؟" وتم: "نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا نەمدیوە، بەڵام دەزانم لە کوێیە." پێغەمبەری خوا فەرمووی:

"فَلَيُوشِكَنَّ أَنَّ الظَّعِينَةَ تَرْحَلُ مِنَ الْحِيرَةِ بِغَيْرِ جِوَارٍ حَتَّى تَطُوفَ بِالْبَيْتِ"

"ئەگەر تەمەن بوارت بدات ئەوندەی نەماوە وای لێ بێت کە ژن بە تەنها خۆی بە سواری وشترەکەیەوە لە حیرەوە بێت و تەوافی کەعبە بکات."

منیش لە دڵی خۆمدا وتم: "ئاخر هەتا چەتەکانی طەی هەبن شتی وەها چۆن ڕوو دەدات؟" بەڵام پێغەمبەر لەسەر فەرمایشتەکەی بەردەوام بوو:

"وَلَيُفْتَحَنَّ عَلَيْنَا كُنُوزُ كِسْرَى، قُلْتُ: كِسْرَى بْنُ هُرْمُزَ ؟
قَالَ: كِسْرَى بْنُ هُرْمُزَ"

"ئەی عەدی، ئەگەر تەمەن بوارت بدات دیسان دەبینیت کە ڕۆژێك دێت هەرچی گەنجینەی کیسرا هەیە دەکەونە دەستی ئوممەتەکەم." منیش بەسەرسوڕمانەوە وتم: "مەبەستت کیسرای کوڕی هورمزە؟!" فەرمووی: "بەڵێ، کیسرای کوڕی هورمز." عەدی بەمجۆرە کۆتایی بە قسەکانی دێنێت: "سوێند بە خوا ئەو فەرمایشتانەی کە ئەو ڕۆژە پێغەمبەر فەرمووني، هەر هەموویانم بە چاوی خۆم بینی و شاهیدییان لەسەردەدەم. شتێکیشی سەبارەت بە ئاینده فەرموو ئومێد دەکەم و بڕوایشم وەهایە کە ئەوەش دەبیم."[١]

بەمجۆرە پێغەمبەری خوا بە متمانە و باوەڕی تەواوەوە پەیامەکەی دەگەیاندە دەوروبەرەکەی و بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش گومان و دوودڵی بەرامبەر فەرمایشتەکانی نەبوو. کە کاتی خۆشی دەهات، بە پشتیوانی و چاودێریی پەروەردگار قسەکانی وەك خۆی دەهاتنە دی..

١. البخاري، مناقب ٢٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢٥٧/٤؛ حاكم، المستدرك ٥٦٤/٤.

## ٢. خواستی دەستڕۆیشتووەکان بۆ جیاکاری.

هەژارەکان یەکەمین توێژ بوون کە وەڵامی پێغەمبەریان دایەوە و بەدەم بانگەوازەکەیەوە چوون. زۆربەشیان لە چینی لاوان بوون. تەمەندارە سواوەکانیش لە کوفردا بەردەوام ملەجیڕییان دەکرد. ئەگەرچی بە دەرکەوتنی رازی:

﴿ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ﴾ (النصر: ٢)

"پۆل پۆل دێنە ئایینی پەروەردگارەوە."

ئەوانیش هەستیان بە پێویستی باوەڕهێنان کرد و باوەڕیشیان هێنا، بەڵام ئەوە ڕاستییەکە کە لە بەرەبەیانی ئیسلامدا تەنها و تەنها گەنجە خوێنگەرمەکان لە دەوری سەرومەردا بوون. بە تایبەت گەنجە هەژارەکان!..

هەندێك لە بتپەرستە خۆ بەزلزانەکانی مەککە ئەم ڕەوشەیان هیچ بەدڵ نەبوو. هەر دەهاتن بۆ لای پێغەمبەر (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) و داوایان لێ دەکرد تا ڕۆژێکیان بۆ تەرخان بکات تیایدا جگە لە خۆیان کەسی تر توخنیان نەکەوێت. واتە حەزیان لەوە نەبوو هەژارەکانی وەك بیلال و عەممار و یاسر و خەبباب ئامادەی کۆڕەکەیان ببن. گوایە ئەوان سەرانی هۆزن، ئیدی چۆن دەکرا لەگەڵ تاقمی بەردەست و بێ نەوادا دابنیشن! ئەمانە لەناو ئەو کۆمەڵگەیەدا لەگەڵ ئەو جۆرە ڕەفتارەدا ڕاهاتبوون، بۆیە بەلایانەوە دواکارییەکی ئاسایی و سروشتی بوو. بەڵام مەسەلەکە هەرگیز بەوجۆرە نەبوو کە ئەوان بیریان لێ دەکردەوە. هەرچەندە ئەوان چاوەڕوانی بەدەمەوە هاتنی پێشنیارەکەیان دەکرد، بەڵام خواوەند پێغەمبەرەکەی لەوەها کارێك وریا کردبووەوە:[1]

﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾ (الأنعام: ٥٢)

١. إبن ماجه، زهد ٧.

"(ئەی محمد، ئەی ئیماندار) نەکەیت ئەوانە دەربکەیت (لە مزگەوت و کۆڕی خواناسین) کە لە بەیانیان و ئێواراندا لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە و (دەیپەرستن) مەبەستیشیان تەنها ڕەزامەندی ئەوە، حساب و لێپرسینەوەی هیچ شتێکی ئەوان لەسەر تۆ نییە و حساب و لێپرسینەوەی هیچ شتێکی تۆیش لەسەر ئەوان نییە، دەرکردنی تۆ بۆ ئەو موسوڵمانانە دەبێتە هۆی ئەوەی تۆ بچیتە ڕیزی ستەمکارانەوە."

تۆ مەردی ئەرك و کاروباره گەورەکانی، هەرگیز خۆت خەریك مەکە بە بابەتگەلێکی بچووکی وەك ئەوەی بە ئومێدی ڕێنموونی دەوڵەمەندەکان ئیماندارە هەژارەکان لە لای خۆت وەدەرنێی. چونکە ئەوە ستەمە.. تۆیش زۆر دووری لە ستەمەوە. دیارە ئەوە گەورەترین ستەمە هەژاران دەربکەیت بەس لەبەرئەوەی دڵی دەوڵەمەندان خۆشنوود بێت.. خواش هەر لە سەرەتاوە پێغەمبەرەکەی خۆی، کە سونبولی دادگەری بوو لە ئەنجامدانی وەها کارێك پاراست.

دەبینین ئەم باسە گرنگە لە سورەتی "الکهف" یشدا جارێکی تر دەخرێتەوە ژێر باس و لێوردبوونەوە:

﴿ وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴾

(الکهف: ٢٨)

"ئارام بگرە و خۆت ڕابگرە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خواپەرستی دەکەن و یادی پەروەردگاریان ویردی سەرزاریانە لە بەرەبەیان و دەمەو ئێواراندا، مەبەستیانە و دەیانەوێت کە ئەو زاتە لە خۆیان ڕازی بکەن، ڕوو لەوان وەرمەگێڕە و (ڕوو مەکە دنیاپەرستان و دەوڵەمەندان) لەکاتێکدا تۆ زینەت و ڕازاوەیی ژیانی دنیات بوێت و بەگوێی ئەو جۆرە کەسە مەکە کە دڵیمان

غافڵ کردووه له یادی خۆمان (بەهۆی دنیاپەرستیەوە) شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتووە و هەرچی کاروباری هەیە بێ سەرو بنە و لە سنوور دەرچووە.»

قورئان پێی دەوت:

شەو و ڕۆژ لەگەڵ ئەوانەدا بە کە لە بانگەواز و هزر و هەستەکانیاندا تەنها "الله" هەیە. چاوت مەبڕە کەسانی تر. لەگەڵ ئەوان گوزەران بکە. چونکە ڕەحمەتی خوا لەگەڵ ئەواندایە. لەوانەیە خوا بە فەزڵی ئەوانەوە ڕەحم بە خەڵکی بکات. بە فەزڵی عەممار.. یاسر.. بیلال.. عەلی.. خەبباب یان ئیبن مەسعود. ئەمانە جێی ڕوانینی میهری خواییین. لەوانەشە بەهۆی ئەوانەوە دەرد و بەڵا هەڵبگیرێت. دەسا تۆش لەگەڵیان بە و هاوەڵییان بکە!

قورئانی پیرۆز لەکاتێکدا ئەوەی دەوت کە تەنها چوار پێنج کەس لە هەژارەکان بەدەوری پێغەمبەرەوە بوون. وێڕای ئەوەش کەچی گەشبین و دڵنیابوو سەبارەت بە ئاینده.. بڕوای وابوو ڕۆژێك دێت زۆربەی ئەو یاخیبوو و سروشت فیرعەونانە ڕووبکەنە ئیسلام و قورئان و بیکەن بە تاجی سەریان. کەوابوو لەپای چی ئەو باوەڕداره هەژارانە لەپێناوی ئەواندا دەربکات کە لە داهاتوودا خۆیان دەهاتن!

یاخود چۆن پێغەمبەر ئەوانی لە خۆی دووردەخستەوە لەکاتێکدا هەر خۆی لەبارەیانەوە فەرموویەتی: "بەهەشت تامەزرۆی ئەم سێ کەسەیە: عەلی و عەممار و سەلمان..."[1]

بەڵێ، لەکاتێکدا هەمووان تامەزرۆی بەهەشتن، کەچی بەهەشت تامەزرۆیە بۆ ئەو سێ هاوەڵە بەڕێزە، هاوشێوەی تامەزرۆیی و شەیدایی عاشقێك بۆ یارەکەی و.. چاو بۆ جوانی و.. ویژدان بۆ ڕوئیەت و.. دڵیش بۆ دیداری پەروەردگار...

سەرداری پێغەمبەران هەر لە یەکەم هەنگاوی ڕێوە زۆر چاك دەیزانی کە هاوەڵە پێشینەکانی، واتە ئەو گەنجە هەژار و نەدارانەی لەدەوری بوون، ئەو دەستەیەن کە لەسەر ئاستی جیهان گۆڕانکاری دەهێننە ئاراوە. هەموو هەنگاوێکیشی بە

١. الترمزي، مناقب ٣٣.

گوڕەی ئەمە دەنا. هێندەی تۆزقاڵێکیش گومانی نەبوو لەوەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان هەموو دونیا لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا تەسلیمی ئەو حەقیقەتانە دەبوون کە هێنابوونی.. دڵنیابوو لە بەڵێنی پەروەردگاری، بۆیە لەوپەڕی ئاسوودەی و متمانەدا بوو.

بەمجۆرە پێغەمبەری خوا داوای موشریکەکانی دایە دواوە و گوێی پێنەدان. وەك بیلبیلەی چاویشی گرنگی دا بە هاوەڵە لاواز و هەژارەکانی دەوری و بە ڕێز و شکۆوە لەلای خۆی هێشتنیەوە.

## ٣. فاکتەری ئینسان نابێت فەرامۆش بکرێت

پێغەمبەری سەروەرمان بەدرێژایی ژیانی پیرۆزی توخمی مرۆڤی فەرامۆش نەکردووە. تەنانەت لەو وەختەشدا کە هاوەڵانی دەنارد بۆ بەرەکانی جەنگ، ئەو بابەتانەی پەیوەندییان هەبوو بە ئینسان و زانست و هزرەوە هەمیشە لەبەرچاو بوون و جێی بایەخ بوون. ئەمەش لەبەرئەوەی نەبادا کۆمەڵگە لە ڕووی ژیانی فکری و زانستییەوە دووچاری هەژاری ببێت. خۆ دەبوو هەرواش بوایە، ئەوەتا قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾ (التوبة: ١٢٢)

"جا ڕەوا نییە هەرچی ئیمانداران هەیە بەجارێك بچن بۆ غەزا (یان بۆ هەرکارێکی پێویست)، دەی بۆچی لە هەر هۆز و دەستەیەك، کەسانێك نەچوون بۆ خوێندن تا شارەزابن، لە ئایین تێبگەن و فێر ببن و کاتێك کە گەڕانەوە بۆ لایان قەومەکەشیان تێبگەیەنن و فێریان بکەن، بۆ ئەوەی ئەوان هوشیار ببنەوە و خۆیان بپارێزن لە گوناهـ و خوا لە خۆ نەڕەنجێنن."

بەڵێ، تەنانەت ئەو کاتەش کە ئیمانداران جیهاد دەکەن، پێویستە کۆمەڵێکیان بمێننەوە و شارەزابین لە ئایینەکەیان. بۆ ئەوەی کاتێك ئەوانی تر گەڕانەوە ئەوانیش فێر بکەن. بگرە لەو بارودۆخەشدا کە جیهاد فەرزی عەینە، هێشتا هەر دەبێت دەروازەی مەڵبەند و ناوەندە زانستی و کلتوورییەکانتان لەسەر پشت و کراوەبن. خۆ ئەگەر دوژمن لە هەموو لایەکەوە هێرشی کردە سەرتان و ئێوەش بەناچاری دەرگای ناوەندە مەعریفییەکانتان داخست و ڕووتان کردە بەرەکانی جەنگ، ئەوسا وڵات لە بواری زانست و ڕووناکبیریدا زیانێکی زۆری بەردەکەوێت، ئەگەرچی سەرکەوتنیش بەدەستبهێنن. هەر بۆیە ئیسلام ئامۆژگاریمان دەکات کە تەنانەت لەو بارودۆخە نائاسایی و سەختانەشدا کۆمەڵێك لە خەڵك گلبدرێنەوە و نەڕۆن بۆ بەرەکانی جەنگ، تاکو یەکلاببنەوە بۆ خزمەتی زانست و ڕووناکبیری..

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە سەروەرمان لە سەختترین هەلومەرجیشدا ئاوڕدانەوەی لە زانستخوازی و بزاڤی ڕۆشنگەری فەرامۆش نەکردووە.. ئەوانەی کە نەدەڕۆیشتن بۆ بەرەکانی جەنگ، خۆیان تەرخاندەکرد بۆ زانست و زانیاری. وەك پێشتریش وتمان، ژمارەی ئەوانەی لە سەرەتای بانگەوازی ئیسلامدا نووسین و خوێندنەوەیان دەزانی بە پەنجەکانی دەست دەژمێرران. کەچی پاش بیست ساڵ کەسێك نەما خوێندەواری نەبێت. دیارە وەها ئەنجامێکیش ئاکامی هەوڵ و کۆششی سەروەری پێغەمبەر بووە لەو مەیدانەدا..

بەڵێ، پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) هیچ کات سستی نەنواندووە لە برەودان بە فاکتەری ئینسان و دەیزانی کە بناغە و بنچینەی گەلێکی تەندروست پێگەیاندنی تاکی تەندروستە بە هەموو لایەنەکانییەوە.. گرنگی داوە بە فێرکاری و فەرمانیشی کردووە کە گرنگی پێبدرێت.. بابەتە تیۆرییەکانی خستووەتە قاڵبی ئەزموونی کردارییەوە و بە وێنەی مامۆستایەك قوتابی پێگەیاندووە.. وە لە دونیایەکی مردوودا و لەنێو کەسانێکی بەناو زیندوودا ژینگەیەکی زانست دۆست و ئیمانداری دروستکرد.

لەدوای بناغەداڕێژ و تەلارسازی یەکەمیش، ئیتر کۆمەڵگە خۆی لەناو خۆیدا

کارگێڕ و بەڕێوبەرەکانی بەرهەمدەهێنێت. ئەمەش بۆخۆی حاڵەتێکە نابێت لەگەڵ ئەوەی پێشتردا تێکەڵ بکرێت..

بەڵێ، کۆمەڵگەیەکی کراوە بەڕووی زانست و فیکر و هونەردا لە لایەن کەسانێکی وەك خۆیەوە بەڕێوەدەبرێت، وە ئەو کەسانە هەمیشە لە حوکمی کاکڵە و سەرتوێژی ئەو کۆمەڵگەیەدان. هەروەك چۆن سەرتوێژی شیر هەر شیرە، بەوجۆرە، ئەگەر لە بنەوە زانست و فیکر و هونەر هەڵبقوڵێت، بەدڵنیاییەوە سەرتوێژیش هەر شتێك دەبێت لەوانە. سەردارمان لەڕێی چەند وشەیەکی پوخت و پڕماناوە ئاماژە بۆ ئەم ڕاستییە دەکات و دەفەرموێت: کما تکونوا یولی علیکم. "ئێوە خۆتان چۆن بن ئاوەها فەرمانڕەوایی دەکرێن."[1]

## ٤. وڵات بە تاکە پێگەیشتووەکانییەوە ئاوەدانە

لە قورئانی پیرۆزدا چەندین ئایەت هەن فەرمان دەدەن بە گرنگیدان بە ڕەگەزی مرۆڤ و هانی مرۆڤ دەدەن لەو ڕووەوە. بە توێژینەوەی سەرجەم ئەو ئایەتانەش ئەو بایەخە ڕۆشندەبێتەوە کە ئایینی ئیسلام بە مرۆڤی دەدات. جا لەبەرئەوەی نامانەوێت لێرەدا بچینە درێژەی ئەو باسەوە، بۆیە بە مەبەستی دەسخستنی بیرۆکەیەك تەنها دەچینە خزمەت یەك دوو ئایەت تا بیرۆکەیەکی سەرەتاییمان سەبارەت بە بابەتەکە بدەنێ:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ
وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾

(آل عمران: ١٠٤)

"پێویستە لە ئێوە ئوممەتێك پێکبێت، یاخود با هەمووتان ئوممەتێك بن

---

١. دیلمي، المسند ٣/٣٠٥.

که بانگەواز بکەن بۆ خێر و چاکە، فەرمان بدەن بە هەموو کارێکی باو و دروست، قەدەغەی هەموو نادروستییەك بکەن، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن."

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾

(آل عمران: ١١٠)

"(بەڕاستی) ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە (بۆ سوودی) خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بە چاکە دەدەن و قەدەغەی خراپە دەکەن و باوەڕی دامەزراوتان بە خوا هەیە."

ئەم ئایەتانە و هاوشێوەکانیان لە گۆشەنیگای گرنگیدانی ئیسلام بە ئینسان و زانستەوە تابڵێی مانادارن..

ئیسلام بە باشترین شێوە و هاوسەنگترین تەرز مامەڵە لەتەك دڵ و ڕۆح و هەست و هزر و لایەنە ناسکەکانی ئینساندا دەکات و بەرەو ئەو مەبەستە ئاڕاستەیان دەکات کە لەپێناویدا دروستکراون. واتە نە وەلانان، وە نە ناهاوسەنگی و بێ پێودانگی.. بەڵکو کاراکردنی هەموویان و تەماشاکردنی ئەودیو پەردەی بوونەوەران.. پێغەمبەری خواش بەدرێژایی ژیانی موبارەکی ئەم لایەنانەی فەرامۆش نەکردووە.. لەڕاستیدا ئەمە بۆ کەسایەتی ڕابەر و پێشەوا لەوپەڕی گرنگیدایە. ناهاوسەنگی و لار و خواری لە ئارادا نین، بەڵکو بەو هەموو هەست و نەستانەوە ڕوودەکەنە بینینی ئەو دیوی پەردەکانی بوون، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) ئەم باسەی بەدرێژایی ژیانی پیرۆزی فەرامۆش نەکردووە، ئەمەش سەبارەت بە ڕابەر خاڵێکی زۆر گرنگە..

چەندەها پێشەوا و ڕابەری وا هەبوون لە سەروبەندی چاوەڕوانی سەرکەوتندا تووشی نوشوستی هاتوون، چونکە نەیانتوانیوە سوود لە وزەی تاکەکانی بەردەستیان و توانا مرۆییەکانیان وەربگرن.. ڕاستر بڵێم، لە دەروازەکانی سەرکەوتندا نەیانتوانیوە گەردنی خۆیان لە تەوقی شکست قوتار بکەن..

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژەش بەوە بدەین کە ئەوانەی سایکۆلۆژیای کۆمەڵ دەقۆزنەوە و خەڵکی دەرژێننە سەر شەقامەکان، سوود لە وروژاندنی هەستەکان وەردەگرن. بەڵام ئەمە لەو کارانەدا کە داخوازی بەردەوامین هیچ دادیان نادات.

ئاشکرایە پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هەرگیز بیرینەکردووەتەوە لەوەی تەنها بە وروژاندنی هەست و عاتیفە خەڵکی بخاتە دوای خۆی. چونکە ئەوانەی بەو عاتیفەیە کۆدەبنەوە، لەژێر کاریگەریی هەست و عاتیفەیەکی تردا بڵاوەی لێ دەکەن و بە تاقی تەنیا جێیدەهێڵن. دەی ئەوەتا هاوەڵانی پێغەمبەر تەنانەت لە سەختترین و دژوارترین ساتەوەخت و گرفتیشدا لێی دوورنەکەوتونەتەوە و دەستبەرداری نەبوون. نەك هەر دەستبەرداری نەبوون، بگرە بەگیان و ڕۆحیان فیدای دەبوون و شەهیدبوونیان لەپێناو ئەو و بانگەوازەکەیدا بە قەرزی گیان و ئاواتی ژیانیان دەزانی. بەکارهێنانی تاکە تاکەی هەستەکانی تریش بە هەمان شێوەیە..

با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان: بەڵێ، ئەگەر وڵاتێك ئاوەدان بێت ئەوا بە مرۆڤەکانیەوە ئاوەدانە، پێغەمبەری خواش هەر ئەوەی کرد. ئەو کەسانەی دەیناردن بۆ وڵاتە جۆراوجۆرەکان، ئەوپەڕی شارەزایی و داناییان دەنواند لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا و لە کردنەوەی قوتابخانە و ناوەندەکانی زانستدا تووشی هیچ جۆرە شکستێك نەدەهاتن. ئەمەش ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەخات کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) شوێنکەوتەکانی زۆر بەباشی پەروەردە کردووە و بۆ کارە سەختەکان سازی کردوون، لەسەرووی هەموو شتێکیشەوە بایەخی یەکەمی بە مرۆڤ داوە...

## ب- برەودان بە تواناکان

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) زۆر سەرکەوتووانە شوێنکەوتووانی لە جێگەی شیاوی خۆیاندا داناوە. هەر کەسێکی بۆ هەر کارێك دیاریکردبێت،

بەدڵنیاییەوە ئەو کەسە گونجاوترین بووە لەناویاندا بۆ ئەو کارە. سەرجەم ڕێکارەکانیشی شایەتن لەسەر ئەمە. بە ڕادەیەك کە ئەگەر هیچ بەڵگەیەکی تر نەبوایە لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی، ئەوا بەدیکردنی لێوەشاوەیی و توانای تاکەکان و بەکارهێنانی هەریەکێك لەوان لە جێگەی دروست و شیاودا و سپاردنی ئەرکی گونجاو و لەبار بە هەر یەکێکیان تاکو باشترین سوود لە وزە و تواناکانی وەربگرێت و هەڵەنەکردنی لەو ئەرکەدا، واتە بەردەوامبوونی لە بەکارهێنانی کەسەکان لەو فەرمانبەرییەدا کە پێی سپاردبوون هەتا کۆتایی تەمەنیان -بەدەر لەو حاڵەتانەی کە هەندێکیان بەشێوەی کاتی بەکاردەهێنا بۆ خاترانەی دڵ و ڕەچاوی حاڵەتی دەروونیان- ئەمەش بۆخۆی یەکێکە لە گەورەترین بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتیەکەی کە وامان لێ دەکات بڵێین: "مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ صَادِقُ الْوَعْدِ الْأَمِينُ."

"بەڕاستی قۆناغی سەرەتای ئیسلام ئاوێزان بوو بە ئازار و مەینەت و ڕۆژانێکی گەلێك سەخت و دژوار بوو. بە پێنج شەش ساڵ ئەوجا ژمارەی موسوڵمانان گەیشتە چل کەس. بێ ئەوەی سەلامەتی و ژیانت بخەیتە چنگتەوە و مەرگ لەبەرچاو بگریت، مەحاڵ بوو باسی ئیسلام بۆ یەکێك بکەیت. تەنانەت کەسێکی وەك حەزرەتی ئەبوبەکر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) کە لەناو مەککەدا کەسایەتییەکی بەڕێز و دیار بووە، چەندین جار کەوتووەتە بەر شاڵاوی قین و لەژێر لێداندا لەهۆش خۆی چووە."[1]

هەروەها عومەری کوڕی خەتتاب، ئەو پیاوە بەهێزەی کە وشتری دەدا بەزەویدا، چەندین جار لێی دراوە و خراوەتە ژێر پێ.[2]

جا ئەگەر زۆرداری و ستەم لەگەڵ ئەو کەسایەتییە ناسراوەنەدا گەیشتبێتە ئەو ئاستە، ئیتر دەبێت حاڵی کەسانی تر چۆن بووبێت، ئەمە جێدەهێڵم بۆ ئێوە...

ئا لەو ڕەوشە تاریك و پڕ جەور و ستەمەدا پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)

---

١. إبن كثير، البداية و النهاية ٢٩/٣-٣٠.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ١٩٣/٢؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٨٢/٣-٨٣..

لەگەڵ هەر یەکێکیاندا بە جۆرێك مامەڵەی دەکرد. بۆنموونە فەرمانی نەدەدا بە حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر کۆچ بکەن بۆ حەبەشە. هەروەها کەسانێکی وەك عەلی و زوبەیریش لەبەر کەمی تەمەنیان نەنێردران. چونکە ئەم جۆرە کەسانە لەوانە بوون کە دەیانتوانی بەرگەی ڕووداوەکانی مەککە بگرن.

حەزرەتی عوسمانیش پێکهاتەیەکی ناسك و نەرمونیانی هەبوو. بۆیە زۆر زەحمەت بوو بەرگەی ئەو دۆخە سەختەی مەککە بگرێت. هەروا ئەو باشترین کەس بوو کە دەیتوانی لە حەبەشەدا موسوڵمانەکان بپارێزێت. بۆیە ئەو ئەرکەی سپارد بەو و ناردی بۆ حەبەشە.[1]

ئێستاش با چەند نموونەیەك لە هاوەڵانی بەڕێز بهێنینەوە:

## ١. ئەبو زەرری غیفاری

ئەبو زەرری غیفاری هات بۆ مەککە و موسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند.. ئەم هاوەڵە بەڕێزە هەستێکی بلێسەدار و بەتینی هەبوو بۆیە مانەوەی لە مەککەدا گونجاو نەبوو. چونکە دەبووە مایەی زیان گەیاندن بە خۆی و خەڵکانی تریش. لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا فەرمانی پێدا بگەڕێتەوە بۆ ناو هۆزەکەی و لەوێ هەڵبستێت بە ئەرکی ئیرشاد و بانگەواز.. ئەوەبوو پێی وت: "بگەڕێوە بۆلای هۆزەکەت و ئیسلامیان پێ ڕابگەیەنە تا ئەوکاتەی فەرمانی منت بۆ دێت."[2] ئەویش گەڕایەوە بۆ ناو هۆزەکەی و تا دوای ئازادکردنی خەیبەر نەهاتەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر.

ئەبو زەرر کەسێکی خواناس و دنیانەویست بوو.[3] بەجۆرێك داکۆکی لە

١. إبن هشام، السيرة النبوية ١٦٤/٢؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٦٦/٣.

٢. البخاري، مناقب ٦؛ مسلم، فظائل الصحاب، ١٣٢-١٣٣.

٣. البخاري، مناقب ٦؛ مسلم، فظائل الصحاب، ١٣٢-١٣٣؛ إبن حجر، الإصابة ١٢٧/٧.

دادپەروەری کۆمەڵایەتی دەکرد،[1] کۆمەڵناسە هاوچەرخەکان سەراسیمە دەمێنن لە بەرامبەریدا. تەنانەت لە دیدی هەندێك نووسەری سۆسیالیستەوە یەکەم کەس بووە کە پێشنیاری بیری سۆسیالیستی کردووە. -با لێیان گەڕێین ئەو بیرەی خۆیان پیرۆزی خۆیان بێت!- واتە ئەبو زەرر ئەو قارەمانەیە کە بۆ یەکەمجار بابەتی (هەژاری و چۆنیەتی قەڵاچۆکردنی) دەوروژێنێت. هەروەها یەکێکیشە لەو سێ کەسەی بەهەشت تامەزرۆیانە.[2]

کەچی وێڕای هەموو ئەمانە ڕۆژێکیان دێتە خزمەت پێغەمبەری خوا و دەڵێت: ''ئەی پێغەمبەری خوا منیش بکە بە کاربەدەست!'' واتە سەرکردایەتی سوپایەکم پێ بسپێرە، یاخود بمکە بە والی ناوچەیەك. پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەستی کێشا بە شانیدا و فەرمووی: ''ئەبو زەرر! تۆ لاوازیت، کاربەدەستییش سپاردەیە لە گەردندا و لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە مایەی پەشیمانی و شەرمەزاری. جگە لەوانەی کە مافی تەواوی خۆی دەدەنێ و ئەرکی سەرشانیان بەتەواوی ئەنجامدەدەن.''[3]

لەکاتێك ئەمەی بە ئەبو زەرر دەوت، هەمان شتی بە ئەبوبەکر یان بە عومەر نەدەوت. بەپێچەوانەوە، بەدەستی ڕاستی دەستی ئەبوبەکر و بە دەستی چەپیشی دەستی عومەری گرت و لە ڕوانگەی ئاماژەکردن بۆ ئەوەی کە دەبنە کاربەدەست، فەرمووی: ''من لە ئەهلی ئاسمان دوو وەزیر و لە ئەهلی سەرزەویش دوو وەزیرم هەیە. وەزیرەکانم لە ئاسمان: جوبرائیل و میکائیل، ئەوانەی سەرزەویش ئەبوبەکر و عومەرن.''[4]

لەلایەکی تریشەوە، لە پشتی پەردەی غەیبەوە پێشهاتەکانی دیوە و کۆمەڵە ئاماژەیەکی سەبارەت بە خەلافەتی هەرچوار خەلیفەکە دەربڕیوە. بەڵام کە دێتە

---

١. أبو نعيم، حلية الأولياء ١٥٦/١.

٢. طبراني، المعجم الأوسط ٣٠٥/٧.

٣. مسلم الإمارة ١٦-١٧.

٤. الترمزي، مناقب ١٦؛ الحاكم، المستدرك ٢٩٠/٢.

سەرەی حەزرەتی عوسمان ئەم برِگەیە زیاد دەکات: "عَلَی بَلْوَی" "ڕووبەڕووی گەلێك فیتنە و تاقیکردنەوە دەبێتەوە"[٥]. هەرواش بوو...

بەڵێ، ئەو زاتە زۆر چاك هاوەڵانی دەناسی، بگرە لە خۆیان چاکتری دەناسین. کێی ڕاسپاردبێت بۆ هەر ئەرکێك، لە هەڵبژاردنەکەیدا تووشی هەڵە نەبووە و پێکاویەتی. ئاساییە ئەبو زەرر داوای کاربەدەستی بکات و پێی وابێت بۆ ئەو کارە دەست دەدات، بەڵام پێغەمبەر ئەبو زەرری لە ئەبو زەرر خۆی باشتر دەناسی، بۆیە پێی دەفەرموێت: "ئەی ئەبو زەرر! تۆ لاوازی و ئەو کارەش ئەرکێکی قورسە." هەر ئەوەندەی پێ دەڵێت و هیچ ئەرکێکی کارگێڕی ناداتێت.

هەر سەبارەت بەم بابەتە پێم خۆشە یەك دوو نموونەی ترتان عەرز بکەم:

## ٢. عەمری کوڕی عەبەسە

لە صەحیحی موسلیم و موسنەدی ئیمام ئەحمەددا هاتووە کە عەمری کوڕی عەبەسە دەگێڕێتەوە: لە مەککە چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا و زۆر بە ناقۆڵایی و زبرییەوە لێم پرسی: "مَا أَنْتَ؟" "تۆ چیت؟" ئەویش بە هێمنی وەڵامی دامەوە: "أَنَا نَبِيُّ اللهِ" "من پێغەمبەری خوام." وتم: "ئەی پێغەمبەر چییە؟" فەرمووی: "خوا ناردوومی." وتم: "بە چ ئەرکێك تۆی ناردووە؟" فەرمووی: "بە سیلەی ڕەحم و شکاندنی بتەکان و پەرستنی خوای تاك و تەنها و هاوەڵ دانەنان بۆی" پێم وت: "کێت لەگەڵدایە بۆ ئەم کارە؟" فەرمووی: "ئازادێك و کۆیلەیەك." دەڵێت لەوکاتەدا لەوانەی کە بڕوایان پێ هێنابوو ئەبوبەکر و بیلالی لەگەڵدا بوون، ئەم خۆش مامەڵەیی و نەرمونیانییە بەرامبەر بەو زبری و هەڵەشەییە کاری لە دەروونی عەمر کردبوو. بۆیە یەکسەر چۆك دادەدات و دەڵێت: "إِنِّي مُتَّبِعُكَ" "ئەی پێغەمبەری خوا لە ئێستا بەدواوە منیش شوێنکەوتەی تۆم."

---

٥. البخاري، فضائل الصحابة ٥-٧؛ مسلم، فضائل الصحابة ٢٩.

ئەمە لە دەورانی مەککە و لەکاتێکدا ڕوویداوە کە پێغەمبەر لەوپەڕی پێویستیدا بووە بە کەسانێك تاکو هەر هیچ نەبێت بەهێز دەربکەوێت. بەڵام ئەو سەروەرە دەیزانی کێ لەکوێ و لە چ کاتێکدا بەکاردێنێت.. هیچ سازشێکیشی نەدەکرد لە بەکردەکردنی ئەو شتەی دەیزانی. هەر بۆیە هەمان ئەو شتەی بە ئەبو زەرری وتبوو بە عەمری کوڕی عەبەسەشی دەڵێت. فەرمانی پێکرد بگەڕێتەوە بۆ ناو هۆزەکەی، چونکە ناتوانێت لە مەککە بمێنێتەوە و بەرەنگاری ستەم و تۆقاندن ببێتەوە. ئەوەبوو فەرمووی: "لەم وەختەدا تۆ توانای ئەوەت نییە، ئەی نابینی حاڵی من و حاڵی خەڵکی تریش چۆنە؟ بەڵکو بگەڕێوە بۆ ناو کەسوکارت، هەرکات بیستت من سەرکەوتووم، وەرەوە بۆلام!"

هەروایش بوو. عەمر دەگەڕێتەوە بۆ ناو هۆزەکەی. ساڵان تێدەپەڕن و پێغەمبەر وموسوڵمانان سەرکەوتنی لەسەریەك بەدەستدەهێنن. هەواڵیان دەگاتە عەمر، ئەویش تێدەگات کە ئەمە ساتی دیدارە. دەستبەجێ بەرەو مەدینە دەکەوێتە ڕێ و ڕاستەوخۆ ڕوودەکاتە مزگەوتی پێغەمبەر. پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی لە مزگەوت دانیشتبوون. با لەگەڵ ڕیوایەتەکەی عەمردا بین. دەڵێت: "گەیشتمە مەدینە و بە خزمەتی پێغەمبەر شادبووم، پێم وت: "يَا رَسُولَ اللهِ أَتَعْرِفُنِي؟" "ئەی پێغەمبەری خوا دەمناسیتەوە؟" فەرمووی: "أَلَسْتَ أَنْتَ الَّذِي أَتَيْتَنِي بِمَكَّةَ؟" "بەڵێ، مەگەر تۆ ئەو کەسە نیت کە لە مەککە هاتیت بۆلام؟" ئەوجا دەستیکرد بە گێڕانەوەی ڕووداوەکە هەروەك ئەوەی دوێنێ ڕوویدابێت: "من تۆم ناردەوە بۆ ناو هۆزەکەت و وەها و وەهام پێ وتیت.." عەمریش بە سەرسامییەوە قسەکانی پشتڕاست دەکردەوە..[1]

لەڕاستیدا ئاسایی بوو عەمر ئەم بەسەرهاتەی لەبیرنەچوویێتەوە، چونکە گرنگترین ڕووداوی ژیانی بوو. بەڵام سەبارەت بە پێغەمبەری خوا دۆخەکە جیاوازە. چونکە چەندین ڕووداوی هاوشێوەی ئەوەی بەسەردا هاتووە و بەدرێژایی

---

١. مسلم، صلاة المسافرين ٢٩٤؛ أحمد بن حنبل، المسند ١١٢/٤.

ئەو چەند ساڵەی ڕابردووش چەندین ناخۆشی و تاڵاوی وەهای چەشتووە نەك مرۆڤێك کە بۆ پێنج خولەك بینیویەتی و ناردوویەتیەوە، بەڵکو بەس بوون بۆ ئەوەی دۆستە هەرە نزیکەکانیشی لەبیربیەنەوە. بەڵام هەر کە دەیبینێت یەکسەر دەیناسێتەوە، چونکە هیچکام لەوانەی لەبیرنەدەچووەوە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان پەیوەندییان پێوەی هەبووە. خۆ ئەگەر پاش فەتحی مەککە عەمری کوڕی عەبەسە و ئەبو زەرر نەهاتنایە بۆ دیداری، ئەوا لەوانەبوو خۆی بیناردایە بە دوایاندا و بانگهێشتی بکردنایە، چونکە سەرکەوتنی یەکجارەکی پاش فەتحی مەککە بەدەستهات...

بەڵێ، چاکتر لەوەی ئێمە ڕۆڵەکانی خۆمان دەناسین، ئەو دانە بە دانەی شوێنکەوتووانی دەناسی. چونکە هەموو مرۆڤێك لە دڵی ئەودا جێگەیەکی تایبەتی هەبوو. هاوکات ئەم جۆرە ناسینە لە ڕوانگەی سپاردنی ئەرکەکان بەگوێرەی توانا و لێهاتنەکان، ئێجگار گرنگ بوو..

ئایا لە مێژوودا سەرکردەیەکی تر هەبووە بەو ئەندازەیە زانیاری لەبارەی شوێنکەوتە و دەستەکەیەوە هەبێت؟ وا نازانم هەبێت. چونکە ئەو سەروەرە تەنها سەرکردە و ڕابەر نەبوو بەڵکو لە هەمان کاتدا پێغەمبەریش بوو. جا خۆ تەوەری سەرجەم وتەکانی ئێمەش چەمکی پێغەمبەرێتییەکەی ئەون.

## ٣. جولەیبیب

پێشتر باسی جولەیبیبمان کرد. وا باس دەکرێت ئەم لاوە تەمەن پازدە شازدە ساڵە بەرامبەر ڕەگەزی بەرامبەر لاوازیی هەبووە. پێغەمبەر بە پەیڤە ئەفسوناوییەکانی قەناعەتی پێ کرد واز لەو خووە بێنێت و دوعایشی بۆ کرد..[١]

ئیدی جولەیبیب بووە یەکێك لە پاکیزەترین گەنجەکانی مەدینە. جارێکیان

١. أحمد بن حنبل، المسند ٢٥٦/٥؛ الطبراني، المعجم الكبير ١٦٢/٨، ١٨٣.

پێغەمبەر (صَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) دەینێرێت بۆلای خێزانێك كە كچەكەیان لە تەمەنی شووكردندا بوو. خێزانەكە ماڵێكی ڕەسەن و خانەدان بوون. لەوەدابوون كە لە هەموو ئان و ساتێكدا یەكێك بێتە خوازبێنی كچەكەیان.

جولەیبیب دەچێتە ژوورەوە و سەلامی پێغەمبەریان پێ دەگەیەنێت. ئەندامانی خێزان خۆیان كۆدەكەنەوە و جۆش و خرۆش دەیانگرێت. بەدواشیدا داواكارییەكەیان پێ دەڵێت و قسەكانی پێغەمبەری خوایان وەك خۆی پێ دەگەیەنێت. حەزرەت پێی وتبوو كە بڵێت: "سەلامی منیان پێبگەیەنە و پێیان بڵێ كچەكەیانت بدەنێ."

دایك و باوكی كچە بە سەرسامییەوە دەڕواننە یەكتری و لە دڵی خۆیاندا دەڵێن: "كچەكەمان بدەین بە جولەیبیب؟" بەڵام ئەوەندە هەبوو فەرمان فەرمانی پێغەمبەری خوا بوو و نەدەكرا دەستبنرێت بە ڕوویەوە. لەو كاتەدا كە دایك و باوك لە دوودڵیدا بوون، كچەكەیان كە لەودیو پەردەوە گوێبیستی هەموو قسەكان ببوو هاتە دەنگ و وتی: "بۆچی بەرامبەر بە كەسێك كە فەرمانی پێغەمبەری خوای بەجێهێناوە تووشی دوودڵی بوون؟"[1]

دواجار جولەیبیب ژنی هێنا و دوای چوار پێنج هەفتە بەشداری جیهادی كرد و لەوێ شەهید بوو. پێغەمبەری خوا بەو كەسانەی وت كە بەدوای لاشەی شەهیدەكاندا دەگەڕان: "ئەرێ كەس هەیە دیارنەبێت؟" وتیان "نەخێر." فەرمووی: "بەڵام من كەسێكم دیارنییە؟" وەك باوكێكی جەرگبڕاو كە منداڵەكەی لەدەستداوە بەدوای جولەیبیبدا كەوتە گەڕان. لە كۆتاییدا دۆزییانەوە. تەرمی حەوت دانە لە بێباوەڕان لەملاو ئەولایدا كەوتبوو خۆیشی لەناو خەڵتانی خوێن و شمشێرەكەی بەدەستەوە گیانی ئەسپەردە كردبوو. سەروەرمان هاتە سەری و فەرمووی: "حەوت كەسی كوشتووە و بووەتە قارەمان، دواتر شەهیدكراوە"، دوو جار یان سێ جار فەرمووی ئەو لە منە و منیش لەوم. پاشان سەری جولەیبیبی خستە سەر ڕانی و

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ٤/٤٢٢.

هەتا گۆڕەکەی تەواوبوو ئامێزی پێغەمبەر سەرینی بوو پاش ئەوە خۆی خستییە ناو گۆڕەوە.[1] بەڵێ، ئەو نازدارە ئا بەو شێوەیە بەوەفا و ئەمەك بووە بەرامبەر هاوەڵانی.

## ٤. عەلی کوڕی ئەبوتالیب

جەنگی خەیبەر هەڵگیرسابوو گەمارۆی سەر قەڵاکەش بەردەوام بوو بەڵام ڕۆژان تێدەپەڕین و هەوڵەکانیش بێ ئاکام بوون. ڕۆژێکیان پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرمووی: ''ئەم ئاڵایە دەدەم بەدەست پیاوێکەوە کە خوا لەسەر دەستی ئەو فەتح مەیسەر دەکات. ئەو پیاوە خوا و پێغەمبەرەکەیی خۆش دەوێت، خوا و پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێت!'' ئەو شەوە خەڵك هەر لە ناو خۆیاندا باسی ئەوەیان دەکرد داخۆ دەبێت ئاڵاکە بە کێ بدرێت. کە بەیانی هات هەموو هاوەڵان لەسەر ڕیزی پێشەوەی نوێژ پێشبڕکێیان دەکرد و هەریەکەیان ئاواتی ئەوەبوو ئاڵاکە بەخۆی بسپێردرێت. کە نوێژ کرا پێغەمبەری خوا ڕووی‌کردە هاوەڵان و ئەوانیش بە پەرۆشییەوە چاویان بڕیبووە چاوانی. بەڵام چاوانی ئەو بەدوای کەسێکدا دەگەڕا کە لەوێ نەبوو.

هاوەڵان هەروەك باڵدارێك بەسەر تەوقی سەریانەوە بێت و سەر نەجووڵێنن نەبادا بفڕێت، ئاوا بە وریاییەوە چاوەڕێی ئەو وشانەیان دەکرد کە پاش کەمێك لە زاری پێغەمبەرەوە دەردەچوون، هەموویشیان دەیانویست ئەو شەرەفە بەخۆیان ببڕێت. کێ هەیە نەیەوێت ئەوە ببیستێت کە خۆشەویستی خوایە؟ مرۆڤ لەوانەیە بۆ بەهەشتیش فیداکاری بکات و بڵێت: ''با لەجێی من براکەم بچێتە بەهەشت.'' بەڵام لە پایەیەکی وەهادا فیداکاری نەدەبوو...

ئەها ئەوەتا پێغەمبەری خوا خەریکە لێوی دەجوڵێنێت. بەڵێ وشە چاوەڕوانکراوەکە درا بە گوێکاندا و فەرمووی: ''أَيْنَ عَلِيٌّ؟'' ''عەلی کوا؟''

---

١. مسلم، فظائل الصحابة ١٣١؛ أحمد بن حنبل، المسند ٤/٤٢٠، ٤٢١، ٤٢٥.

چاوی حەزرەتی عەلی تووشی ئازارێکی سەخت هاتبوو. بۆیە بیری لەوە نەکردبووەوە ئاڵاکەی پێبدرێت. هاوەڵان لە وەڵامدا وتیان: "يَشْتَكِي عَيْنَيْهِ يَا رَسُولَ اللّٰهِ" "چاوی دێشێت ئەی پێغەمبەری خوا!"

ئەوجا حەزرەت فەرمووی بنێرن بەدوایدا با بێت بۆلام. پاش ئەوەی عەلی هاتە حزوور، پێغەمبەر تفی پیرۆزی خۆی دا لە چاوانی و دوعای بۆ کرد. چاوی خێرا چاك بووەوە وەك ئەوەی هیچی نەبێت وابوو. حەزرەتی عەلی دوایی دەگێڕێتەوە و سوێند دەخوا کە ببڕای ببڕای تووشی چاو ئێشە نەبووەتەوە.

دواتر ئاڵاکەی دا بە دەستییەوە. ئەمە لەکاتێکدا کە چەندین کەسی وەك حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر و میقداد لەوێ بوون. بەڵام ئاڵاکە بە عەلی لاو ڕەوا بینرا.[1]

قەڵای خەیبەر لەسەر دەستی عەلی کوڕی ئەبوتالیب ئازادکرا و فەتحەکە یەکسەر سەلماندی کە پێغەمبەری سەروەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە بڕیارەکەیدا پێکاویەتی. هەر ئەرکێکی بسپاردایە بە هەر کەسێك دروست ئامانجەکەی دەپێکا. ئەمەش بۆخۆی بەڵگەیەکی تری پێغەمبەرییەکەیەتی. ئاخر ئەو خاوەن فەتانەتی هەرە مەزنە.

بۆ نموونە لەبارەی خالیدی کوڕی وەلیدەوە فەرمووی: "شمشێری خوایە."[2] دەی هەرواش بوو خالید بووە شمشێرێك لە شمشێرانی خوا، بەشداری هەر جەنگێکی بکردایە بە سەرکەوتوویی دەهاتە دەرەوە. بۆیە چەندین ساڵ دواتر حەزرەتی ئەبوبەکر لە بارەی خالیدەوە دەفەرموێت: "هەرگیز دایکان کەسی وەك خالیدیان نەهێناوەتە دونیاوە."[3] دیوێکی ئەم قسەیە تەسدیق و ستایشی بڕیارەکەی پێغەمبەری خوایە.

هاوکات چەند ئەرکێکی تری گرنگی سپارد بە قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی و ئەویش هەموویانی بە سەرکەوتوویی ئەنجامدا. تەنانەت حەزرەتی

١. البخاري، فضائل الصحابة ٩؛ مسلم، فضائل الصحابة ٣٤.
٢. البخاري، فضائل الصحابة ٢٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢٠٤/١.
٣. طبري، تأريخ الأمة و الملك ٣١٥/٢؛ إبن أثير، الكامل في التأريخ ٢٤٢/٢.

ئەبوبەکر دەرهەقی قەعقاع فەرمویەتی: "هەر سوپایەك وێنەی ئەوی تێدابێت، هەرگیز نابەزێت."[1] هەروەها ئوسامەی کردە سەرکردەی سوپا کە هێشتا تەمەنی حەڤدە یان هەژدە ساڵان بوو و ناردی بۆ ناوچەی موئتە، ئوسامەیش بەدرێژایی ژیانی سەلماندی کە شایستەی ئەو پێگەیەیە.

## ٥. هاوسەرە پاکیزەکانی پێغەمبەر

هەڵبژاردنی هاوسەرەکانی لەنێوان سەدان ئافرەتدا هەڵبژاردنێکی هێندە سەرکەوتوو بووە، ئەوە هەڵدەگرێت لە ئاستیدا هەڵوێستە بکەین.. چونکە پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) چەند خانمێکی وەهای هەڵبژارد کە لە توانایاندا بێت ببنە دایکی باوەڕداران و بەرگەی کۆڵی ئەو بەرپرسیارێتییە سەنگینە بگرن. لەو هەڵبژاردنەشدا تەواو پێکابووی. ڕۆژگار دەریخست کە هاوسەرەکانی زێڕی پاڵفتە بوون. ئەوەتا بوونە ڕابەر و مامۆستا و پێشەنگ و لەڕێی ئەو کەسایەتییە مەزنانەوە کە پەروەردەیان کردن خزمەتێکی گەورەیان بە ئیسلام کرد. چەندین خواناس و کەڵە زانا و زاهیدی وەك "مەسروق" و "تاووس کوڕی کەیسان" و "عەتائی کوڕی ئەبوڕەباح" زانیارییان لەوانەوە وەردەگرت و قوتابی ئەوان بوون و لە زانستی ئەوانیان نۆش دەکرد..

وەك لەبەرچاودایە، پێغەمبەری خوا خانمانێکی هەڵدەبژارد کە لە داهاتوودا ببنە پێشەنگی بانگەواز و لە خانەی بەختەوەریدا زەمینەی پێگەیشتن و پێگەیاندنی بۆ دەڕەخساندن و ئەم خاوەن لێهاتنە مەزنانەی ئامادەدەکرد بۆ ئەوەی لە پاشەڕۆژدا ببنە میراتگری بانگەوازی پێغەمبەر. لەنێو خێزانە خاوێنەکانیشیدا یەکێکیان نەبوو خزمەتی ئەو ئامانجە نەکات. هەروەك چۆن خاتوو خەدیجە (رضيَ اللّٰهُ عَنْها) لە سەرەتای بانگەوازدا خزمەتی ئیسلامی کرد و هەموو سامانەکەی لەو ڕێگەیەدا بەختکرد، هەر بە هەمان گوڕ و تینەوە

---

١. البخاري، فظائل الصحابة ١٧؛ مسلم، فظائل الصحابة ٦٣؛ إبن حجر، الإصابة.

خێزانەکانی تریشی خزمەتێکی سەخاوەتمەندانەیان بە بڵاوکردنەوەی زانست و ئیسلام کرد. لەمەشەوە دەردەکەوێت کە هەڵبژاردنی هاوسەرەکانی هەر لە حەزرەتی خەدیجەوە -کە ئەو کات هێشتا پەیامی پێغەمبەرایەتی بۆ نەهاتبوو بەڵام چەندین نیشانەی پێغەمبەرایەتی لێ دەرکەوتبوو- تا سەرجەم هاوسەرەکانی تری، بە نووری پێغەمبەرێتی و فەراسەت دەستنیشانکردووە و هەڵیبژاردوون. گەرنا مەحاڵە ئەو هەڵبژاردنە ڕاست و دروستانەی لێکدانەوەی تری بۆ بکرێت.

## ج- خاوەن فەراسەتی نوورانیی ڕەهەند سرووشی ئاسمانی

بەدەستهێنانی بڕوا و متمانەی کۆمەڵێك و بوونە جێی ڕەزامەندییان لە لایەن هەر سەرکردەیەکەوە، بەندە بەوەی کە ئەو سەرکردەیە ڕەچەتەی چارەسەر پێشکەش بە هەموو کێشەکانی ئەو کۆمەڵە بکات، جا چ لەسەر ئاستی تاك، خێزان، کۆمەڵگە بێت، یان لەسەر ئاستی سیاسی و ئابووری. ئەو سەرکردەیەش چەندە سەرکەوتوو بێت لە چارەسەری ئەو کێشانەدا ئەوەندەش لە لایەن شوێنکەوتووانییەوە قەبووڵ دەکرێت و ڕێز و پایە و خۆشەویستی لە لایان زیاتر دەبێت و دەبێتە سومبولێکی هەمیشەیی بۆیان. حەزرەتی محەممەد موستەفا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) ئەو سەرکردە و پێشەوایە بوو کە سەرجەم کێشە و گرفتەکانی مرۆڤایەتی چارەسەرکردووە...

لەوانەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان پەنا ببرێتە بەر فشار و بەکارهێنانی زەبر و هێز و دانانی سزا و دەربەدەرکردن لە وڵات و بێبەشکردن لە مافە نیشتیمانییەکان و کردنەوەی دەرگاکانی زیندان و سەپاندنی بارودۆخی تۆقاندن و ترس و لەرز لەناو هاوڵاتیاندا. بەڵام بەم شێوازە هەرگیز ناتوانی چارەیەکی ڕیشەیی بۆ هیچ کێشەیەك بدۆزیتەوە. تەنها لە چارەسەری کێشەکاندا کۆڵەوار نابی، بەڵکو دەبیتە هۆکاری دروستکردنی چەندین گرێی دەروونی و بارگرژی لەناو کۆمەڵگەدا. لەبەرئەوە هەرگیز بە ڕێگەچارە دانانرێت. خۆ ئەگەر کەسانێکیش ئەمە بە چارەسەر ببینن، لەڕاستیدا ڕێگەچارەیەکە کێشە و گرفتی دیکەی لێ دەکەوێتەوە.

بگرە چوونە ناو بازنەیەکی بەتاڵی ئەوتۆیە، لەکاتێکدا تۆ دڵخۆشی بەوەی کە شتێکت چارەسەرکردووە، کەچی بێ ئەوەی ئاگات لە خۆت بێت بوویتە مایەی سەرهەڵدانی چەندین گرفت و ئاڵۆزی دیکە.

هەر ئەوەندەی کەوتیتە ناو ئەو بازنە بەتاڵەوە، ئیتر تا ئەو دەمەی بازنەکە دەشکێنیت، هەر هەوڵ و تەقەلایەك بۆ قوتاربوون زیاتر و زیاتر نوقمت دەکات. کەچی دەبینین پێغەمبەری خوا (صَلَّیَاللّٰهُعَلَیۡهِوَسَلَّمۡ) بێ ئەوەی گرفتاری گێژاوی بازنە بەتاڵەکان ببێت و پەنا بەرێتە بەر تیرۆر و تۆقاندن و بە ڕەچاوکردنی ئیرادەی ئازادی مرۆڤەکان و ڕێزگرتنیان، سەرجەم گرێ کوێرەکانی بە وێنەی ئاسانیی دەرهێنانی موو لە ماست کردووەتەوە. خۆ ئەگەر تەنها ئەم لایەنەی بەرچاوبگریت و لانەکەیتەوە بەلای حاڵەتە دەراساکانی تر و لە موعجیزە زۆر و زەبەندەکانیشی وردنەبیتەوە، ئەوا باوەڕ بەوە دەهێنی کە ئەو پێغەمبەری خوایە.

دەی ئەگەر پێغەمبەر نەبوایە چۆن دەیتوانی ئەو هەموو گرفتە چارەسەر بکات؟ لەکاتێکدا ئێمە دەزانین ئەو لە کۆمەڵگەیەکدا ژیاوە کە لەبەر پوچەڵترین هۆکار هەرایان دەنایەوە و بەردەوام لەسەر پێ بوون بۆ ئاژەوەگێڕی و نوقمی دواکەوتوویی و گومڕایی و سەرکەشی و تاریکی ببوون. خوای بالادەستیش ئەرکێکی قورسی خستبووە سەر شانی، کە ئەویش خۆی لە ڕێنوێنیکردنی ئەو کۆمەڵەدا دەبینییەوە.

هەروەك ئایەتی:

﴿ لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا ﴾

(الحشر: ٢١)

"ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندایە سەر کەژ و کێوێك، دەتبینی ملکەچ دەبوو وردو و خاش دەبوو شەق و پەق دەبوو لە ترسی فەرمانی خوا."

ئاماژەی بۆ دەکات، فەرمانبەرییەك خرابووە سەرشانی حەزرەتی محەممەد،

ئەگەر بخرایەتە سەر شاخەکان ئەوا هەپڕوون هەپڕوون دەبوون و دەبوونە تەپوتۆز. بەڵێ، ئەرکەکە تا ئەو ڕادەیە گران بوو. بە تایبەت لەو کۆمەڵگەیەدا کە زۆر سەرەتایی و پەست و دواکەوتوو بوون. ئیتر ئەویش هات و پەنجەی خستە سەر سەرجەم گرفتەکان و ڕێگەچارەی بۆ دۆزینەوە و ئەوانیشی گەیاندە کەناری بێوەیی و ئاسودەیی...

بگرە کردنی بە کۆمەڵگەیەکی وەها ئاسوودەژین، خەڵکی دیکە مەگەر باسی ئەو جۆرە کۆمەڵگانە لە کتێبە خەیاڵکردەکاندا بخوێننەوە. فەرموون ئەوە "کۆمار"ەکەی ئەفلاتون و "یوتۆپیا"کەی تۆماس مۆر و "دەوڵەتی خۆر"ەکەی کامپانێللا... هەموویان دەڵێیت لە ئەنجامی گەڕان بەدوای ئەو کۆمەڵەدا نووسراون کە حەزرەتی محەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) پێی گەیاندبوو.

با لەوان گەڕێین تا لە شیوەکانی ئەندێشەیاندا بخولێنەوە، بڕوانین بۆ پێغەمبەر کە پێش چەندین سەدە کۆمەڵگەیەکی داڕشت هەموو ئەو لایەنە خراپ و کەموکوڕیانەی لێ داماڵی کە تەنانەت ئەو کۆمەڵگە ئەندێشەکردانەش گیرۆدەی ببوون، ئەوجا کردنی بە کۆمەڵگایەکی نموونەیی هاوتای ئەستێرەکانی ئاسمان و پێشکەشی ئەوانەی دوای خۆیی کرد. هەرکەس شوێن ئەو ئەستێرانە بکەوێت دەبێتە سومبولی ئاسوودەی، هەروەك چەندین کەس بوون.. ئێمە لەم ڕۆژگارەدا ئەو حەقیقەتە زۆر بە ئاشکرا دەبینین و تێدەگەین کە کۆمەڵگەی هاوەڵان کۆمەڵگەیەکی ڕاستەقینە و واقیعی بووە. ئومێدیشمان وەهایە کە لە ڕۆژانی داهاتوودا بەرەو ئەو کۆمەڵگە نوورانیە هەنگاوبنێین..

ئەگەر بێت و پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) هەڵنەستایە بە چارەکردنی سەرجەم کێشە و گرفتەکانی مرۆڤی ئەو سەردەمە، ئایا دەکرا ئەو هەموو هاوەڵە پەیدا ببن کە هەریەکەیان بۆخۆی مایەی شانازی مرۆڤایەتین؟ بێگومان نەخێر! بەڵام ئایا تەنها پشت ئەستوور بە ژیری خۆی هەموو ئەو گرفت و ئاڵۆزییانەی چارەسەرکردووە؟ بەدڵنیاییەوە بۆ ئەمەش دەڵێین نەخێر و ئەمەشی بۆ زیاددەکەین: "خوای باڵادەست فەتانەتێکی پێغەمبەرانەی پێ بەخشیبوو ئیتر ئەویش لە سایەی

ئەو فەتانەتە نوورانییەوە کە دارای ڕەهەندێکی ئاسمانی بوو بەوپەڕی ئاسانی تەواوی کێشەکانی چارەسەردەکرد. لەڕاستیدا ئەمەش یەکێکە لە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتیەکەی و تەوەری باسەکەی ئێمەش هەر ئەمەیە.

با ئێستاش چەند نموونەیەك لەو بارەیەوە بهێنینەوە:

## ١. دادوەریی کێشەی بەردە ڕەشەکە

لەو سەردەمەدا خەڵکی بە مەبەستی دۆزینەوەی ڕێگەچارە بۆ گیروگرفتە هەمەجۆرەکانیان دەهاتن بۆلای. ئەوەبوو وەختێك دەستکرا بە نۆژەنکردنەوەی کەعبەی پیرۆز -کە خۆیشی تێیدا بەشدار بوو- دانانی بەردە ڕەشەکە لە جێگەی خۆیدا پشێوییەکی وەهای نایەوە وەخت بوو لەنێوان هۆزەکاندا ببێت بە فەرتەنە و مایەی خوێنڕشتن.. هەمووان دڵنیابوون لەوەی کە ئەگەر ئەم گرفتە لە ماوەی یەك دوو ڕۆژدا چارە نەکرێت، ئەوا بێگومان جەنگ و هەرا بەرپادەبێت. هەروەك پێشتریش وتبوومان: ئەگەر پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە دانانی بەردە ڕەشەکە لە جێگەی خۆیدا بەو شێوازەی کە هەمووان ڕازیبکات ئەو کێشەیەی چارەسەرنەکردایە، ئەوا تەنگژەیەکی خوێناوی سەریهەڵدەدا. وەك ئاشکرایە بەردە ڕەشەکەی خستە ناو کراسێکەوە و گەورەی هۆزەکانی بانگکرد، تاکو هەریەکەو چمکێکی بگرن و بە جارێك بەرزیبکەنەوە. ئەوجا کە نزیك بووەوە لە شوێنی خۆی، بە دەستی پیرۆزی بەردەکەی خستەوە جێگەی خۆی..

ئەم ڕووداوەی کە لە ئێستادا ناچینە وردەکارییەکەیەوە ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە ئەو لەپێش پێغەمبەرایەتیشدا خاوەنی فەتانەتێکی مەزن بووە.

لەو کاتەدا کە ئەو داوەرییەی کرد تەمەنی لە بیست تا بیست و پێنجساڵیدا بوو واتە پێش ئەوەی شەرەفمەند ببێت بە پێغەمبەرایەتی و بەر لەوەی چەندەها دەروازەی بێ سنووری بەڕوودا بکرێتەوە و دەستبکات بە وەرگرتنی وانەکان لە پەروەردگارییەوە. بەڵام لەو قۆناغەشدا -بەو ئیلهامانەی کە لە ڕۆحیەوە دەجۆشان-

جێگەیەکی وای لەناو دڵاندا داگیرکردبوو تەنانەت وەختێك کافرانی قورەیش بینیان لە دەرگای مزگەوتەوە دێتە ژوورەوە، هەموویان هاواریان کرد: "ئەوە محەممەدی ئەمینە! ڕازین بە دادوەریی ئەو."[1] بەمجۆرە بە هاتنی ئەو سەرجەم گرفتەکان چارەسەر بوون..

بەڵێ، بێ ئەوەی هیچ بیربکاتەوە، یان لە مێشکی خۆیدا بیهێنێت و بیبات و ڕای ئەم و ئەو وەربگرێت و نەخشە دابڕێژێت، زۆر بە سادەیی و وەك ئەوەی موو لە ماست دەربێنێت ئاوا بە ئاسانیی چارەسەریکرد. لەڕاستیدا ئەمە بۆ ئەو کارێکی زۆر ئاسان بوو کەسیش ڕەخنەی لێ نەگرت، نەشیاندەتوانی ڕەخنەبگرن، چونکە خۆیان کردبوویانە داوەری خۆیان. ئەویش بە باشترین شێوە هەستا بەکاری خۆی و بێ هیچ هەڵە و دوودڵی و گلانێك هەموویانی ڕازیکرد..

لە سەرانسەری ژیانیدا هەرگیز هەنگاوێکی بۆ دواوە نەناوە.. چونکە دارای فەتانەتێکی وەها بوو زۆر بە چاکی لەو پەیامانە تێدەگەیشت کە لە لایەن پەروەردگارییەوە بۆی دەهاتن. ئەم فەتانەتەی ئەو بە وێنەی خونچەی گوڵێك پشکوتبوو بە گەشانەوەشی تا دەهات ڕەنگاوڕەنگتر دەبوو وەك خەندەیەکیش لەڕووی گرژ و پڕ کێشە و تێرنەبووی مرۆڤایەتیدا درەوشایەوە. لەو شوێنەدا کە تۆ وا گومان دەبەیت مەوداکانی مەزنایەتی ئەو بە پایان گەیشتوون، چەندین ئاسۆی ترت بەڕوودا واڵا دەبن. وەك "یونس ئەمرە"ی شاعیر دەڵێت: "ئەوە خونچەیەکە و لە دوتوێیدا چەندین خونچەی تری هەڵگرتووە.."

لە ژیانی پیرۆزیدا بە بەردەوامی خەڵك بۆ چارەی کێشەکانیان سەریان لێداوە، ئەویش هیچکام لەوانی بە غەمباری یان دڵشکاوی نەگێڕاوەتەوە. هەر لە دەستپێکی ڕێگەوە هەستا بە چارەسەرکردنی دانە بە دانەی گرفتی هۆزەکەی، ئەو هۆزەی کە هەمووکات لەسەرپێ بوون بۆ نانەوەی ئاشووب و فیتنە..

هیجرەت بۆخۆی کێشەیەك بوو.. قەیرانەکانی جەنگ و ئاشتی، گرفتی بەرژەوەندییە مادددییەکان، کێشەی غەنیمەت... خۆ ئەگەر ئەو زاتە نەیتوانیایە

١. أحمد بن حنبل، المسند ٤٢٥/٣؛ إبن هشام، السيرة النبوية ١٩/٢.

بە ئاسانی لەو کێشانە دەرباز ببێت و چارەسەریان بکات، بێ هیچ گومانێك میللەتەکەی لەناو خۆیاندا -کە چێژیان لە بەربەرەکانێ و ململانێ وەردەگرت و بە سروشت زوو هەڵدەچوون- هەر زوو هەڵدەپژان بە یەکدا و دەستیان بە خوێنی یەکتر سوور دەبوو.

## ٢. دابەشکردنی دەستکەوتەکانی حونەین

ئەو دەستکەوتانەی لە جەنگی حونەیندا دەست موسوڵمانان کەوتن، پێغەمبەر بەسەر هەندێك لەو کەسانەدا دابەشیکرد کە دەیویست دڵیان بەرەو ئیسلام نەرم بکات. ئەمەش بووە هۆکاری جۆرێك لە قسە و قسەڵۆك لەنێوان گەنجانی ئەنصاردا. بەڵێ، بەتایبەت گەنجەکان ئەو دابەشکردنەیان پێ هەرس نەدەکرا و دەیانوت: "هێشتا خوێنیان لە شمشێرەکانمان دەتکێت کەچی غەنیمەت دەدرێت بەوان." لەم نێوەندەشدا سەعدی کوڕی عوبادە دێتە خزمەت سەروەر و بارودۆخەکەی وەك خۆی بۆ باس دەکات. سەروەریشمان بۆچوونی ئەو دەپرسێت. ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: "منیش یەکێکم لەوان." ڕەوشەکە تابڵێی هەستیار بوو. وای دەخواست دەستبەجێ ڕێگەچارەیەك بدۆزرێتەوە. مەسەلەکە بەرگەی ماتڵبوونی نەدەگرت.

کەچی دەبینین پێغەمبەر بە فەتانەتە نووربەخشەکەی بەوپەڕی سانایییەوە چارەسەریدەکات. گەر بیرتان مابێت لە شوێنی خۆشیدا ئەم ڕووداوەمان گێڕایەوە و وتمان کە بەڵگەیە لەسەر پەیامداریی حەزرەتی محەممەد (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)...

پێغەمبەر کۆبوونەوەیەکی ڕێکخست کە تەنها ئەنصارەکانی لەخۆ دەگرت. جگە لەوانیش ڕێی نەدا کەسی تر بەشداری بکات. لە لایەکی ترەوە، چۆنێتی ئەنجامدانی کۆبوونەوەکە کاریگەرییەکی ئەرێنی وەهای لەسەر ئەنصار دروستکرد، هەر ئەوەندەی فەرمووی: "مەگەر ناتانەوێت لەکاتێکدا خەڵکی بە مەڕ و بزن و وشترەوە دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان ئێوە بە پێغەمبەری خواوە بگەڕێنەوە؟" هەموو ئەنصار کەوتنە هەڵڕشتنی فرمێسکی شادی.[1]

١. البخاري، مغازي ٥٦؛ مسلم، زكاة ١٣٢-١٤٠؛ إبن هشام، السيرة النبوية ١٧٧/٥.

هەستانەوەی ئەو سەرومرە لەژێر باری ئەو قەیرانە ئاڵۆزانەدا نابێت بدرێتە پاڵ کۆمەڵە لێکدانەوەیەکی نهێنی، یاخود کۆمەڵە هێزێکی جیاواز. چونکە ئەو تەنها و تەنها پێغەمبەری خوایە.

گەر ڕێگە بدەن مەسەلەیەك هەیە دەمەوێت لێرەدا دووبارەی بکەمەوە: ئەو لەناو کۆمەڵێکدا سەریهەڵدابوو کە تینووی ئاشووب و ئاریشە و دووبەرەکی بوون.. کۆمەڵگە کۆمەڵگەیەکی گرفتدار بوو و هەموو ڕۆژێك بە کۆڵێك کێشەوە دەهاتنە بەردەمی. ئەویش هەموو ئەوانەی -بە دەربڕینەکەی بەرنارد شۆ- وەك چۆن قاچ بخاتە سەر قاچ و فنجانێك قاوە بخواتەوە، ئاوا بە ئاسانی چارەسەردەکرد.. ئەمەش وتەیەکی بەویژدانی خاوەن ڕۆحێکی بێ ویژدانە: "لەم سەردەمەدا کە گرفت و قەیرانەکان لەسەر یەك کەڵەکە بوون، بەشەریەت لە هەموو کات زیاتر پێویستی بە حەزرەتی محەممەدە."

بەرنارد شۆ بەم قسانەی وەك بڵێی گوزارشت لە سەرسامی خۆی دەکات لە ئاست پێغەمبەری خوادا کە چۆن بە ئاسانی لەمپەڕی ئاریشەکانی تەی کردووە. بەو قسانەی داندەنێت بە ڕاستییەکدا. زۆر حەزمدەکرد ئەو تۆزە دانپێدانانەی بەس بووایە بۆ ئەوەی چاوی بەڕووی حەقیقەتدا بکردایەتەوە. چونکە هەر هیچ نەبێت ئەو هێندە قەدرناسییەی هەبوو بەرامبەر بە سەرومرەکەم. جا بەو پێیەی بەرامبەر ئەبو تالیبیش بە هەمان شێوە بیردەکەینەوە، بۆیە ئومێددەکەم ئەم نەرمی نوێنییەمان چاوپۆشی لێبکرێت.

## ٣. قەیرانی کۆچ

کۆچ هەردەم کێشەیە.. تەنانەت لەم سەردەمەشدا هەر بەردەوامە. دەبینین وڵاتەکەمان لە دەرەنجامی کۆچەوە چ تاڵاوێك دەچێژێت. بەندە لە چەندین وتار و بۆنەدا نیگەرانی خۆمم دەربڕیوە و وتومە کە ئەم دیاردەیە دەرەنجامی ئەو پیلانانەیە کە لە دەرەوە نەخشەیان بۆ دەکێشرێت و وەك شانۆگەری لە وڵاتەکەماندا

نمایشدەکرێن. دوژمنان دەتوانن لە هەر بەشێکی ئەم وڵاتەدا بیانەوێت دەرگای ئاژاوە و دووبەرەکی بخەنە سەرپشت. دەتوانن چەندەها کون و کەلەبەر بکەنەوە و رێ بۆ قەیران و نەهامەتی خۆشبکەن. چونکە لە لایەکەوە بێباوەڕ و ستەمکاران و لە لایەکی تریشەوە دووڕووانی ئاسیا هەمیشە لە مەڵاسدان بۆ کردنەوەی دەرگاکانی ماڵوێرانی و پیلانگێڕی لەسەرمان. لە ڕابردووشدا چەندین جار خاڵی لاوازی ئێمەیان قۆزتۆتەوە و لەسەر نەخشەی هاوکێشە جیهانییەکان سڕیویانینەتەوە. بەو هۆیەشەوە تەواوی جیهانی ئیسلامی زیانمەند بووە. بەڵام فیداکارانی بڕوا و ئیمان توانییان ئەو هێزە دینامیکییەی کە لە ڕۆحی ئەم ئوممەتەدایە و هەڵقوڵاوی ئیمان و بیروباوەڕیەتی -پشت ئەستوور بە کۆمەکی خوایی- ڕامی بکەن و ئەو گەلە ڕزگاربکەن لەوەی کە چارەنووسی بە دەردی چارەنووسی بولگاریا یان تورکستان یان ئۆزبەکستان یان مەنگۆلیا بچێت. داوا لە خوای دلۆڤان دەکەین کۆمەکی ئەو وڵاتانەش بکات تاکو ئەو زنجیری کۆیلایەتییە بشکێنن کە لە گەردنیان ئاڵاوە و توانایان بداتێت تا ئەوانیش سنوورێك بۆ دوژمنانیان دابنێن، چونکە خوا دەفەرموێت:

﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾

(آل عمران: ١٤٠)

"ئێمە ئەو ڕۆژگارانە دەستاودەست پێ دەکەین لەناو خەڵکیدا."

جا ئەگەر ئەو ڕۆژانە ئەمڕۆ بەرەو ڕووی بەرژەوەندی دوژمنان بڕۆن، ئەوا سبەی پشتیان لێ هەڵدەکەن. بگرە لەوانەیە لە داهاتوودا خەندە و دڵگوشادی ئەو وڵاتە داماو و ستەملێکراوانەش بەسەربکاتەوە.

بەڵێ، کۆچ بۆخۆی کێشەیەکی قورس و دژوارە.. پرسی کۆچکردنیش لەمڕۆدا -کە لە بەردا ویستم بیترنجێنمە ناو کەوانەیەکەوە- خۆتان دەزانن باسێکە و میللەتێکی چەندان ملیۆنی و کاربەدەستەکانی تووشی قەیران کردووە و نازانن چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەن. دیارە لەو کۆچەی ئەو وەختە هاتە مەیدان،

ژمارەی کۆچبەران نزیك بوو لە ژمارەی دانیشتووانی ئەوکاتەی مەدینە. کەچی دەبینین لە سایەی ئەو فەتانەتە بەرینەی پێغەمبەردا چ ئەوانەی بۆ حەبەشە و چ ئەوانەش کە بەرەو مەدینە کۆچیان کرد، تووشی هیچ جۆرە تەنگەتاوییەکی ماددی نەبوون و وێڕای دەربازبوونیشیان لە سەختییەکانی دونیا، چەندین ئەنجامی باشیان بەدەستهێنا. لەڕاستیدا لە مێژووی جیهاندا هیچ کۆچێك نییە هێندەی ئەو کۆچەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ڕوویدا سەرکەوتنی بەدەستهێنابێت. کەوابوو پێغەمبەر چۆن ئەو گرفتە گەورەیەی چارەسەرکرد؟

ئێستاش با بەکورتی لەسەر ئەم لایەنە بووەستین:

یەثریب شارێکی بچووك بوو دانیشتووانەکەی خەریکی کشتوکاڵ بوون. بۆیە بازاڕ و بازرگانییەکەی کەوتبووە دەستی جوولەکەکان. ڕاستە کۆچەرە مەککەییەکان شارەزای بازرگانی بوون، بەڵام سەرمایەی پێویستیان بەدەستەوە نەبوو تا بازرگانی پێ بکەن، بۆیە پێیان نەدەکرا کێبڕکێی جوولەکەکان بکەن. جا چۆن توانای مامەڵەی بازرگانییان هەبوایە، لەکاتێکدا هەرچی سامان و موڵکیان هەبوو لە مەککە بەجێیان هێشتبوو. ئەمە سەرباری ئەوەی ژمارەی کۆچەران بەردەوام لە زیادبووندا بوو کە ئەمەش زۆربوونی ڕێژەی دانیشتووانی مەدینەی لێدەکەوتەوە. جا ئیتر ئەو خەڵکە لە کوێدا نیشتەجێ بکرانایە و چۆن خۆراکیان بۆ دەستەبەربکرایە؟ ئەمە لەکاتێکدا خەڵکی مەدینە خۆیان هەژار بوون.

سەرجەم ئەم گرفتانە لەسەر یەك کەڵەکە ببوون و هەمووشیان چاوەڕێی چارەسەرێکی لەباریان لە پێغەمبەر دەکرد. هەمووان بە چاوی متمانەوە دەیانڕوانیە ئەو چونکە هەر ئەو بوو بە هەڵمەتێك هەموو ئەوانەی چارەسەر دەکرد.. سەرەنجامیش هەروا بوو.

هەر کە پێغەمبەر گەیشتە مەدینە یەکسەر برایەتی خستە نێوان کۆچەران و ئەنصارەوە. شنەی گیانێکی برایەتی وەهای کرد بە ڕۆحیاندا، زۆر بەهێزتر و قووڵتر بوو لە برایەتی شیری.. تەنانەت گەیشتە ڕادەیەك ماوەیەك میراتی

یەکتریان دەبرد.[1] بەڵێ ئەو برایەتییە ئەوەندە بەتین بوو ئەنصارەکان هەموو شتێکی خۆیان کرد بە دوو بەشەوە و بەشێکیان بەخشی بە برا کۆچبەرەکانیان.

لەو نێوەندەدا شاهیدی ئەم بەسەرهاتە دەبین کە ئەقڵەکان سەرسام دەکات:

بوخاری ڕیوایەت دەکات، کاتێك کۆچەرەکان هاتنە مەدینەوە، پێغەمبەری خوا عەبدولڕەحمانی کوری عەوف و سەعدی کوری ڕەبیعەی کردە برا. ئەم برایەتییە هێندە قووڵ و لە ناخەوە بووە تا دنیا دنیایە نموونەیەکی تری نەبووە و ناشبێت.

ڕۆژێکیان سەعد دەستی عەبدولڕەحمانی بڕای دەگرێت و پێی دەڵێت: "براکەم، ئێوە هەموو شتێکتان لە مەککە جێهێشتووە و ئاوا هاتوون. تۆ ئێستا بێ خێزانیت، منیش دوو خێزانم هەیە. بۆ خوا پێت دەڵێم: سەیری خێزانەکانم بکە، کامیانت بەلاوە پەسەند بوو با من تەڵاقی بدەم و تۆ بیهێنە!.."

عەبدولڕەحمان چاوی پڕبوو لە فرمێسك و فەرمووی: "خوا خێزانەکانت لە خۆت پیرۆز بکات و فەڕ بخاتە سامانتەوە. بازارەکەتانم پیشانبدە، ئەوە بەسە بۆ من."

پاش ماوەیەك عەبدولڕەحمان توانای ئەوەی پەیداکرد کە بژێوی خاو و خێزان پەیدا بکات. بۆیە یەکەم کار کە پێی هەستا ئەوەبوو ژنێکی هێنا.[2] ئەمەش خۆی لە خۆیدا جۆرێك ڕێز بوو لەو کەسانەی کە ئاموشۆی ماڵی دەکردن و نموونەیەکی جوانی ناسکی ڕۆح و نەزاکەتە.

بێگومان گەورەترین کێشە لەبەردەم ئەم جۆرە برایەتییەدا دەتوێتەوە. ئەو فیداکارە خەمخۆرانەی کە بەم ڕادەیە وابەستەی یەکتر بوون، لە هەمان کاتدا ئەو مرۆڤە بژاردانەش بوون کە دەستنیشانکراوی ئەوەبوون فەتحی جیهان بکەن. ئەو گیانی برایەتییەی بەسەر ئاسمانی مەدینەوە شنەی دەهات، بەدڵنیاییەوە ڕۆژێك دێت بەسەر هەموو جیهاندا پەخش ببێتەوە...

---

١. البخاري، فرائض ١٦؛ أبو داود، فرائض ١٦.

٢. البخاري، مناقب الأنصار ٣؛ ترمزي، بر ٢٢.

## ململانێی نێوان "بێ نیازی" و "بەخشندەیی"

پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەتەنها خۆی دانیشتبوو. ئەوەبوو هەندێك لە گەورە موهاجیرەکان پاش مۆڵەت خواستن هاتنە خزمەتی. هیچ ئەنصاریەکیان لەگەڵدا نەبوو ئەمەش بۆخۆی جێی سەرنج بوو. داخۆ بۆچی کۆچبەرەکان بەتەنیا هاتبوون و بانگی پشتیوانەکانیان نەکردبوو؟

پاش مۆڵەت وەرگرتن مەبەستی هاتنەکەیان بۆ ئاشکرا کرد و عەرزیان کرد:

"ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە لەبەر خوا هیجرەتمان کرد و هاتین بۆ ئێرە. هەموو ئاوات و مەبەستێکمان ئەوەبوو لەپێناو خوا لە خزمەت تۆدا بین. کەچی برا ئەنصارییەکانمان بە جۆرێك بایەخمان پێدەدەن دەترسین هەر لە دونیادا پاداشتی رۆژی دوایی تەواوبکەین. با برایانمان رێمان بدەن ئیدی ئێمە خۆمان بژێوی خۆمان دابینبکەین. ئەو بەشەش کە بۆ ئێمەیان تەرخانکردووە بۆیان بگەڕێنینەوە. چونکە لەژێر منەتدا دەمێنینەوە و هەست بە شەرمەزاری دەکەین."

بەدەم ئەم قسانەوە هەموویان چاوانیان فرمێسکی لێ دەباری. پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) نەیدەتوانی بەر بە فرمێسکەکانی بگرێت. ڕەنگە ئەم دیمەنە ئاسمان نشینانیشی نوقمی گریان کردبێت. ئەمە لە ڕوویەکەوە ململانێ و بەربەرەکانێی نێوان بێ نیازی و خەمخواردنی یەکتر بوو. هەتا ئەو ڕۆژە سەرزەوی ململانێیەکی ئەوەندە جوانی بەخۆیەوە نەدیبوو.

چونکە پاش کەمێك کە پێغەمبەر ئەنصاری بانگ دەکرد و مەسەلەکەی بۆ دەگێڕانەوە، هەموویان بە یەکدەنگ نارەزاییان دەردەبڕی و ڕووبەڕووی ئەو بێ نیازییە دەوەستانەوە. چونکە رازی بوون بە وەها داواکارییەك هیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ ئەوەی ڕازیبن جەستەیان بکرێت بە دوو کەرتەوە.

ئا ئەو برایەتییە بوو کە پێغەمبەر بە یەك هەناسە خستیە ناو دڵی هاوەڵانیەوە، هەر ئەو برایەتییەش ئەوانی کرد بە یەك جەستە. پشتیوانەکان حەزیان دەکرد کۆچبەرەکان لە لای ئەوان بمێننەوە، چونکە لەتاو ئازاری جودایی بەرگەیان

نەدەگرت و سوێیان دەبووەوە. ئەگەرچی ئەوان لە ڕۆژێکدا پێنج جار لە مزگەوتدا بە دیداری یەکتر شاد دەبوون و لە هەمان شاردا دەژیان، بەڵام دیارنەبوونیان لەناو ماڵەکانیان و لەکاتی ژەمەکاندا -کە لەگەڵیاندا وەك سێو کەرتیان کردبوو- دڵی دەهەژاندن.

بەڵێ، لایەك نمایندەی بێ نیازی و لایەکەی تریش نمایندەی جوامێری و خەمخۆری دەکرد. هەردوولاش سووربوون لەسەر هەڵوێستی خۆیان. لە ئاکامدا هەردوولا گەیشتنە ڕێککەوتنێك. بەگوێرەی ئەوە کۆچبەرەکان بەکرێ لە باخ و مەزرای پشتیوانەکاندا ئیش بکەن، بەوەش دەتوانن خۆیان بەخێوبکەن و لەناو خانە و لانەی سەربەخۆی خۆیاندا دابنیشن و لەژێر منەتی کەسدا نەمێننەوە. ئیتر بەمجۆرە پشتیوانەکان بوونە یاریدەدەری برا کۆچبەرەکانیان. بەمەش پێغەمبەر تا ڕادەیەکی زۆر کێشەی کۆچی لەڕێی هەستی "برایەتی"وە چارەسەرکرد.[1]

کێشەیەکی تریشی چارەسەر کرد کە ئەویش بریتی بوو لە بازرگانی. پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) سەرنجی دا جوولەکەکان لە مەدینەدا زاڵبوون بەسەر بازاڕ و ژیانی بازرگانیدا.. بۆیە فەرمانی دا بە دروستکردنی بازاڕێك بۆ موسوڵمانان لە شوێنێکی تردا[2]، تاکو موسوڵمانان مامەڵە و سەودای بازرگانی لەنێوان خۆیاندا و لە بازاڕی تایبەت بە خۆیاندا بکەن. ئەم هەنگاوە لە لایەك هەلی ئەوەی بۆ موسوڵمانان دەڕەخساند کە لەڕێی بازرگانییەوە بژێوی خۆیان دابینبکەن و ناوەندی کڕین و فرۆشی تایبەتیان هەبێت، هەم ئەو هەژموونەش بڕەوێننەوە کە ناموسوڵمانان بەسەر بازاڕدا هەیانبوو. بۆ ئەم مەبەستە بازاڕێکی نوێ بنیاتنرا. موسوڵمانانیش لەناو خۆیاندا دەستیانکرد بە کڕین و فرۆشتن. مێژوونووسان بۆمان دەگێڕنەوە کە کاتێکی زۆر تێنەپەڕی بوو جوولەکە توانای بازرگانی نەما لە بازاڕەکانی مەدینەدا.

بەڵێ، کەس نەیدەتوانی لەناو بازاڕی موسوڵماناندا کێبەرکێی بازرگانیی

---

١. البخاري، حبة ٣٥؛ مناقب الأنصار ٣؛ مسلم، جهاد ٧٠.

٢. إبن ماجه، تجارة ٤٠؛ طبراني، المعجم الكبير ٢٦٤/١٩.

موسوڵمانان بکات. ویستی خوای گەورەش هەر ئەوەبوو موسوڵمان نەبێتە شوێنکەوتە و پاشکۆی کەس...

بەڵێ، خوای میهرەبان هەرگیز ڕازی نابێت باوەڕداران گرفتاری زۆنگاوی بێ ڕێزی ببن و هەر چاوەڕێی دەرچوونی فەرمان بن لە خەڵکانی ترەوە و پەنا بۆ بێگانە ببەن بەو ئومێدەی کێشە و گرفتەکانیان بۆ چارەسەربکەن و بە سەرشۆڕییەوە پێیان بڵێن: "تکاتان لێ دەکەین فڵانە گرفتمان بۆ چارەسەر بکەن." خوا ئەم کارەمان پێ ڕەوا نابینێت. ئیماندار دەبێت سەربەرز بێت، لەسەر پێی خۆی ڕابوەستێت، بەدەست و بازووی خۆی کارەکانی ئەنجامبدات، بە چاوی خۆی ببینێت، بە هزری خۆی بێتە گوفتار، بە بیر و نەخشەی خۆی چارەی کێشەکانی بکات و پارێزگاری لە ڕەسەنایەتی خۆی بکات. ئا ئەمەبوو کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) لە مەدینەدا بناغەی بۆ دارشت.

## یەکەمین دەستوور

هەر کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلَى آلِهِ وصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) گەیشتە مەدینە یەکسەر بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە.[1] پسپۆڕانی بواری یاسا ناوی لێ دەنێن: "دەستووری پێغەمبەری خوا". لەو بەیاننامەیەدا ڕیشە و بناغەی زۆرێك لە بەندەکانی جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ بەدی دەکرێت.

بەڵێ، لە ڕێگەی ئەو مافانەوە کە بەخشی بە گاور و جوولەکەکان، یەکێتییەکی وەها پتەوی لەنێوان پێکهاتەکانی مەدینەدا بنیات نا، ڕێخۆشکەر بوو بۆ ئەوەی بیانهێنێتە بەرەی موسوڵمانان و دایانبڕێت لە نەیارە هەمیشەییەکانیان کە بریتی بوون لە بیزەنتی و ساسانی و قوڕەیشییەکان. بەم شێوەیە جوولەکەکان بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەژێر سایەی موسوڵماناندا بە ئاسوودەیی و ئاسایشەوە ژیانیان بردەسەر. ئاژاوەگێڕە گەورەکەی سەردەمی مەدینە، مونافیقی بەناوبانگ "عەبدوڵڵای کوری

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٣/٣١-٣٥.

ئوبەی کوڕی سەلول" نیگەرانی خۆی بۆ قورەیش بەمجۆرە دەردەبڕی: "لەڕاستیدا ترسی من لەوە نییە بێتە مەدینە و لەوێ ئایینەکەی بڵاوبکاتەوە. بەڵکو ترسی ڕاستەقینە لەوەدایە جوولەکە و گاورەکان لە دژی بتپەرستەکان بێنێتە بەرەی خۆی. هەر ئەمەشە مەترسی لەسەر ئێوە دروستدەکات."

ئەو پەیماننامە یان دەستوورە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بووە مایەی سەقامگیربوونی ئاشتەوایی و ئاسایش لەنێوان موسوڵمانان و جوولەکەکاندا، تاوەکو ئەو دەمەی جوولەکەکان پەیمانیان شکاند. جوولەکەکان لە زۆر مەسەلەدا سەردانی پێغەمبەریان دەکرد و پەنایان بۆ داوەریی ئەو دەهێنا.

بەڵێ، پەڕاوەکانی فەرموودە بۆمان دەگێڕنەوە کە جوولەکەکان لە بابەتی دزی و سزا و زینادا سەردانی پێغەمبەریان دەکرد. لەمەوە تێدەگەین کە ئەگەرچی کاروباری جوولەکەکان بۆ خۆیان جێهێڵرابوو کەچی لەبەرئەوەی موسوڵمانەکانیان بە دادگەرتر و لێوەشاوەتر دەزانی -نەخوازەڵلا ئەگەر ئەو موسوڵمانە پێغەمبەری خوا بێت- بۆ هەموو مەسەلەیەك دەگەڕانەوە بۆ ڕای موسوڵمانان. ئەو سەرچاوە پیرۆزەی کە لە داهاتوودا دەبووە مەرجەعی تەواوی گرۆی ئادەمی، هەر لەو ڕۆژانەوە مەرجەعییەتی خۆی سەلماندبوو.

بەڵێ، ئا بەو جۆرە بە یەك گورزی دەست کێشەی "کۆچ" چارەسەردەکرێت و موسوڵمانانیش لە کەشێکی ئازاد و پڕ ئاسوودەیدا بەڕووی دونیادا دەکرانەوە.

## ٤. قەیرانی جەنگ

قەیرانی جەنگ و شکستەکان لە ئارادا بوو. بەڵێ، قەیرانی جەنگ و سەرکەوتن و شکست و ئاشتەوایی...

پێغەمبەریش (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) چەندەها جەنگی دیوە. یەکەمجار لەگەڵ هۆز و گەلەکەی، پاشان لەگەڵ جوولەکەکانی مەدینە و دەوروبەری، پاشتر لەگەڵ هەردوو ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی و ساسانی. هەر چوار لای بە دوژمن تەنرابوو

ئەوجا ئەم دوژمنانە بێ وەستان قەیرانیان بەرهەمدەهێنا. بەڵام ئەو هەموو جارێك هاوشێوەی دەرهێنانی تاڵە موویەك لەناو دەفرێك ماستدا ئاوا سەركەوتووانە خۆی لەناو گێژاوی ئەو كێشانە دەردەهێنا.

## تاكتیكی ئوحود

لێرەدا نە باس لە سەركەوتنی بەدر و نە لە ئامادەباشییەكانی خەندەق و نە لەو داستانەی كە قارەمانەكانی موئتە تۆماریان كرد، وە نە لەو بەربەرەكانێیە ناكەین كە شۆڕەسوارەكانی یەرموك پێی هەستان، بەڵكو باس لەو دەرهاویشتانە دەكەم كە لە جەنگی ئوحوددا هاتنە گۆڕێ، ئەو جەنگەی كە لە ڕوویەكەوە بە شكست دادەنرێت. لەوێشەوە هەوڵ دەدەمین بە یەك دوو ڕستە ئاماژە بۆ ئەو وردبینی و تێڕامان و بڕیارە دروستانە بكەین كە پێغەمبەری سەردارمان (عَلَيهِ أَفضَلُ صَلاَةٍ وَسَلاَم) لەوبارەیەوە خستوونیەتە ڕوو.

ئوحود یەكەم جەنگە كە تیایدا ئەدگارەكانی نسكۆ لە ڕیزی موسوڵماناندا دەركەوت. پەنا دەگرم بە خوا لەوەی دۆڕاندن بدەمە پاڵ هیچ موسوڵمانێكی ڕاستەقینە. چونكە پێش هەموو شتێك تەقدیری خوای كارجوان لەوەدا هەبوو چونكە لە بەرەی بەرامبەردا كەسانێكی وەك خالیدی كوڕی وەلید و عەمری كوڕی عاص هەبوون، كە هەریەكەیان بلیمەتێك بوون لە بواری سەربازی و ڕامیاریدا. ئەوانە لە داهاتوودا چۆكیان بە چەندەها سوپای زەبەلاح دادەدا. ڕاستە ئەوان لەوكاتەدا لەناو بەدبەختی ئەوەدا بوون كە لە ڕیزی سوپای بتپەرستاندان، بەڵام ئەوان صەحابی ئایندە بوون. بەڵێ، هاوەڵانی دواڕۆژ بەسەر هاوەڵانی هەنووكەدا سەركەوتن.

خاڵێكی دیكە ئەوەیە كە تیرهاوێژەكان بەگوێرەی ئەو ستراتیژە نەجووڵانەوە كە پێغەمبەری خوا بۆی كێشابوون. بگرە هەندێكیان حەزی وەرگرتنی دەستكەوت لە ناخیاندا سەری هەڵدابوو بەڵام پێچەوانەی مەبەستەكەیانیان دەستكەوت.

لەڕاستیدا ئێمە خۆمان بە شیاوی ئەوە نازانین ڕەخنە لە هاوەڵە پایەبەرزەکانی ئەو نازدارە بگرین. بەر لە هەموو شتێك ئەوان شەرەفمەندی پلەی موقەررەبین بوون.. بێگومان ئەمەش داخوازی مامەڵە و هەڵسوکەوتێکی جیاواز بوو.

دەمەوێت ئەوە بڵێم کە ئەو مرۆڤە فریشتە ئاسایانە بەگوێرەی ئەو ئاستەی کە شیاویان بوو مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا. گەرنا گومان لەوەدا نییە کە چاکەی ئێمە و مانان خراپەی ئەوان بوو.. بەڵێ، خۆ ئەگەر ئەوەی ئەوان ئەو ڕۆژە کردیان ئێمەش بمانکردایە، ئەوا لەوانەبوو لەو ڕووەی ئیجتیهادەوە کە هەمیشە بەسەر پاداشتدا دەڕوانێت، پاداشتیشمان دەستبکەوتایە. بەڵام لەبەرئەوەی کەسانێکی خاوێستی خۆنەویستی وەکو ئەوان کە دەستی پێغەمبەری خوایان گوشیوە و لەسەر تەرکی دونیا و غەیری خوا سوێندیان خواردووە و پێش فریشتە نزیکەکانی بارەگای خوایی کەوتوون، لە نێوەندی پێوەرەکانی خۆیاندا گەردیان خستبووە سەر ئاوێنەی بێگەردی "قوربەت"، بۆیە دووچاری چارەنووسێکی ڕەنگ شکستی نسکۆ ئامێز بوون.

چی ڕوویدا؟ ئەوەی ڕوویدا ئەوەبوو لەناو چەند سەد هاوەڵێکدا حەفتا هاوەڵ کە ناوەکانیان دەزانین شەهیدبوون.[1] هێندەی ئەو ژمارەیەش برینداربوون و لە جووڵە کەوتبوون. موشریکان توانای ئەوەیان هەبوو گورزێکی کەمەرشکێن لە موسوڵمانان بوەشێنن، بەڵام وەختێك بینییان موسوڵمانان پەنایان بردووەتە بەر چیای ئوحود و هێشتا دەنگیان دلێرە، نەیانویست خۆیان بخەنە مەترسییەوە. بۆیە دەمودەست مەیدانی جەنگیان جێهێشت. ئێمە نازانین وەك پشتیوانییەکی خوایی لەوێدا چۆن دەرکەوتوون و بە چ شێوازێکی نەبەردانە مامەڵەیان کردووە، بەڵام ئەوەی دەیزانین ئەوەیە کە لە لێواری شکستدا سەرکەوتن بوو بە نسیبیان و ترسێکی سامناکیان خستە دڵی بێباوەڕانەوە. ئەوانیش لە ترسی ئەوەی نەبادا تووشی کارەساتێك ببن لێیاندا و ڕۆیشتن.[2]

---

١. البخاري، مغازي ٢٦؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٠/١.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ٤٣/٤.

بیانوی بتپەرستەکان بۆ ئەو ترسەیان -کە وەك شکست وابوو- ئەوە بوو دەیانوت: تاسەر ئێسقان ئازار و زیانمان پێ گەیاندوون، بەو زووانە ناتوانن لە ئاسەوارەکانی دەرباز ببن. کەواتە بابڕۆین، ئەگەر ئێمە هێرشیان بکەینەوە سەر، کێ دەزانێت چیمان بەسەردێت!

دواتر لە بەینی خۆیاندا کەوتنە گفتوگۆیەکی لەمجۆرە: "با بڕۆینەوە بۆیان. مادەم گورزی باشمان لێ وەشاندوون و تێکمان شکاندوون، با بە یەکجارەکی -وەك ئەو بەڵایەی کە ڕۆمانیەکان بەسەر قارتاجەدا هێنایان- سەرکوتیان بکەین و مەدینەیان بەسەردا بڕوخێنین. با تۆویان ببڕین و قڕیان تێ بخەین. چونکە گەر تەنها یەك کەسیشیان بمێنێتەوە دواتر زیاد دەکەن و تووشی سەرئێشەمان دەکەن."

هەر کە پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە نیازیان ئاگادار بووەوە، یەکسەر فەرمانی دا: "هەرکێ دوێنێ لە ئوحود لەگەڵمان بووە، بە ساغ و زامدارەوە، با سبەینێ لە فلانە شوێن کۆببنەوە، هەڵمەت دەبەین بۆ ڕاوەدوونانی دوژمن."[١]

ئەوانەی دوێنێ گیریان خواردبوو و پەنایان بردبووە بەر بناری ئوحود، وا ئەمڕۆ خۆیان بۆ هەڵمەتێکی تر سازدەکەن؛ هەڵمەتی زامدار و بریندارەکان. چونکە ڕەوشەکە داخوازی ئەوەبوو هێزێکی مەعنەویی گەورە نمایش بکرێت، تاکو ئەو دڵشکاوییانەی لە خوارەوە باسیان دەکەین، بڕەوێنەوە:

یەکەم: دیمەنێك لە دیمەنەکانی بێ ئومێدی بریتی بوو لە شکستی هێزی مەعنەویی موسوڵمانان.

دووەم: لە هەموو لایەکەوە حەزی بێباوەڕان بۆ سەرکوتکردنی موسوڵمانان تاوی سەندبوو.

سێیەم: تا دەهات تانە و تەشەر و خۆشحاڵی دووڕووەکان ڕووی لە زیادبوون دەکرد و ورەی باوەڕدارانیان دەڕوخاند.

---

١. ابن كثير، البداية و النهاية ٤٨/٤-٤٩.

هەروەها نیازی بتپەرستان بۆ لە ڕیشە دەرهێنانی موسوڵمانان لەملاو ئەولا قسەی لێدەکرا. خۆ ئەگەر فەتانەتی پێغەمبەر نەبوایە و خێرا فریای بارودۆخەکە نەکەوتایە، ئەوا لەوانەبوو کێشە و مەترسییەکی گەورە بقەومێت، کە موسوڵمانان بە زەحمەت بتوانن لەژێر باریدا هەڵبستنەوە.

بەڵێ، ئەو ڕۆژە موسوڵمانان دووچاری چەندین ئازار و ناڕەحەتی بوونەوە، بەڵام بە چاودێری خوای باڵادەست توانییان خۆیان کۆبکەنەوە و شکستێکی چاوەڕوانکراو بگۆڕن بۆ سەرکەوتن.

بەڵێ، هەر ئەوەندەی پێغەمبەر (صَلَّىَاللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) فەرمانی ئامادەباشی دا، بێ یەك و دوو هەمووان ڕیزیان بەست و کەوتنە بەرەنگاربوونەوە. هەندێکیان دەستیان، هەندێکیان قاچیان پەڕیبوو هەندێکی تریشیان نەیاندەتوانی لەسەر پێ بڕۆن، کەچی کە بانگەوازەکەی پێغەمبەریان بیست یەکسەر لە چادرەکانیان هاتنە دەرەوە و ڕوویان لە جێگەی مەبەست کرد. دەتوت هەناسەکانی سەروەر گیانی بوژانەوەی کردووە بە بەریاندا وا هەموویان کەوتبوونە پێشبڕکێی بەدەمەوەچوونی بانگەوازەکەی. هەروەك بوصەیری دەڵێت:

لَوْ نَاسَبَتْ قَدْرَهُ ايَاتُهُ عِظَمًا          أَحْيَا اسْمُهُ حِينَ يُدْعَي دَارِسَ الرِّمَمِ

"ئەگەر موعجیزەکانی حەزرەتی محەممەد بە ئەندازەی قەدر و قیمەتی ئەو سەروەرە بوونایە، ئەوا کاتێك ناوی موبارەکی دەبرا ئێسك و پروسکی گۆڕستانەکان زیندوودەبوونەوە."

بەڵێ ئێسك و پروسکەکان زیندوودەبوونەوە. ئەوەتا ئەوانەی لە ئوحودیشدا ناوی ئەویان دەبیست، یەك دوای یەك دەبووژانەوە.

با ئێستاش ڕووداوەکە لە زاری یەکێك لە هاوەڵانەوە ببیستین:

"برادەرێکم هەبوو توانای ڕۆیشتنی نەبوو ئێمە لەسەر شانمان هەڵمان دەگرت. چونکە پێی وتبوین بیبەین بۆ بەرەکانی جەنگ، خۆ ئەگەر نەشتوانێت تیر

بهاوێژێت، خۆ دەتوانێت تیر بۆ تیرهاوێژەکان ئامادەبکات. هەر کەسە و یەکێکی هەڵگرتبوو کەسی وا هەبوو دەکەوتە خوارەوە و دەبووراییەوە.[1] ئیتر ئەوە حاڵمان بوو تاکو نزیك بووینەوە لە شیوی "حمراء الأسد". ئەوێ شوێنێك بوو موشریکەکان دەیانتوانی دوکەڵی ئاگردانی موسوڵمانەکان ببینن. ئەوەبوو سوپای موسوڵمانان لەناو تەپوتۆز و بە دەنگی بەرز و تەکبیرەوە گەیشتنە جێ. وەختێك قورەیش بینی ئەوانەی کە دوێنێ وایدەزانی مردوون، وەك ئەوەی لە گۆڕ هاتبنە دەرەوە لە بەردەمیاندا قوت بوونەتەوە، لە جێی خۆیان وشکبوون.. هەر ئەوەندەیان بۆ کرا بڵێن: "با خۆمان تووشی کێشەیەك نەکەین، ڕزگاربوونمان لەوەدایە چی زووترە خۆمان بگەیەنینەوە مەککە."[2] ئیتر بەم شێوەیە گەڕانەوە بۆ مەککە."

ئەگەر سەرنج بفەرموون دەبینن کە چۆن پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە یەك هەناسەدا و بە یەك هەڵمەت هەڵساوە بە چارەسەرکردنی هەموو ئەو قەیران و گرفتانەی کە جەنگ لەگەڵ خۆیدا کێشی دەکرد. قورئانی پیرۆز بەمجۆرە ئەو هەڵویستە دژوارەمان بۆ وێنا دەکات:

﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴾

(آل عمران: ١٧٣)

"ئەوانەی کە خەڵکی (باوەڕ لاواز) پێیان دەڵێن: بەڕاستی خەڵکی بێ باوەڕ و خوانەناس خۆیان بۆ ئێوە کۆکردۆتەوە و خۆیان بۆ ئێوە مەڵاسداوە، لێیان بترسن (خۆتان تووشی بەڵا مەکەن) بەڵام ئەوان (واتە ئیمانداران بەو پڕوپاگەندەیە) باوەڕیان زیاتر دامەزراو وتیان: خوامان بەسە کە یاریدەدەر و یارمەتیدەرێکی چاکە."

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٥٢/٤.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ٥٤/٤-٥٥.

بەڵێ، قورەیش هەموو شتێکی بەجێهێشت و هەڵهات.. موسوڵمانانیش تاجی سەرکەوتنیان کردە سەری هەژانەکەی دوێنێیان.. پاشان بە فەزڵی پەروەردگار بێ هیچ زیانێك گەڕانەوە بۆ مەدینە.

هەندێك لە مێژوونووسان باس لەوە دەکەن کە جەنگی ئوحود سەبارەت بە موسوڵمانان شکست بووە. بەڵێ، ئەگەر لە ئوحوددا لایەنێکی شکست لە ئارادا بێت، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ هەندێك لەو هاوەڵانەی کە گوێیان ڕانەگرت بۆ ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر و لە ئامێزی ئوحوددا بە خوێنی شەهادەت شۆران و بە پاك و خاوێنی بەرەو ئاخیرەت کەوتنە ڕێ. بەڵام ئوحود دیوێکی سەرکەوتنیشی هەیە -کە بە بڕوای من ئەوە ئەو دیوەیە کە پێویستە لەسەری ڕاوەستین- ئەویش ئەو دیوەیە کە دەڕوانێتە حەزرەتی محەممەد موستەفا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) وەك چارەسەرسازی کێشەکان.

بەڵێ، ئەوەی گرنگە، وەرچەرخاندنی ڕەوتی جەنگە لە شکستەوە بۆ سەرکەوتن. پێغەمبەریش وەهای کرد.

وەك لە ئەزموونی ئوحودەوە بۆمان دەردەکەوێت، لەو شوێنەدا کە بەرگری گەلان لەبن دێت و خۆیان ڕادەستی بێ ئومێدی دەکەن، پێغەمبەری خوا دەست دەکات بە هێرش، ئەو هێرشەش دەبێتە هۆی شکاندنی هەموو ئەو لەمپەرانەی بوونەتە کۆسپی سەرڕێ و ئومێد و ئیمان بە دەروونی باوەڕداراندا دەپرژێنێت و سەرلەنوێ دووڕووانیش لەناو بێ ئومێدیدا نقوم دەکات. نیاز و ئاواتی بێباوەڕانیش لەناو دڵیاندا لە گۆڕ دەنێت و دڵە شکاوەکانیش بە ئیکسیری ورە و ئومێد سارێژ دەکات. کەواتە دەبێت ئێستا چی بوترێت پاش ئەوەی کە پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) شکستی گۆڕی بۆ سەرکەوتن و موسوڵمانەکانی بە دڵی خۆش و سەرکەوتنەوە گێڕایەوە بۆ مەدینە و بە حیکمەتی خۆی ئەو کێشە ئاڵۆزەی چارەسەرکرد. تەنها ئەوەیە بە ڕاستی و ڕەوانی شایەتی بدەین کە ئەو "پێغەمبەری خوایە"...

## ڕاوێژ

هەندێك لەو کێشانەش کە ڕووبەڕووی پێغەمبەری خوا دەبوونەوە بە ڕێگەی ڕاوێژ چارەسەری دەکردن. لەڕاستیدا دەیویست لە ڕ・ێی ڕاوێژکارییەوە بناغەی بنەما و بنچینەیەکی گرنگ دابڕێژێت. ڕاستە خۆی پێویستی بە ڕاوێژی کەس نەبوو بەڵام ئەوانەی دوای خۆی دەهاتن و دەبوونە نوێنەری ئیسلام هەمووکات پێویستیان بە ڕاوێژ دەبوو. بەڵێ، خۆی بە کۆمەکی ئیلاهی پاڵپشت کرابوو. خوای باڵادەست لە هیچ مەسەلەیەکدا ئەوی بەتەنها جێنەهێشتووە. خۆ ئەگەر نەخۆشیەك ئازاری بدایە، پەروەردگار فریشتەیەکی دەنارد بە هانایەوە و ڕێگەی شیفای پێدەوت. پەیوەندییەکی بەردەوام و پتەوی بە جیهانی مەلەکوتەوە هەبوو کەچی لەگەڵ ئەوەشدا گرنگی و بایەخێکی زۆری بە بابەتی ڕاوێژ دەدا. ئەمەش بۆخۆی ڕەهەندێکی ترە لە ڕەهەندەکانی فەتانەتەکەی.

پاش تێپەڕبوونی چەندین سەدە "ڕاوێژ" بووە سیستەمێکی پەیڕەوکراو لە بواری دەوڵەتداریدا. جا لەبەرئەوەی دەروازەی کارگێڕی لە ئیسلامدا بەسەر ڕاوێژدا کراوەتەوە و تا بڵێی فراوانە، هەروەها بەو هۆیەوە کە جیهانی بوونەکەی لە توانایدایە تەواوی سەدەکان لە ئامێزبگرێت، بۆیە دەبینی بە هەموو سەدەکاندا یەك بەیەك گوزەری کرد و ڕۆڵی خۆی بینی تاکو گەیشتە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان.

## بڕگەیەك لە ڕاوێژ

ئەوجا چەپکێك نموونە:

١. پێغەمبەری سەروەر ڕاوێژی لەگەڵ هەموو کەسێکدا دەکرد و ڕا و بۆچوونی هەمووانی وەردەگرت. چونکە دەیویست بنەمای ڕاوێژ لە سەرجەم یەکەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا ڕەگ دابکوتێت. ئەوەبوو ڕاوێژی بە حەزرەتی عەلی کرد. ئەگەرچی حەزرەتی عەلی ئەو مرۆڤە بوو کە دەیوت: "ئەگەر پەردەی غەیبیش

لابدرێت یەقینم زیاد ناکات.“ کەچی لە بازنەی دەرسی پێغەمبەردا تەنها منداڵێك بوو. پێغەمبەریش هەر لەو تەمەنەوە پرس و ڕای پێ دەکرد.[1]

ئەوەبوو دووڕازەکان (مونافیقەکان) بوختانیان بۆ عائیشەی دایکمان هەڵبەست. بەڵێ، قێزەونترین بوختانیان بۆ ئەو دایکەمان هەڵبەست کە پاکیزەییەکەی بە دەقی ئایەت سەلمێنراوە. ئەم ڕووداوەش بە ڕووداوی "الإفك" ناسراوە. ئەو ڕووداوە فرە ڕەهەندە بەمجۆرە لە لاپەڕەکانی مێژوودا تۆماربووە:

ئەگەرچی پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) تەواو دڵنیابوو لەوەی کە وەحی ئەم باسە یەکلادەکاتەوە و سەبارەت بە حەزرەتی عائیشەش بچووکترین گومانی نەبوو کەچی دیسان پێی باش بوو ڕاوێژ بە دانە دانەی هاوەڵانی بکات. بیرمان نەچێت، ڕاوێژ هەمیشە سوود و قازانج دەستی ئینسان دەخات و نەبینراوە هیچی لێ کەم بکاتەوە. دەی خۆ ئەویش بۆ ئەوە نێرراوە تاکو سوود و قازانجمان دەستبخات.

هەر لەم بارەیەوە لە ڕیوایەتێکی لاوازدا ئەم بەسەرهاتەی خوارەوە دەگێڕدرێتەوە: پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بانگی حەزرەتی عومەر دەکات و لێی دەپرسێت کە ڕای ئەو سەبارەت بە عائیشە چییە. حەزرەتی عومەریش وەڵام دەداتەوە: ”ئەی پێغەمبەری خوا، بە دڵنیاییەوە عائیشە پاکداوێن و بێ گوناهە.. بوختانیان بۆ هەڵبەستووە.“ پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لێی دەپرسێت کە چۆن دەزانێت وایە؟ ئەویش دەڵێت: ”جارێکیان خەریك بوو نوێژت دەکرد، -ئێمە دواتر زانیمان- بێ ئەوەی پێی بزانیت نەعلەکەت نەختێك پیس ببوو.. کە خەریك بوو بەو حاڵەوە نوێژ دابەستی، یەکسەر جوبرەئیل دابەزی و ئاگاداری کردی کە نەعلەکەت دابکەنیت. جا ئەگەر خوای میهرەبان لە پیسییەکی وەها بچووك ئاگادارت بکاتەوە، ئیدی چۆن کەسێکی وا دەکات بە مەحرەمت کە -دووربێ- تاوانێکی وای ئەنجامدابێت؟ نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا، بێگومان جوبرەئیل دێت بۆ لات و هەواڵت دەداتێ کە عائیشە چەندە پاکیزە و خاوێنە.“

---

١. البخاري، المغازي ٣٤؛ مسلم، توبة ٥٦.

بەڵێ، پێغەمبەر (صَلَّىٰاللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمۡ) فەرموویەتی: "مَا نَدِمَ مَنِ اسْتَشَارَ" "ئەو کەسەی ڕاوێژ بکات هەرگیز پەشیمان نابێتەوە."[1] هەربۆیە ڕاوێژی بە حەزرەتی عومەریش کرد. ڕاوێژێکی لەو جۆرە هیچی لە کیس نەدەدا. نەك هەر هیچی لە کیس نەدەدا، بەڵکو سەرلەنوێ دڵی حەزرەتی عومەری فەتح دەکردەوە. بەڵێ، پێغەمبەر ڕاوێژی بە قوتابییەکانی دەکرد و ڕای وەردەگرتن. بێگومان دیسانەوە ئەوانە سوودمەند و براوە دەبوون کە پرس و ڕایان پێدەکرا، چونکە بەم ئاکارەی وانەیەکی گرنگی ئەخلاقی فێردەکردن. مەگەر هەر خۆی نەبوو دەیفەرموو: "ئەوەی ڕاوێژ بکات هەرگیز پەشیمان نابێتەوە؟"

٢. لە سەروبەندی ئەوەی بەرەو بەدر بکەونە ڕێ، بە جیا ڕاوێژی بە ئەنصار و موهاجیر کرد.. میقدادی کوڕی عەمر بەناوی کۆچەرانەوە چەندە مەردانە هاتە گۆ: "ئەی پێغەمبەری خوا، بڕۆ بەدەم فەرمانی پەروەردگارتەوە، ئێمەش لەگەڵتداین. بە خوا ئێمە ئەوەت پێ ناڵێین کە نەوەکانی ئیسرائیل بە موسا پێغەمبەریان وت: "بڕۆ خۆت و خواکەت جەنگ بکەن، ئێمەش لێرە بۆخۆمان دادەنیشین." بەڵکو دەڵێین: "بڕۆ خۆت و خوا جەنگ بکەن، ئێمەش لەگەڵتدا جەنگاوەرین. سوێند بەو خوایەی کە تۆی بە هەق ناردووە، ئەگەر بمانبەیت بە گۆم و زۆنگاویشدا لەگەڵت دەبین هەتا دەگەینە مەبەست."[2]

پێغەمبەر (صَلَّىٰاللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمۡ) قسەکانی پەسەندکرد و دوعای خێری بۆ کرد. پاشان فەرمووی: "خەڵکینە ڕای خۆتانم پێ بڵێن!" مەبەستی لە پشتیوانەکان بوو چونکە تا ئەو وەختە بە ڕاشکاویی گوزارشتیان لە بۆچوونی خۆیان نەکردبوو و دەیویست ڕایان بزانێت. سەعدی کوڕی موعاز کە دارای بیرێکی تیژ بوو یەکسەر هاتە قسە و وتی: "دەڵێیت مەبەستت ئێمەیە ئەی پێغەمبەری خوا؟"

ئەویش فەرمووی: "بەڵێ وایە!" ئەوجا سەعد فەرمووی: "ئەی پێغەمبەری

---

١. طبراني، المعجم الصغير ١٧٥/٢.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ١٦١/٣-١٦٢؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٢٦٢/٣-٢٦٤.

خوا وەڵامی ئێمە ئامادەیە: ئەوە ماڵ و ئەوەش گیانمان.. هەر هەمووی فیدای تۆیە. ئێمە باوەڕمان پێ هێنایت و بە ڕاستگۆمان زانیت، شایەتیماندا کە ئەوەی هێناوتە حەقە، لەسەر ئەمەش پەیمان و گفتی خۆمان دا کە گوێڕایەڵیت بکەین. ئەی پێغەمبەری خوا، بفەرموو بکەوە ڕێ بۆ ئەو کارەی دەتەوێت، ئێمە لەگەڵتداین. سوێند بەو خوایەی تۆی بەهەق ناردووە، ئەگەر بشدەیت لە دەریا، ئیمەش لەگەڵتدا لێی دەدەین و یەك کەسیشمان لێت دوا ناکەوین. هیچ نیگەرانیش نابین بەیانی بە دیداری دوژمنمان بگەین. ئێمە لە جەنگدا ئارامگرین، لە ڕووی دوژمناندا دلێر و نەبەردین. سا بەڵکو خوا بەهۆی ئێمەوە ئەوەت پیشانبدات کە چاوتی پێ ڕوون دەبێتەوە. لەسەر بەرەکەتی خوا بکەوەرە ڕێ.“

پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ڕاوێژی دەکرد و بەمەش گیانی یەکێتی و تەبایی نێوان موسوڵمانانی دەردەخست. موهاجیر و ئەنصار لەسەر خاڵێك یەکدەنگ بوون. ئەویش سووربوون بوو لەسەر جەنگ و شەهیدبوون. ئەوەش تاکە شتێك بوو کە دەبوو پێی هەڵبستن لە ئاست گرۆ و ئۆردوی دوژمندا کە بە ڕق و کینەوە شمشێرەکانیان راکێشابوو و تیرە ژەهراوییەکانیان خستبووە ناو تیروکەوانەکانیانەوە. لەو کاتەدا کە پێغەمبەر لەسەر پێ بوو بۆ بەرگریکردن لە حەق و حەقیقەت و شەرەفی ئیسلام و ئابڕوو و کەرامەتی ئەتەوەی ئیسلام، بۆچوونی هاوەڵانی وەردەگرت. بەمجۆرەش بۆچوونی بەرزی خۆی بە فراوانترین زەمینەدا بڵاودەکردەوە و لەسەر پتەوترین بناغەش جێگیری دەکرد، ئەوجا دەیسپارد بە جۆش و خرۆشی دانە بەدانەی هاوەڵانی.

بەڵێ، جا خۆ مەبەستی بنەڕەتی ئەو هەر ئەمە بوو. لەڕاستیدا خوای باڵادەست نەخشەی ڕێگەی بۆ کێشابوو. ئەویش وێڕای ڕێنوێنی پەروەردگاری، ڕای شوێنکەوتووانی وەردەگرت، تاکو لەو هەڵوێستە گرنگەدا هاوبەشی بیرکردنەوە و هەستەکانیان بێت. خۆ ئەو هەرچی بڕیارێکی بدایە ئەوان بێ چەند و چوون ملیان بۆ کەچ دەکرد. ئاخر بەڵێنیان پێدابوو.. واتای ئەو بەڵێنەش ئیمان بوو. ئەوەتا یەخەی کەعبی کوڕی مالیك دەگرێت و بە ئەسپایی ڕایدەوەشێنێت و

پێی دەفەرموێت: "ئەی تۆ لە عەقەبەدا پەیمانت پێ نەدام؟ مەگەر پەیمانت پێ نەدام کە لە شین و شادیدا، بە شەو و بە ڕۆژ لەگەڵمدا بیت و لێم جودا نەبیتەوە؟"[1] پەیمانیان دابوو و بەرەو ڕووی مەرگ چوون. ئەمە بڕیاری خۆیان بوو. بڕیارەکەشیان بردەسەر.

پێغەمبەری نازدار (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەڕێی ڕاوێژەوە ڕێی خۆش دەکرد تاکو تێکڕای موسوڵمانان خۆیان بە خاوەنی بانگەوازەکەی بزانن. بۆیە دەبینی هەر کەسە و بەگوێرەی توانا و وزەی خۆی بە هەڵەداوان شانی دەدایە بەر ئەو گەنجینەی گەوهەرە. بەڵێ، هەموویان خۆیان بە خاوەنی بانگەوازەکەی دەزانی و بڕوای تەواویان هەبوو کە هەڵگرتنی ئەو پەیامە مەبەست و ئامانجی ژیانیانە و شەهیدبوونیش لەو ڕێیەدا شیرینترین ئاواتە.

٣. سەبارەت بە پێگەی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن هات و لە جێیەکدا سەقامگیربوو. ئەو جێگەیەی هەر لە سەرەتاوە دۆزیبوویەوە و خۆی بۆ سەر بیرەکان دانابوو. هەر زوو بڕیاری ئەوەی دابوو چ تەپۆڵکەیەك بگرێت و لە کوێشدا گورز لە دوژمن بوەشێنێت. بەڵام دیسانەوە دەرگای ڕاوێژ لەسەر مەسەلەکە دەکاتەوە.

لەو کاتەدا حوبابی کوڕی مونزیر، کە زۆریش بەناوبانگ نەبوو لەناو هاوەڵاندا، هەستایە سەرپێ و وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا جێگیربوونت لەم شوێنەدا بە فەرمانی وەحییە؟ ئەگەر بە فەرمانی وەحییە ئەوا ناتوانین بستێك لە شوێنی خۆمان بترازێین. یاخود ستراتیژ و بۆچوونی تایبەتی خۆتە؟"

کە پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) وەڵامی دایەوە و وتی بۆچوونی خۆمە، حوباب بەم شێوەیە بەردەوامی دا بە قسەکانی: "ئەی پێغەمبەری خوا، با ئەو جێیە بگرین کە بیرەکانی لێیە. هەرچی بیرەکانی تریشە با پڕیان بکەینەوە و ئاو بۆ دوژمن نەهێڵینەوە. ئەوجا تۆش بارەگاکەت لەسەر بیرەکە بەجۆرێك جێگیربکە بکەویتە ناوەڕاستی ئێمەوە."[2]

---

١. البخاري، مغازي ٧٩؛ مسلم، توبة ٥٣.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ٣/١٦٧-١٦٨؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٣/٢٦٧.

٤. سەلمان کۆیلەیەکی فارس بوو. کۆیلەیەك کە لە سەرەتادا ئاگر پەرست و پاشان مەسیحی و دواجاریش موسوڵمان بوو. وەختێك موسوڵمان بوو بێ کەس و بێ نەوا بوو. لە هەموو شتێکدا خۆی بە قەرزارباری ئیسلام دەزانی. خۆی بە چەند وشەیەك بە جوانترین شێوە ئەمە دەردەبڕێت. جارێکیان لێی دەپرسن کە لە کێیە و کوڕی کێیە: ئەویش بەمجۆرە وەڵامیان دەداتەوە:

أَبِي الإِسلامُ لا أَبَ لِي سِواه
إِذا افتَخَرُوا بِقَيس أَو تَمِيم

باوکی من هەر ئیسلامە، جگە لەو باوکم نییە
شانازی خەڵك قەیس و تەمیمە، هیچ باکم نییە[1]

بەڵێ، بەڕاستی ڕەچەڵەکی ڕاستەقینەی خۆی دۆزیوەتەوە، ئەو سەلمانی ڕۆڵەی ئیسلامە..

لە جەنگی خەندەقدا کە بە "ئەحزاب"یش ناسراوە، پێغەمبەر وەك نەریتی خۆی ڕاوێژ بە هاوەڵانی دەکات. هەریەکە و شتێك دەڵێت، تا ئەوەی نۆرەی سەلمان دێت. سەلمان بۆچوونی خۆی بەم شێوەیە دەردەبڕێت: "ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)، لای ئێمە نەریت وابوو لەکاتی شاڵاوی دوژمندا خەندەق بە دەوری شاردا هەڵبکەنین. بۆیە پێشنیاری هەڵکەندنی خەندەقێکی وەها دەکەم بەدەوری مەدینەدا."

سەروەرمان بۆچوونەکەی سەلمانی بەلاوە پەسەند بوو. بۆیە فەرمانیدا بە هەڵکەندنی خەندەق و خۆیشی لە کاری هەڵکەندندا بەشداریکرد و جۆش و خرۆشی هاوەڵانی بەرزدەکردەوە.[2]

٥. تەنها ڕاوێژی بە پیاوان نەدەکرد، بەڵکو پرس و ڕای بە ئافرەتانیش دەکرد.

---

١. نووي، تهذيب الأسماء ص٢١٨.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ١٧٢/٤-١٨٢؛ إبن سعد، الطبقات الكبرى ٦٦/٢؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٩٥/٤.

ئەوەتا لە حودەیبیەدا ڕاوێژی بە ئوم سەلەمە ی خێزانی کرد و پێشنیارەکەشی جێبەجێکرد.[1]

بەدرێژایی ژیانی ئەم ڕێبازەی گرتەبەر و لەو ڕێگەیەوە توانی چەندەها گرفت و کێشەی سەخت ببەزێنێت. وا ئێمە لەم دواییەدا خەریکە لە بایەخی ڕاوێژ تێدەگەین لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا. تاکڕەو و خۆسەپێنەکان لەدوای خۆیان سەدان کێشە و قەیرانیان بەجێهێشتووە و بەو جۆرە ڕۆیشتوون. ئەوە پێغەمبەرمان بوو فێریکردین گەورەترین ڕێز و ئەرزش بۆ فیکر و ژیری دابنێین. دیارە ئەقڵ حیکمەتی وجودی خۆی هەیە، هەربۆیە بوونی داوەری ژیری و بیرکردنەوەش حیکمەتی خۆی هەیە. تەنانەت لەو کەسانەشدا کە سرووش پاڵپشتیان دەکات و لەو مەسەلانەشدا کە لەسەر بناغەی وەحی هاتوونەتە ئاراوە، دیسانەوە سەریان لێ دەدرێت و ڕۆڵی بەرچاو دەگێڕن لە لێکدانەوەی وەحیدا. بۆیە یەکێك لە بنچینەکانی شەرع ئەوەیە هەرکەس بێ بەش بوو لە ژیری و هەڵسەنگاندنی ئەقڵی بە موکەللەف و لێپرسراو دانانرێت.

## داخوازی و جێبەجێکاری

ڕەهەندێکی دیکەی کەسایەتیی پێغەمبەرمان بریتییە لە یەکێتیی نەزەر و قەدەم. چاوی گەیشتبێتە هەرکوێ و ڕوانینی ئاراستەی هەر جێیەك کردبێت، توانیویەتی پێ بنێتە ئەو جێگەیە و ئەو بیرۆکە و پلانانەی هەیبووە دەستبەجێ جێبەجێیان بکات. لەم ڕووەوە، شوێنکەوتە و یارانی بێ هیچ سەرسامی و دوودڵییەك فەرمایشتەکانیان خستووەتە زەمینەی کردارەوە.

## مەردی بەرنامەداری و پلانسازی

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا پلاندانان بووە بە یەکێك لە بابەتە هەرە گرنگەکان.

---

١. البخاري، شروط ١٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٤/ ٣٣٠.

هەرچی دەوڵەت و گەلانی دنیا هەن، لە هەموو شتێکدا بایەخی پێ دەدەن و بە یەکێك لە پایە گرنگەکانی هەستانەوە و پێشکەوتنی دەزانن و بەردەوام لەسەر زوبانیانە. بە پێچەوانەوە، نە گەشەسەندن ڕوودەدات، وە نە بووژانەوەیەکی هاوسەنگ.. بەڵێ، پلان و بەرنامەڕێژی تربەی دڵی کۆمەڵگەیە.

لە دیوێکیشەوە بە مەرجێکی سەرەتایی دادەنرێت بۆ کۆنترۆڵکردنی بونیاتی کۆمەڵگە. دیارە پێغەمبەری خوا نە کۆمپیوتەری هەبووە، وە نە دەستەیەکی پسپۆڕی پلاندانان. کەچی گەرماوگەرم و لە ساتی خۆیدا بڕیاری دەدا، ئەوجا هەنگاوی دەنا بۆ جێبەجێکردنی. لە کۆمەڵە پرس و بابەتێکی وەهادا بڕیاری دەدا، کە بابەتی سەد ساڵە و دووسەد ساڵە، بگرە دووهەزار ساڵەش بوون. وە لە هیچکام لەو پرسانەشدا گرفت یان گرێیەکی دوای خۆی بەجێنەهێشتووە. واتە لەدوای خۆی هیچ کەس نەیتوانیوە شتێك بڵێت پێچەوانەی فەرمایشتەکانی ئەو بێت. لەکاتێکدا -وەك پێشتریش لە سۆنگەیەکی ترەوە عەرزمکردن- ئەو بە ئەرکێکی قورسی وەك تەبلیغەوە نێردرابوو. بۆیە دەبوو لەم بابەتەدا بەجۆرێك هەنگاو بنێت تەنانەت میللیمەترێکیش چییە بواری ئەوەی تێدا نەبێت بگەڕێتە دواوە یان پاشەکشێی پێ بکرێت.

ورد و درشتی لایەنەکانی ژیانی شایەتی ئەو قسەیەی ئێمەن:

لە مەککەدا سومبولی ئارامگری و چاوەڕوانی بوو.. چاوەڕوانی لە دەستپێکی کاردا.. پۆشینی بەرگی "بزاوتی بێدەنگ"، هەروەك مەنگبوونی ئاوەکان کاتێك بەرەو قووڵایی دەچن. ڕەنگە فەرمانی هیجرەت لەو قۆناغەدا بە ڕاست و چەپدا؛ لەپاڵ پاڕاستنی لاواز و ئەوانەی توانای بەرگەگرتنیان نەبوو ڕێوشوێنێك بوویێت مەبەست لێی دوورخستنەوەی دەنگ و هەرا و هەر ڕواڵەتێك بوویێت کە ببوایەتە هۆی بزواندنی سەرنجی بەرامبەر، بەتایبەت لە سەردەمێکدا کە هاوسەنگی هێز لە ئارادا نەبوو.

بەڵام لە مەدینە بە لەبەرچاوگرتنی شێوازی بانگەواز و داخوازییە

هەنوکەییەکان و باڵانسی هێز، ڕێکارەکان ڕێڕەوێکی تریان گرتەبەر. لەڕاستیدا جیاوازی نێوان ستراتیژی سەردەمی مەککە و مەدینە و قۆناغەکانی دواتر، لە ئەنجامی داخوازیی گەشەسەندن و هاتنە کایەی پێکهاتەی نوێ و سروشتی سەردەمەکەوە بووە. هەلومەرجەکانی قۆناغی مەککە ئەوەی دەخواست بەو شێوازە مامەڵە بکرێت و قۆناغی مەدینەش پێویستی دەکرد شێوازێکی تر بگیرێتە بەر. خۆ ئەگەر پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە مەککەش هەروەك مەدینە ڕەفتاری بکردایە، ئەوا کەموکورییەکی گەورە دەبوو بۆ ئەو مەردە هەرە مەزنەی بواری بەنامەداری و پلانسازی کە لە هەموو کەموکورتییەك بەدوورە. کەموکورتی لە زاتێکدا کە کامڵکار و تەواوکارە، ئای خوایە ئەمە چ نامۆیی و ناباوێکە!.. بەڵێ، خوای باڵادەست ئەوی بۆ ئەوە نەناردبوو هەڵە بکات، بەڵکو ئەوی بۆ ئەوە ناردبوو تاکو بڕیاری ڕاست و دروست بدات و مرۆڤایەتی لە سەرسامی و شڵۆقی دەربازبکات.

## هەنگاوی بۆ دواوە نەناوە

بەڵێ، لە مەدینە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕێبازێکی تری گرتەبەر.. پێویستیش بوو هەروا بێت. هەر هەنگاوێکی بەرکوڵ و پێشەکی بووە بۆ هەنگاوی دواتر، هەنگاوی دواتریش -بە دڵنیاییەوە- ئاکام و بەرهەنجامی هەنگاوی پێشوو بووە. بە درێژایی ژیانی لە هیچ هەنگاوێکی نەگەڕاوەتەوە. ئاخر حەزرەتی محەممەد موستەفایەك کە تەنانەت شکستێکی وەك ئوحودیش دەگۆڕێت بۆ سەرکەوتن، چۆن لە هەنگاوەکانی پاشگەزدەبێتەوە؟ هەرگیز پاشگەزنەبووەتەوە و بە شوێنەوارەکانیشی هەردەم "محمد رسول الله"ی نەخشاندووە. شێوازی مامەڵەی لە مەسەلەی هیجرەتدا نموونەیەکی زیندووی ئەمەیە. چ کۆچی حەبەشە و چ کۆچی مەدینەش هەریەکەیان بوون بە دەروازەی ڕازئامێزی بانگەوازی هیدایەت و زنجیرەیەك فەتحی یەك لەدوا یەك.

## د- کێشەی چاوەڕوانکراوی ئەمڕۆ: پرسی نەژاد

پێغەمبەری سەروەرمان لە سەردەمی خۆیدا کۆمەڵە قەیران و کێشەیەکی وەهای چارەسەرکردووە کە هەنووکە هێشتا بێ چارەسەر ماونەتەوە. ئایندەی دوور و نزیك ئەوە کە هەر مەپرسە؛ بوخچەیەکە لە قەیران و نەهامەتی. بۆ نموونە یەکێك لە گەورەترین ئەو نەهامەتییانەی کە لە داهاتوویەکی دووردا بەرۆکی مرۆڤایەتی دەگرێت، ململانێی نێوان ڕەش پێست و سپی پێستە. ئەم کێشە مەترسیدارەی کە حاڵی حازر وەك تیر لەسەر کەوانێکی ڕاکێشراو لە بۆسەدایە، هەر لە ئێستاوە بووەتە مۆتەکەی ئەوانەی دەرکی پێ دەکەن.

دەپرسن بۆچی؟ ئاخر وێڕای ئەوەی لە دەروازەی سەدەی بیست و یەکەوە پێمان ناوەتە ژوورەوە، کەچی ئێستاش ڕەش پێست وەك ئینسان تەماشا ناکرێت. لە باشووری ئەفریقا مرۆڤەکان بەهۆی ڕەنگی پێستیانەوە دووچاری ئەشکەنجە و کۆیلایەتی دەبنەوە. لە فەرەنسا و ئەڵمانیاش سوکایەتییان پێ دەکرێت و کەرامەتیان ژێر پێ دەخرێت. کەچی دەبینین پێغەمبەر دەستی سۆز و میهری خستە سەر ئەو کێشەیە و چارەسەری کرد. بەڵێ، بەگوێرەی بنەماکانی پەیامەکەی، مرۆڤەکان وەك ددانەکانی شانە وان.[1] عەرەب فەزڵی بەسەر عەجەمدا نییە و عەجەمیش فەزڵی بەسەر عەرەبدا نییە.[2] تەنانەت ئەگەر کۆیلەیەکی حەبەشیش دەسەڵاتی گرتەدەست پێویستە گوێڕایەڵی بکرێت.[3]

لە بەرامبەر زرق و باقی بەیاننامە هاوچەرخەکاندا، تێگەیشتنێکی وەهای لە کۆمەڵگەدا بەرامبەر ئەم پرسە دروستکردووە، ئەوەتا کۆیلەیەکی ڕەش پێستی وەك بیلال مامەڵەی خانەدانی بۆ دەکرێت و خەلیفە عومەر لە بارەیەوە دەڵێت: "ئەبوبەکر گەورەمانە و گەورەی ئێمەشی -مەبەستی بیلالە- ئازادکردووە."[4]

---

١. دیلمی، مسند ٤/٣٠٠-٣٠١.

٢. أحمد بن حنبل، المسند ٥/٤١١.

٣. البخاري، أحكام ٤؛ مسلم، عمارة ٣٦-٣٧.

٤. البخاري، فضائل الصحابة ٢٣.

زەیدی کوڕی حاریسەش ڕەش پێست بوو. وەك کۆیلە درایە دەست پێغەمبەر.. بەڵام سەروەرمان ئازادی دەکات و دواتریش دەیکات بە کوڕی خۆی. ئەمە شۆڕشێکی هێندە مەزن بوو لە حەوسەڵەی مرۆڤی ئەو سەردەمەدا نەبوو. خانەدانترین و ڕێزدارترین کەسی ناو مرۆڤایەتی، کۆیلەیەکی ڕەش پێست دەکات بە کوڕ و میراتگری خۆی..[1] دواتریش کوڕی ئەم کەسە دەکات بە سەرکردەی سوپایەك کە خانەدان و نەسڵزادە گەلێکی هاوشێوەی ئەبوبەکر و عومەر و عەلی تێدا بوو.[2] زیاد لەوەش، خانمێکی نەجیب زادەی وەك زەینەبی -کە شیاوی ئەوەبوو هاوسەری پێغەمبەرێك بێت- لێ مارە دەکات.[3] بەها و ڕێزێکی وەهای دابوو بە زەید و ئوسامەی کوڕی، وەختێك عەبدوڵلای کوڕی خەلیفە عومەر لە باوکی دەپرسێ: "بابە گیان پێم ناڵێیت من چیم لە ئوسامە کەمترە وا مووچەی زیاتر دەدەیت بەو؟" پێشەوای باوەڕداران بەمجۆرە وەڵامی دەداتەوە: "کوڕی خۆم! من نازانم ئەو چی لە تۆ زیاترە یان تۆ چیت لەو کەمترە، بەڵام شتێك هەیە دەیزانم ئەویش ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) باوکی ئەوی لە باوکی تۆ و ئوسامەشی لە تۆ خۆشتردەویست. منیش لەبەر خاتری ئەو خۆشەویستییە ئوسامەم لەلا گرنگترە."[4]

بەڵێ، ڕووداوێکی چەندە ناوازە و مەزنە لە شوێنێکدا کە یەکێك لە نەجیبزادەکانی قوڕەیشی وەك جەعفەری کوڕی ئەبوتالیبی لێیە، زەیدی کوڕی حاریسە دەبێت بە سەرکردە و سالاری سوپا.[5] گرنگ لاف و گەزاف و پیتۆڵکاری مەسەلەکە نییە، گرنگ ئەوەیە بتوانی بە کردەیی جێبەجێیبکەیت.

تاکە ڕێگەچارەی پرسی ڕەش پێستەکان و بەرگرتن لەو شاڵاوە ترسناکەی

---

١. البخاري، مغازي ١٢؛ أبو داود، نكاح ٩؛ إبن حجر، الإصابة ٥٩٩/٢.

٢. إبن الجوزي، صفة الصفوة ٥٢١/١.

٣. إبن حجر، الإصابة ٦٠٠/٢.

٤. ترمزي، فظائل الصحابة ٢٣.

٥. البخاري، مغازي ٤٤؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢٩٩/٥.

کە ڕەنگە لە داهاتوودا مرۆڤایەتی پێ هەراسان بکەن، ئەوەیە کە بێ کات بەفیڕۆدان ئاشنایان بکەین بە بنەما بێ هاوتاکانی ئایینی ئیسلام. تا تیر لە کەوان دەرنەچووە هەرچۆنێك بووە پێویستە مرۆڤایەتی ئەم ڕێگەچارەیە تاقیبکاتەوە.

مرۆڤەکان بە ئازادی لەدایك بوون، کەسیش مافی ئەوەی نییە بیانکات بە کۆیلە و ئەو دەسەڵاتەی پێ نەبەخشراوە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴾

(الحجرات: ١٣)

"ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لەنێر و مێیەك دروستکردووە (کەباوکەئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بەچەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە.. بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانن کەزۆرتر لەخواترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زاناو ئاگایە بە هەمووان."

## هـ- جودەیبییە

با جارێکی تریش دووپاتی بکەینەوە: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) سەرکردەیەکی بێ وێنەی ئەوتۆ بوو ڕوانینی گەیشتبێتە هەرکوێ هەنگاوەکانیشی لەوێ بوون. لە جێبەجێکردنی هزرەکانیدا هاوتای نەبووە. دەتوانین چەندین نموونەی لە ژمارەبەدەر لەوبارەیەوە بهێنینەوە. بەڵام لێرەدا تەنها بە یەك نموونە دەست هەڵدەگرین.

ئیبن ئیسحاق دەگێڕێتەوە: لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا پێغەمبەر بەڵێنی دا بە

هاوەڵان بیانبات بۆ مەککە و عەمرەیان پێ بکات. عەمرەیەکی لەوجۆرە، هەم حەسرەتی چەندین ساڵەی سینەی کۆچبەرانی دەڕەواندەوە، هەمیش گڕوتینێکی تازەی دەبەخشی بە موسوڵمانان. بەم هەست و جۆشەوە پێغەمبەر بە یاوەری ١٤٠٠ لە یارانی ڕێی مەککەیان گرتەبەر.

پێشتر پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە مەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری و وەك ڕێکارێکی سەلامەتی کەسێکی لە هۆزی خوزاعە ناردبوو بۆ مەککە. هەڵبەتە قورەیش بێ ئاگابوون لەوەی کە ئەو کابرایە موسوڵمانە و سەروەرمان ناردوویەتی. پێغەمبەر هەواڵی پێگەیشت کە قورەیش هۆزەکانی عەرەبیان کۆکردووەتەوە و ڕێکەوتوون لەسەر ئەوەی ڕێگە نەدەن پێغەمبەر و موسوڵمانان بچنە ناو مەککەوە.

بەڵێ، قورەیش بڕیاریاندا نەهێڵن موسوڵمانان بچنە ناو مەککەوە، ئەگەرچی بگاتە ڕادەی بەکارهێنانی چەکیش، بڕیارەکەشیان وەك خۆی بردەسەر. جەنگاوەرەکانیان ناوچەی "بەلادین"یان داگیرکرد. مەفرەزەیەکی ٢٠٠ کەسیش بە سەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید و عیکرمەی کوڕی ئەبوجەهل گەیشتنە "کوراع الغمیم" کە جێگەیەك بوو لەنێوان رابیغ و جوحفەدا. کە ئەم هەواڵانە گەیشتنە پێغەمبەر خێرا فەرمانی دا بەرەو ئەو شوێنە بکەونە ڕێ. وەختێك خالید ئەم هەنگاوەی موسوڵمانانی بینی، بە پێویستی زانی یەکسەر بگەڕێتەوە بۆ مەککە و سەرانی قورەیش لە پێشهاتەکان ئاگاداربکاتەوە. لەم نێوەندەشدا پێغەمبەر و یارانی گەیشتنە حودەیبیە.[1]

حودەیبیە ناوی شوێنێکە دەکەوێتە خۆرئاوای مەککەوە و حەڤدە کیلۆمەتر لێوەی دوورە. پێشتر ناوی بیرێك بووە کە لەو ناوەدا هەبووە. دواتر ئەم ناوە بەسەر ئەو ئاوەدانییەشدا بڕاوە کە لە نزیك بیرەکەدا بووە.

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٤/٢٧٥-٢٧٦؛ إبن سعد، الطبقات الكبرى ٢/٩٥.

## ١. موعجیزەی ئاوەکە

لەو جێیەدا کە موسوڵمانان سرەوتیان گرتبوو تەنها بیرێك هەبوو ئەویش وشکی کردبوو. کار گەیشتە ئەوەی تینوێتی زۆریان بۆ بهێنێت. بۆیە گرفتەکەیان بردە خزمەت پێغەمبەر. ئەویش تیرێکی لە تیردانەکەی خۆی دەرهێنا و داوای لێکردن بیگرنە بنی بیرەکە. هەر ئەوەندەی تیرەکە دای لە بنی بیرەکە، یەکسەر بە خوڕەم ئاوی لێ هەڵقوڵی و دەستیکرد بە هەڵکشان. ئەمە جگە لە موعجیزەیەکی پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هیچی تر نەبوو! خوای خاوەن توانستی ڕەها لە کات و زەمینەیەکدا کە هاوەڵان لەوپەڕی ئاتاجیدا بوون، لەسەر دەستی پێغەمبەرەکەی موعجیزەیەکی تری خستە پێشچاویان. هەموو لەو ئاوەیان خواردەوە و دەستنوێژیان لێگرت و کوندە و گۆزەکانیان لێ پڕکرد، ئیتر بەو شێوەیە کێشەی بێ ئاوی نەما.[١]

## ٢. نێرراوەکان

هێشتا هۆزی خوزاعە موسوڵمان نەببوون، بەڵام لەگەڵ موسوڵمانان هاوپەیمان بوون. کاتێك بیستیان خەڵکی مەککە خۆیان سازداوە بۆ جەنگ، بەپەلە شاندێکیان نارد بۆ مەدینە و پێغەمبەریان لە ڕەوشەکە ئاگادارکردەوە. بودەیلی کوڕی وەرقا یەکێك بوو لە ئەندامانی شاندەکە. ئەم پیاوە دوای فەتحی مەککە موسوڵمان ببوو. پێغەمبەر متمانەیەکی زۆری پێی بوو بۆیە ناردی بۆلای قوڕەیش تاکو پێیان ڕابگەیەنێت کە ئەو بۆ جەنگ نەهاتووە، بەڵکو تەنها مەبەستی ئەنجامدانی عەمرەیە.

بودەیل چوو بۆ مەککە و پەیامەکەی پێغەمبەری پێگەیاندن. عورووەی کوڕی مەسعودی سەقەفیش لەناو گوێگراندا بوو. قسەکانی بەلاوە مەنتقی بوو. بۆیە پێشنیازی کرد بینێرن بۆلای پێغەمبەر تاکو دانوستانی لەگەڵدا بکات، ئەوانیش ڕازی بوون.[٢]

---

١. البخاري، شروط ١٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٢٩/٤؛ ابن هشام، السيرة النبوية ٢٧٧/٤.

٢. البخاري، شروط ١٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٢٣/٤-٣٢٤.

## ٣. دڵەکان دەگۆڕێن

عوروە هات بۆ لای پێغەمبەر و دەستیکرد بە گفتوگۆ، وەك نەریتێکی باوی ناو عەرەب لەکاتی گفتوگۆدا ویستی دەست بۆ ڕیشی موبارەکی بەرێت. لەو کاتەدا زللەیەکی بەهێز درا بە دەستی عوروەدا. خاوەنی ئەو زللەیەش موغەیرەی کوڕی شوعبەی برازای بوو. ئەوەبوو پێی وت: "بەو دەستە پیسانەت دەست لە ڕیشی پاکی پێغەمبەری خوا نەدەی. جارێکی تر وابکەی دەستت لێ دەکەمەوە!" عوروە لەتاو سەرسامی هیچی پێ نەدەوترا. مەگەر ئەو نەبوو چەند مانگێك پێشتر خوێنبایی قەتڵێکی موغەیرەی دابوو؟ ئەو گۆڕانکارییە گەورەیە چی بوو بەسەر برازاکەیدا هاتبوو؟ جگە لەوە، عوروە بە چاوی خۆی بینی کە چۆن هاوەڵان وەك پەروانە بەدەوری پێغەمبەردا دەسووڕێنەوە. لە گەڕانەوەیدا بۆ مەککە، سەرسامیی خۆی بەمجۆرە دەربڕی:

"تاوەکو ئێستا چەندین کیسرا و قەیسەر و نەجاشیم دیوە. بەڵام پەیوەندی هیچ کامیان بە دەوروبەریانەوە وەك پەیوەستی و هۆگریی هاوەڵانی محەممەد نییە بە محەممەدەوە. پیاوی چاك بن وەرن گوێ بۆ من بگرن و وازی لێ بهێنن!"

گفتوگۆکە بێ ناکام دەرچوو.[1] بۆیە ئەمجارە سەروەر بە وشترەکەی خۆی خیراشی کوڕی ئومەییەی خوزاعی نارد بۆ لایان. بەڵام قوڕەیش هێرشیان کردە سەر، ئەوەبوو وشترەکەیان سەربڕی و ویستیان خۆشی بکوژن. بەڵام هەرچۆنێك بێت هۆزێك کە هاوپەیمانی هەبوو لەنێوانیاندا فریایکەوتن و پەنایان دا.[2]

## ٤. عوسمان، نێرراوی پێغەمبەر

زۆر پێویست بوو دوای ئەم پێشهاتە نێرراوێکی تر بنێررێت بۆلای قوڕەیش. لەسەرەتاوە پێشنیاری حەزرەتی عومەر کرا، بەڵام ئەو لە مەککە دوژمنی زۆر

---

١. البخاري، شروط ١٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٢٤/٤.

٢. أحمد بن حنبل، المسند ٣٢٤/٤.

بوو و دۆستیشی نەبوو. بۆیە گومان دەکرا ناردنەکەی لە بەرژەوەندی گفتوگۆکان نەشکێتەوە. بۆیە وەختێك حەزرەتی عومەر ڕای خۆی لەوبارەیەوە دەربڕی، بڕیاردرا حەزرەتی عوسمان بنێرن.[1]

قورەیشیەکان یەکسەر حەزرەتی عوسمانیان گرت و لە زینداندا توندیان کرد. لەو نێوەندەدا دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە کە کوشتویانە. دواکەوتنی گەڕانەوەکەشی ئەگەری دەنگۆکەی بەهێزتر کرد. بەوهۆیەوە پێغەمبەر (صَلَّىٰ‌اللَّهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ) بانگی موسوڵمانانی کرد بۆ بەیعەتدان. خۆی لەژێر دارێکدا دانیشتبوو ئەوانیش پۆل پۆل دەهاتن و بەیعەتیان دەدایە.[2] دواتر ناوی "داری رضوان" لەو درەختە نرا. بەو بەیعەتەش دەوترێت بەیعەتی رضوان. درەختەکە لە سەردەمی خەلافەتی حەزرەتی عومەردا بڕرایەوە، چونکە لەوە دەترسا پیرۆزی بدرێتە پاڵ.[3]

## ٥. بەیعەت لەسەر مردن

هەرکە موسوڵمانان سەدای بەیعەتیان بیست هەموو وەك تیر لە شوێنی خۆیان ڕاپەڕین. هەتا مردن بەیعەتیان لەسەر هەموو شتێك دا.[4] چونکە لەو ساتەوەختانەدا بەیعەت تەنها بۆ مردن دەدرا. بەڵێ، هەر هەموویان بە گوڕوتینەوە بەرەو لای پێغەمبەر (صَلَّىٰ‌اللَّهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ) ڕایانکرد و دەستیان گوشی، تەنها نیوە مرۆڤێك نەبێت.[5]

تەنها یەك کەس مابوو بەیعەت نەدا، ئەویش لە مەککە بوو و نەدەزانرا ماوە یان نا. ئا لەو ساتانەدا پێغەمبەر لە یەکێك لەو چرکەساتانەدا دەژیا کە سنوورەکانی

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ٣٢٤/٤.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ٢٨٣/٤.

٣. إبن سعد، الطبقات الكبرى ١٠٠/٢.

٤. البخاري، جهاد ١١٠؛ مسلم، الإمارة ٨٠.

٥. إبن هشام، السيرة النبوية ٢٨٣/٤.

زەمان و مەکانی تەی دەکرد. دەتوت کات و شوێن لەبەردەمیدا پێچراونەتەوە. لە حاڵەتێکدا بوو وەك بڵێی دەستی حەزرەتی عوسمانی دوورە دەستی گرتبێت وەهابوو. ئەوەبوو دەستی چەپی بەرزکردەوە و فەرمووی: "ئەمە دەستی خۆمە." بەدوایدا دەستی چەپیشی بەرزکردەوە و فەرمووی: "ئەمەش دەستی عوسمانە." ئەوجا هەردوو دەستی خستە ناو یەك و فەرمووی: "ئێوە بەشایەت بن وا من لە جێگەی عوسمان بەیعەت دەدەم."[١]

ئەوە چ بەیعەتێکی پیرۆزە وا پێغەمبەری خوا خۆی وەکالەتی دەکات..!

دۆخەکە زۆر ترسناك بوو.. هەمووان لە جۆرە هەڵچوونێکی دەروونیدا دەژیان. دەمارەکان گرژ ببوون و هاوەڵان ئەوەندە تینیان سەندبوو وەخت بوو شەق بەرن.. ئەوە تەنها پێغەمبەری خوا بوو کە هاوسەنگی و میانڕەوی خۆی هیچ تێکنەدابوو. ئەگەرچی ناخی وەك گڕکان دەکوڵا، بەڵام بە ئیرادە دەراساکەی دەیتوانی ڕێگری لە تەقینەوەی ئەو گڕکانە بکات و نەهێڵێت پریشکی ئاگرینی بەملا و ئەولادا بڕوات. ئای خوایە، ئەمە چ ئیرادەیەکی پۆڵایینە..!!

## ٦. "کارەکە ئاسان بوو"

ڕێك ئا لەو دۆخە ئاڵۆز و تەنگژاویەدا پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) تەپوتۆزی سوارێکی لە دوورەوە بەدی کرد بەرەو لایان دەهات. پاش کەمێك لەناو تەپوتۆزەکەدا سوهەیلی کوڕی عەمر دەرکەوت. حەزرەت سوهەیلی باش دەناسی، بەوانەی دەوروپشتی فەرموو: "ئیدی کارەکە ئاسان بوو. جگە لە ڕێککەوتن قوڕمیش هیچی تری لەدەست نایەت."[٢]

تۆ بڵێی پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە وشەی "سوهەیل"ەوە واتای ئاسانکاری و گەشبینی هەڵهێنجابێ؟ ئەوە باسێکی ترە، بەڵام بڕوانن چەندە مرۆڤناس بووە و

---

١. البخاري، فضائل الصحابة ٧؛ترمزي، مناقب ١٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ١/٥٩.

٢. البخاري، شروط ١٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٤/٣٣٠.

چۆن ناسیوونی. ئەوەتا هەر کە چاوی بە سوهەیل دەکەوێت، یەکسەر ئەنجامەکەیان پێ دەڵێت. ڕاستە کە عوروەشی بینی فەرمووی قوڕەیش ڕێککەوتنیان دەوێت، بەڵام ئەو بۆچوونە لەگەڵ ناردنی سوهەیلدا یەکلایی بووەوە. ڕووداوەکانیش پێشبینینی و خەملاندنەکەی پێغەمبەریان پشتڕاست کردەوە، چونکە سوهەیل بە ڕاشکاوی رایگەیاند کە بۆ ڕێککەوتن هاتووە. لە بنەڕەتدا پێغەمبەریش ڕێککەوتنێکی لەو جۆرەی دەویست.

## ٧. ڕێککەوتن

هەرچەندە لە یەکەم ڕوانینندا وا دەردەکەوت کە بەندەکانی ڕێککەوتنەکە لە بەرژەوەندی موسوڵمانان نەبێت، بەڵام قورئانی پیرۆز لە ڕوانگەی دەرەنجامەکەیەوە بە فەتح ناوی دەبات.[1]

سوهەیل چەندە سازشی زیاتری بە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بکردایە ئەوەندە خۆی بە سەرکەوتوو لە قەڵەم دەدا. بۆیە سڵی نەدەکردەوە لەوەی بچووکترین مەسەلەش بهێنێتە ئاراوە و قسەی خۆی لەسەر بکات. بۆ نموونە؛ هەر لە دەستپێکی ڕێککەوتنەکەوە ڕەخنەی لە بڕگەی "بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ" گرت و پێداگری کرد لەسەر ئەوەی کە دەبێت لە شوێنیدا بنووسرێت: "بِاْسْمِكَ اللّهمّ" پێغەمبەریش داواکارییەکەی پەسەندکرد.

ڕەخنەی دووەمی سوهەیل پەیوەندی بە دەستەواژەی "رسول الله"وە هەبوو. ئەوەبوو وتی: "ئەگەر ئێمە پێغەمبەرێتی تۆمان پەسەند بکردایە، پێویستمان بە ڕێککەوتن نەدەبوو." پێغەمبەری خواش بە حەزرەتی عەلی فەرموو: کە نووسەری کلێشەی ڕێککەوتننامەکە بوو "ئەو وشەیە بسڕێتەوە و لە جێگەیدا بنووسێت "محەممەد کوڕی عەبدوڵڵا"." بەڵام ئەم داواکارییە لەسەر دڵی حەزرەتی عەلی گەلێك گران بوو بۆیە تۆزێك وەستا و حەزی بە سڕینەوەی دەستەواژەی "رسول الله"

١. قرطبي، الجامع الأحكام القرءان ١٦/٢٥٩-٢٦٠؛ البخاري، جزية ١٨؛ مسلم، جهاد ٩٤.

نەدەکرد. لەبەرئەوە پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە دەستی خۆی ئەو دەستەواژەیەی سڕیەوە و نووسی "محەممەد کوڕی عەبدوڵلا"، یاخود بە حەزرەتی عەلی نووسی.

هەر بەندێك لە بەندەکانی ڕێککەوتننامەکە مشتومڕی درێژخایەنی بەدوای خۆیدا هێنا. هەرکاتێك داواکارییەکی سوهەیل تۆمار نەکرایە، دەیوت من واژووی لەسەر ناکەم. پێغەمبەریش سەرەڕای ڕووکەشی ترسناکی ڕێککەوتنەکە، لە سۆنگەی ئەو دەرەنجامە مەزنانەوە کە لە داهاتوودا لێی دەکەوتەوە، بەڵێی بۆ زۆرێك لەو داواکارییانە دەکرد.

بەگوێرەی ڕێککەوتنەکە:

١. دەبوایە موسوڵمانان ئەمساڵ بگەڕێنەوە و زیارەتی مەککە نەکەن.

٢. زیارەتەکەیان بخەنە ساڵێکی تر، ماوەکەشی تەنها سێ ڕۆژ بێت.

٣. نابێت هیچ جۆرە کەرەستەیەکی جەنگ لەگەڵ خۆیان بهێنن، جگە لەو شمشێرەی کە وەك نەریتێکی باو دەیبەستن. ئەویش دەبێت لەناو کێلاندا بێت..

٤. هەرکەسێك بیویستایە لە مەککەوە بڕوات بۆ مەدینە، ئەوا وەرنەدەگیرا. بەڵام بە پێچەوانەوە، ڕێگری لەوانە نەدەکرا کە دەیانویست لە مەدینەوە بچن بۆ مەککە. واتە ئەگەر کەسێکی موسوڵمان بڕۆشتایە بۆ مەدینە و پەنای پێ بگرتنایە، دەبوایە ئەو کەسە یەکسەر ڕادەستی قوڕەیش بکرایەتەوە.

٥. هۆزە عەرەبەکان سەرپشکن لەوەی چ لایەنێك هەڵدەبژێرن بۆ هاوپەیمانی.[١]

## ٨. حەزرەتی عومەر و شۆکی حودەیبیە

بە چاوخشاندنێکی ڕاگوزەرانە بە ڕێککەوتنەکەدا وا دەردەکەوێت کە تەواوی بەندەکانی دژی موسوڵمانان بن. بەتایبەت ئەو بڕگەیەی کە باسی

١. البخاري، شروط ١٥؛ مسلم، جهاد ٩٠-٩٢؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٢٥/٤.

لە رادەستکردنەوەی ئەو موسوڵمانانە دەکرد کە لە دەست ستەم و ئەشکەنجەی بتپەرستانی قورەیش بەرەو مەدینە هەڵدەهاتن. ئەم بڕگەیە دڵی موسوڵمانانی هەژاند، بەتایبەت حەزرەتی عومەر لە تووڕەییدا ئاگری گرتبوو. بەو حاڵەوە ڕۆیشت بۆلای پێغەمبەر و عەرزی کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا مەگەر تۆ پێغەمبەری خوا نیت؟" سەروەرمان بگرە لەو ساتەوەختەشدا هێمنیی خۆی تێك نەدا و بەوپەڕی لەسەرخۆییەوە وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە:

- بەڵێ، من پێغەمبەری خوام.
- ئەی ئێمە لەسەر ڕێبازی حەق نین؟
- بەڵێ وایە، ئێمە لەسەر حەقین.
- ئەی ئەوانە بتپەرست نین؟
- بەڵێ، ئەوان بتپەرستن.
- دەی کەوایە ئەم سەرشۆڕییە بۆ قەبووڵ بکەین؟
- من بەندە و پێغەمبەری خوام، هەرگیز لە فەرمانی لانادەم.
- ئەی تۆ نەتفەرموو کە زیارەتی کەعبە دەکەین؟
- بەڵێ وتم، بەڵام نەموت ئەمساڵ..

حەزرەتی عومەر دڵی ئاو ناخواتەوە و دەچێتە لای حەزرەتی ئەبوبەکر و هەمان پرسیار لەویش دەکاتەوە. ئەویش بە هەمان شێوەی پێغەمبەر وەڵامی دەداتەوە.

دواتر هەرکات حەزرەتی عومەر ئەم ڕووداوەی بیردەکەوتەوە، پەشیمانی دەیگرت و داخی زۆری بۆ دەخوارد.. کێ دەزانێت لەو پێناوەدا چەندە خێر و خێراتی کردووە و چەندە ڕۆژووی گرتووە و چەندێکیش داوای لێخۆشبوونی لە پەروەردگار کردووە! بەڵێ، حەزرەتی عومەر هەزاران جار پەشیمان بوو لەوەی کە وتبووی..[1]

---

١. البخاري، شروط ١٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٢٥/٤.

## ۹. ئەبو جەندەل

با بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان: لەو سەروبەندەدا ئەبو جەندەلی کوڕی سوهەیل کە تازە بەتازە هاتبووە ناو ئیسلامەوە، بەخۆی و کۆت و زنجیرەکانی پێیەوە، کە بەدوای خۆیدا ڕایدەکێشان، دەرکەوت و بووە ئەو دوایین دڵۆپەی کە جام سەرڕێژ دەکات. ئەبو جەندەل بە شەکەتی هات و خۆی فڕێدایە بەردەم پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). هیچ کام لە هاوەڵان لە ئاست ئەو دیمەنەدا خۆیان بۆ ڕانەگیرا و دەستیان کرد بە گریان. سوهەیل ئەم هەلەی قۆستەوە و یەکسەر وتی: "یەکەم مەرج بۆ کارپێکردنی ڕێککەوتننامەکە ئەوەیە کوڕەکەم بدەنەوە."[1]

ئەو هاوار و ناڵانەی لەو ساتەدا بەرزبوونەوە ڕێك لە ناڵە و فیغانی دایکێك دەچوون کە جگەرگۆشەکەی ون کردووە. پێغەمبەری خواش فرمێسکەکانی بۆ ڕانەدەگیرا. زۆر تکایان لە سوهەیل کرد، خۆ هێشتا مەرەکەبی ڕێککەوتنەکە وشك نەبووەتەوە، با ئەبو جەندەل بەخشراو بێت. بەڵام سوهەیل هیچ کام لەو داواکارییانەی پەسەند نەکرد و سووربوونی خۆی دووپات کردەوە. بەڵێ، پێغەمبەر بەچاوی پڕ ئەسرینەوە ئەبو جەندەلی گەڕاندەوە. بەڵام مزگێنی دەرووی نزیکی پێدا و فەرمووی: "ئەی ئەبو جەندەل، ئارام بە و دان بەخۆتدا بگرە، لە داهاتوویەکی نزیکدا خوای باڵادەست دەرگای ڕزگاربوون بۆ تۆش و ئەوانەش کە وەك تۆ وان، دەکاتەوە."[1] ئەوەبوو فەرمایشتەکەی پێغەمبەر وەك خۆی هاتەدی.[2]

## ۱۰. ئەبو بەصیر و هاوەڵەکانی

ڕاستەوخۆ دوابەدوای ڕێککەوتنی حودەیبیە، عوتبەی کوڕی ئەسید، کە نازناوی ئەبو بەصیر بوو لە مەککە هەڵهات و پەنای بردە بەر پێغەمبەر لە مەدینە. قوڕەیش دوو پیاویان نارد تاکو ئەبو بەصیر بگەڕێننەوە. پێغەمبەر ئەویشی تەسلیم

---

۱. أحمد بن حنبل، المسند ٤/٣٢٥-٣٢٦؛ إبن هشام، السيرة النبوية ٤/٢٨٧.

۲. البخاري، شروط ١٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٤/٣٣١؛ إبن هشام، السيرة النبوية ٤/٢٩٢-٢٩٣.

کردنەوە. بەڵام لە ڕێگەدا ئەبو بەصیر یەکێك لە دوو پیاوەکە دەکوژێت و ئەوی تریشیان بە زەحمەت لە دەستی هەڵدێت.

ئەبو بەصیر دووبارە هاتەوە خزمەت حەزرەت و وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا تۆ پەیمانی خۆتت بردە سەر، منت تەسلیم بەوان کردەوە، پاشان خوا منی ڕزگار کرد. لە بەرامبەردا سەروەری جیهانیان فەرمووی: "پێغەمبەر بۆی نییە لە بەڵێنی خۆی پاشگەز ببێتەوە." ئەمەی وت و قەبووڵی نەکرد لە مەدینە بمێنێتەوە. بۆیە ئەبو بەصیر مەدینەی جێهێشت و ڕووی کردە جێیەك کە پێیان دەوت "سیف البحر" و نزیکی "ذی المروة" بوو. ئیتر لەوێ نیشتەجێ بوو. جا کە موسوڵمانە چەوساوەکانی مەککە هەواڵی ئەم پەناگەیەی ئەبو بەصیریان بیست، یەکە یەکە هەڵهاتن و هاتنە لای ئەبو بەصیر.. ئەمەش خەونی لە قوڕەیش زڕاند. ئەبو بەصیر و هاوەڵانی ببوونە مەترسی و کۆسپێکی گەورە لەڕێی ئەو کاروانە بازرگانییانەی مەککە کە بەوێدا گوزەریان دەکرد.

ئەوەبوو دواجار مەککەییەکان بەپێی خۆیان هاتنە خزمەت پێغەمبەر و داوایان لێکرد کە ڕێ بە مانەوەی ئەو موسوڵمانانە بدات لە مەدینەدا. بەم شێوەیە، ئەو بەندەی کە ناخۆشترین و گرانترین بڕگە بوو بەلای موسوڵمانانەوە، هەر لە لایەن ئەو کەسانە خۆیانەوە لابرا کە پێداگرییان لەسەر نواندبوو. دیارە ئەمەش سەرکەوتنێکی ئاشکرا بوو بۆ بەرەی ئیمان.[1]

لە دەمی گەڕانەوەیان لە حودەیبیە سورەتی "الفتح" دەستی بە نازڵبوون کرد. سورەتەکە ڕێککەوتننامەکە بەوە وێنا دەکات کە سەرکەوتنێکی ئاشکرایە.[2]

پێغەمبەری خوا زۆر خۆشحاڵ بوو. چونکە ئەو شتانەی بیری لێکردبوونەوە لە وەرزی خۆیدا یەك بەیەك دەهاتنە دی. لەڕاستیدا ئەو تۆوەکانی ئەم سەرکەوتنەی

١. البخاري، شروط ١٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٣١/٤؛ إبن هشام، السيرة النبوية ٢٩١/٤-٢٩٣؛ إبن حجر، فتح الباري ٤٤٨/٥-٤٥١.

٢. البخاري، جزية ١٨؛ مسلم، جهاد ٩٤؛ إبن هشام، السيرة النبوية ٢٨٩/٤.

لە حودەیبییەدا چاندبوو بەڵام ئەوەتا ئێستا سەر دەردەهێنن و خونچە دەکەن. لەولاشەوە لاوە خوێنگەرمە پاڵەوانەکانی گردەکەی "سیف البحر" وەك ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر (صَلَّیَ اللّٰهُ عَلَیۡهِ وَسَلَّمَ) لە ڕێگەی "ثنایات الوداع"ەوە هاتە ناو شارەوە، ئاوەها دەهاتنە مەدینەوە. خەڵکی مەدینە، لە پێش هەمووشیانە پێغەمبەری خوا بە سرودی "ثنایات الوداع"ەوە پێشوازییان لێ دەکردن. بتپەرستە بەدبینەکانیش بە دەستی خۆیان مەرجەکانی خۆیانیان هەڵوەشاندەوە.

پاش ماوەیەك بتپەرستەکان دەستدرێژییەکی نامەردانە دەکەنە سەر یەکێك لەو هۆزانەی کە لەگەڵ پێغەمبەر هاوپەیمان بوون. ئیدی بەم شێوەیە بە یەکجاری پەیمانی خۆیان دەشکێنن.[1] پێغەمبەریش بەرەو مەککە دەکەوێتە ڕێ و ئەو فەتحە مەزنە بەئەنجام دەگەیەنێت کە لە حودەیبییەدا بناغەی بۆ داڕێژرابوو.

## و- دەستکەوتەکانی حودەیبییە

مەبەستمان لە درێژەدان بە وردەکارییەکانی ئەم ڕووداوە، ڕێخۆشکردن بوو بۆ لایەنێکی زۆر گرنگ، کە ئەویش دەستکەوتەکانی ڕێککەوتنەکەیە. دەستکەوتەکانی حودەیبییە چین؟ ڕاستە پێغەمبەری خوا ڕێککەوتنێکی ئەنجام دا، بەڵام سوودەکانی بۆ موسوڵمانان چی بوون؟

### ١. بەرەو ئیسلام دێن

پێش هەموو شتێك لە ماوەی ڕێککەوتنەکەدا شمشێری ئیسلام، خالیدی کوڕی وەلید موسوڵمان بوو.

خالید کەسێك نەبوو لە جەنگدا بەچۆکدا بهێنرێت.. نەشدەبوو وا بێت... هەتا ئەو هەستی خۆ بەزلزانینەی کە دواتر دەگۆڕا بۆ سەروەری ئیسلام لە خالیددا هەبووایە، مەحاڵ بوو بە زەبری شمشێر بێتە ناو ئیسلامەوە. جگە لەمە، خوای

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٤٢/٥.

میهرەبان بە لوتفی خۆی ئەم سەرکردە بێ وێنەیەی ئایندەی پاراست و زەمینەی بۆ سازاند تاکو بە عیززەتی خۆیەوە بێتە ناو ئیسلامەوە. دەی ئەگەر ماوەیەکی ئاشتەوایی لەوجۆرە نەبوایە، شەختەی دڵی خالید چۆن بتوایەتەوە!

وەختێك کارێك نەما لە مەککە خۆی پێوە سەرقاڵ بکات، خالید، بەڵێ ئەو مرۆڤە شەڕانییە، هەر هیچ نەبێت کەمێك دەرفەتی بیرکردنەوەی بۆ هەڵکەوت. ستەملێکراویی ڕواڵەتییانەی موسوڵمانان لە حودەیبییەدا و حاڵ و هەڵسوکەوتیان لە ساڵی دووەمدا کە هاتن بۆ ئەنجامدانی عەمرە، بە قووڵی کاریگەرییان لەسەر خالید و هاوشێوەکانی خالید بەجێهێشت. بەڵێ، ئەو ماوەیە بۆ ئەو بووە ماوەی هەڵوێستەکردن. ئەوەندەشی پێنەچوو هاتە خزمەت پێغەمبەر و موسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند.[1] بەرویبوومی ئەم تەسلیم بوونەشی ئەوەبوو بوو بە "شمشێری خوا". جا خۆ پێغەمبەریش هەر ئەو ئەنجامەی لێ چاوەڕێ دەکرد.

عەمری کوڕی عاصیش یەکێکی تر بوو لەوانەی لەو ماوەیەدا موسوڵمان بوو.[2] ئەو ژیانە یەك ڕەنگ و دووبارەبووەی کە دوای ڕێککەوتنی حودەیبیە هاتە ئاراوە، ئەو پاڵەوانانەی مەیدانی جەنگی تووشی بێزاری کرد. بۆیە بەرەی بزاوت و جموجووڵیان هەڵبژارد و چوونە لای پێغەمبەری خوا...

عوسمانی کوڕی تەڵحەش یەکێك بوو لەو پیاوە مەزنانەی کە لەو ماوەیەدا دەست ئیسلام کەوت. بەدرێژایی ژیانی هەڵگر و پارێزەری کلیلەکانیماڵی خوا بووە. دواتریش پێغەمبەر (صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) کلیلەکانی هەر ڕادەستی ئەو کردووەتەوە.[3] ئەو کەسایەتییانەی لەسەرەوە ناومان بردن، کەسانێك بوون بە زرنگی سیاسی و سەربازیی خۆیان شکستیان بە چەندین لەشکر هێنابوو. وەك دەبینین ئەم کەسانە لە کەشی نەرمونیانی سەردەمی ئاشتەواییدا توانییان خۆیان بدۆزنەوە.[4]

---

١. إبن سعد، الطبقات الكبرى ٢٥٢/٤؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٢٤٠/٤.

٢. طبري، تأريخ الأمة و الملك ١٤٦/٢؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٢٣٨/٤.

٣. إبن سعد، الطبقات الكبرى ١٣٧/٢؛ إبن حجر، الإصابة ٣٧١/٣.

٤. إبن سعد، الطبقات الكبرى ٢٥٢/٤؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٢٣٨/٤.

## ٢. بۆ کەس نییە کەعبە پاوان بکات

قورەیش تا ئەو ڕۆژگارەش خۆیان بە زل دەزانی و دەیانوت: "ماڵی خوا هی ئێمەیە." و نەیاندەهێشت کەس بە ئاسانی نزیکی بکەوێتەوە. هەرکەس بهاتایە دەبوو باج بدات ئەوجا زیارەتی بکات. ئەگینا زیارەتی کەعبە شتێکی مەحاڵ بوو.

ئەمە لەکاتێکدا لە ڕێککەوتنی حودەیبیەدا باسی ئەو مەرجی باج و خەراجە نەکرابوو. ئەوەش بۆخۆی هەڵەیەکی گەورە و فەرامۆشییەکی بارگران بوو بۆ قورەیش. چونکە کە ساڵی دواتر موسوڵمانەکان بێ ئەوەی باج بدەن تەوافیان بەدەوری کەعبەدا کرد[١]، هۆزەکانی دیکەش بێداربوونەوە و تێگەیشتن کە قورەیش تاکە خاوەنی کەعبە نییە. ئەگینا چۆن موسوڵمانەکان لە مەدینەوە دێن و بێ ئەوەی سەرانە بدەن تەوافی کەعبە دەکەن؟ کەوابێت بۆ ئەمانیش خاوەنی ئەو مافە نەبن؟

ئەمە ببووە باس و خواستی سەر زار و لە هەموو شوێنێك باس لەوە دەکرا کە قورەیش تاکە خاوەنی کەعبە نین. بۆیە لە ساڵانی دواتردا هەرکێ بیویستایە بێ هیچ کۆسپێك دەهات و زیارەتی ماڵی خوای دەکرد.

## ٣. خزمەت لە کەشی ئاشتەوایدا دەکرێت

یەکێك لە بەروبومەکانی حودەیبیە بەرقەراربوونی ئاشتی و ئاسایش بوو. چونکە بۆ ماوەی دە ساڵ لە سەرئێشەی قورەیش ڕزگاریان بوو. شایانی باسە ئەو ماوەیە سەبارەت بە موسوڵمانان زۆر گرنگ بوو. پێغەمبەری سەروەر دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخسا ئەو شاگرد و قوتابییانەی پێیگەیاندبوون، ڕەوانەی چەندین ناوچەی جیاواز بکات. ئەمەش واتای گەیشتنی دەنگی بانگەوازی ئیسلام بوو بە تەواوی دوورگەی عەرەبی.

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ١٢/٤.

بەڵێ، دەنگی زوڵاڵی قورئان لە هەموو شوێنێکەوە دەستی بە بەرزبوونەوە کرد، خەڵکیش بە پەلە دەهاتن و وەڵامی بانگەوازی ئیسلامیان دەدایەوە. ئەو تابلۆیەی کە قورئانی پیرۆز بە:

﴿يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا﴾ (النصر: ٢)

"پۆل پۆل دێنە ئایینی پەروەردگارەوە."

مژدەی هاتنەدی دەدا، هەر ئەم تابلۆیە بوو. دە ساڵ واتە پێگەیشتنی نەوەیەکی نوێ. لەولاشەوە قورەیش بێئاگابوو لەوەی کە چ هەلێکی زێڕینی پێشکەش بە موسوڵمانەکان کردووە. خۆ ئەگەر درکیان پێبکردایە، ئەوا هەرگیز توخنی کارێکی وەها نەدەکەوتن. موسوڵمانەکان ئەو ماوەیان بە هەل زانی تاکو لە ڕووی چەندێتی و چۆنێتییەوە برەو بە خۆیان بدەن. ئەوانەی تازە موسوڵمان دەبوون، لە لایەکەوە ئومێد و لە لایەکی تریشەوە هێز و توانای سەربازیی موسوڵمانانیان زیاد دەکرد. بۆیە ئەو ڕۆژەی موسوڵمانان بەم هێزەوە دەچوونە بەر دەرگای مەککە، قورەیش هیچی پێ نەدەکرا.

## ٤. لە ئاشتەوایدا ئیسلامیان ناسی

یەکێکی تر لە دەستکەوتەکانی حودەیبیە ئەوەبوو تا ئەوکات هاتوچۆ لەنێوان ئەو دوو لایەنەدا نەبوو. یەکتر بینین و ڕووبەڕووبوونەوەکانیان هەمیشە لە مەیدانەکانی جەنگدا بوو کە تیایدا قسە هەر قسەی شمشێر بوو. لە گەرمەی سایکۆلۆجیای جەنگیشدا مەحاڵ بوو ڕاستییەکانی ئیسلام بە لایەنی بەرامبەر بگەیەنرێت. کاتێکیش ڕێککەوتن قەتماغەی بەست، سەردانەکان لەنێوان هەردوولا دەستیان پێکرد. ئەوانەی کە هیچیان دەربارەی جوانییەکانی ئیسلام نەدەزانی، لە ئەنجامی سەردانیان بۆ مەدینە وردە وردە ئاشنا دەبوون و سەرسامیی خۆیان دەردەبڕی.. ژیانی مەدینە جیاوازی نەبوو لەگەڵ ژیانی بەهەشت.. ئەوەی

چاوی پێدەکەوت شەیدای دەبوو. دەستنوێژ، بانگ، نوێژی جەماعەت، خشوع و ملکەچی ناو نوێژ، هەموو ئەمانە دڵی خەڵکی مەککەیان بە سەرسامییەوە بەرەو لای خۆیان ڕادەکێشا. لە سایەی ڕێککەوتنی حودەیبییەوە هیچماڵێك نەما دەنگی ئیسلام و پەیامی قورئانی پێ نەگات. خۆ ئەگەر ئەبو جەهل هەتا ئەو ڕۆژە بمایە، ئەوا لەناو خانەوادەکەیدا بەس خۆی دەمایەوە. بۆیە حودەیبیە بۆ خۆی فەتحێك بوو پێش فەتحی مەککە.

بەڵێ، وەختێك پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هەنگاوێکی دەنا، زۆر چاك دەیزانی کە چۆن دەبێت. ڕوانینی بگەیشتایەتە هەرکوێ، پێشی تێدا دادەنا. لە چوارچێوەی دەستلەملانێی هزر و بزاوتدا بەسەر کێشەکاندا زاڵ دەبوو و ڕێگەچارەی بۆ دەدۆزینەوە.

## ٥. ئیسلام لە هەموو جێیەکدا ناسرا

بەهۆی ئەم ڕێککەوتنەوە سەرجەم تیرە و هۆزەکان تێگەیشتن کە سەروەرمان و ئەو دەوڵەتەش کە ئەو نوێنەریەتی، دەوڵەتێکە لەو ئاستەدایە بتوانێت لەگەڵ ڕاست و چەپی خۆیدا هاوپەیمانی ببەستێت و ڕێککەوتن ئەنجامبدات. وەك چۆن لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دانپێدانانی دەوڵەتان بەو دەوڵەتانەدا کە تازە دامەزراون یاخود سەربەخۆییان ڕاگەیاندووە، شەرعیەت دەدا بەو دەوڵەتە تازانە و لە ناوەندە نێودەوڵەتییەکاندا وەك پێوەرێك تەماشا دەکرێت، بە هەمان شێوە، بەهۆی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ڕێککەوتننامەی هەبوو لەگەڵیان، ئەمە وەك ئەوە وابوو دانیان پێدا نابێت. جا ئەگەر قوڕەیش دانی پێدا نابێت و ڕێککەوتنی لەگەڵدا مۆر کردبێت، ئیدی بۆچی خەڵکی تائیف دانی پێدا نەنێن؟ بەڵێ، هەموان یەك بەدوای یەك دانیان پێدا دەنا.

بەمجۆرە پێغەمبەر، ئەو مرۆڤە ناوازەیە توانی ئەو هەموو سەرکەوتن و دەستکەوتە لە ڕێککەوتنێکەوە بەدەستبهێنێت کە سەختترین مەرجی لەخۆ گرتبوو.

لەڕاستیدا زەمینەسازی فەتحێکی لەوجۆرە، بەتایبەت لە هەلومەرجێکدا کە بوار نەبوو بۆ بیرکردنەوە و دەبوایە یەکسەر بڕیاری بدایە، کارێکە بێ هیچ گومانێك لە سنووری ئاوەزی مرۆڤ بەدەرە و سەرکەوتنێکی وەهایە کە دەکرێت بە موعجیزە ناوی بەرین. ئەمەش خۆی لە خۆیدا زیندووترین گەواهییە لەسەر ئەوەی کە ئەو بەڕاستی پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خوایە. چونکە هیچ مرۆڤێك، چەندە بلیمەت و لێهاتووش بێت، هێشتا ناتوانێت لە ڕێککەوتنێکەوە کە لە ڕوکەشدا بە شکست دەبینرێت، فەتحێکی لەو شێوەیە مسۆگەر بکات. ئاخر چونکە سەرکەوتنێکی لەو چەشنە وابەستەی هێز و ئیرادە و زانستێکە کە لە دەرەوەی توانای بەشەرە.

## ٦. خوای لەپشت بوو

وەختێك تەماشای ئەو کێشە و ئاڵۆزییانە دەکەین کە ئەو زاتە چارەسەری کردوون، ئەستەمە لەپشتیەوە ئەو خاوەن توانستە ڕەهایە نەبینین کە دەسەڵاتی بەسەر سەرجەم بوونەوەراندا هەیە.

بەدەر لەمە، لە پشت هەستانەوەی ئاسان و بێ زەحمەتی پێغەمبەر لەژێر باری چەندەها پرسی ئاڵۆسکاو و گرفتاویدا، هەست بە چاودێری و پارێزگاری ئەو خاوەن قودرەتە دەکەین کە ڕەوانەی کردووە و لە ئەنجامدا ئێمەش بەتەواوی کیانمانەوە دێینە جۆش و هاوار دەکەین: "محمد رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)."

بەڵێ، پێغەمبەر کە بڕیارێکی دەدا زۆر بە خێرایی دەیدا.. بۆ ئەو بڕیارە خێرایەش دەیتوانی ڕۆبچێتە بنج و بناوانی ئەو بابەتەوە کە بڕیاری لەسەر دەدا.. چووبێتە ناو هەر کارێکیشەوە بە سەرکەوتوویی لێی هاتووەتە دەرەوە. داخۆ دەبێت چۆنبێت وا لە سەراپای ژیانی پیرۆزیدا -بە شایەتی سەرچاوەکانی سیرە- بۆ تەنها جارێکیش چییە ڕێمان ناکەوێت لە کارێك پێویستی بە پینە و چاککردنەوە بێت. بگرە لەو حاڵەتانەشدا کە بەلای کەسانی ترەوە نسکۆ و لەرزەپێکەوتنن،

هەر هێندەی ئەو سەروەرە دەست دەداتە چمکێکی، ئیتر لەو شکستەوە سەرکەوتن بەرهەمدەهێنێت و سەرشۆڕی دەگۆڕێت بە سەربەرزی!

بەڵێ، لەسەر دەستی ئەو نسکۆ و تێکشکانەکان دەبوون بە بردنەوە و سەرکەوتن. وەك بڵێی بە پێچەوانەی ڕێڕەو و سروشت و فیترەتی شتانەوە، ڕێڕەو و سروشت و فیترەتێکی جیاوازی دەهێنایە مەیدان.

ئاشکراشە کە هێنانەدی هەموو ئەو شتانە دەگەڕایەوە بۆ خوای خاوەن توانستی بێ سنوور:

﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾ (الصافات: ٩٦)

"لەکاتێکدا خوا بەدیهێنەری ئێوەیش و ئەم بتانەشە کە دروستتان کردوون (نەشیانتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن!)"

خوای باڵادەست لەسەر دەستی کامڵترین و چاکترین و بەرێزترین دروستکراوی خۆی کارەکانی بەدیدەهێنێت... بۆچی؟ چونکە بۆ ئەوەی پێمان بڵێ: "بزانن کە ئەوە بەندە و نێرراوی منە. هەروەها بزانن کە من لە هەموو شتێکدا پشتیوانی دەکەم. خۆ ئەگەر ئێوە ژمارەتان لە ملیۆنەها و ملیارەهاش بترازێت و ئەویش تەنها بەس خۆی بێت، ئەوا بەسەر هەمووتاندا سەر دەکەوێت. بۆچی؟ چونکە من پشتگیری دەکەم و سەریدەخەم. "لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ" کەسیش نابێت ئەوە لەبیر بکات، هەرکەسێك شەڕ دژی کەسێك ڕابگەیەنێت کە خوا لەپشتیەتی، ئەوا جاڕی شەڕی داوە دژی خوا."

حەزرەتی محەممەد هەرگیز نەبەزیوە و ناشبەزێت. ئەوانەی بەزاندنی ئەو سەروەرە ببووە ماخۆلانی سەریان، دژایەتی ژیری و ناخی خۆیانیان دەکرد. ڕاستتر بڵێم؛ کۆمەڵە بەدبەختێك بوون خەونیان بە مەحاڵەوە دەبینی. خواش ئەوجۆرە کەسانە بەئاگا دێنێتەوە و رایان دەچڵەکێنێت و پێیان دەڵێت: "بێدارببنەوە و وەرنەوە خۆتان، ئەی ئەوانەی سنووری خۆتان بەزاندووە!" وەختێکیش لە ئاست هەموو ئەوانە ئاوەزیان کول دەبێت، دەربەدەریان دەکات و لەناویاندەبات.

بەڵێ، دژایەتی و بەرهەڵستی حەزرەتی محەممەد کارێکی ئەستەمە. چونکە پشتیوان و سەرخەری ئەو خوایە. تەنانەت لە جێیەکدا لە بەرامبەر شتێکی زۆر بچووکدا کە لە لایەن خێزانەکانیەوە دەرهەق کرا، تاقانە پارێزەرەکەی دڵنەوایی دەکات و پێی دەفەرموێت: "خوات لەپشتە و ئەو پشتیوانتە، فریشتەکانیشت لەپشتن و ئەوانیش پشتیوانتن." التحریم: ٤. واتە سەرجەم هاونشینە ڕۆحانییەکانی ئاسمانەکان پاڵپشتی لە تۆ دەکەن. جا کە سەربازانی تۆ ئەوانە بن، ئیدی چۆن ملیۆنەها و ملیارەها غیرەتی ئەوە دەکەن دەست بهێننەڕێت! ئەوەشی بەو کارە هەڵدەستێت سەری خۆی داوە لە بەردێکی ڕەق و شکاندوویەتی.

بەڵێ، ڕەنگە خوای دلۆڤان جارێك، دە جار، بیست جار یان سی جار مۆڵەتیان بداتێت، ئەمەش بۆ ئەوەی لە دواڕۆژدا هیچ بیانوویەکیان نەمێنێت. هەروەك پێیان بڵێ: "باش وردببنەوە و چاك تێبگەن و وەرنە سەر ڕێگەی ڕاست، تاکو لە قیامەتدا هیچ برو بیانوویەکتان نەمێنێت." بەڵام کاتێکیش دەیانگرێت و تۆڵەیان لێ دەسەنێتەوە، بە دەربڕینی فەرموودەکە، "هەر ئەوەندەی گرتنی، ئیدی دەربازبوونیان بۆ نییە و تۆڵەیەکی بەئازار و توندیان لێ دەسەنێت."[١]

---

١. البخاري، تفسير (١١) ٥؛ مسلم، بر ٦١.

## أ- ئەو ژینگەیەی پێغەمبەری خوا هێنایە کایەوە

پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەك ئەو ڕۆژەی تێدا بوو ئاوا ڕۆژانی داهاتووشی دەبینی، بگرە وەك لەپی ناو دەستی لەبەر چاویدا بوون، ئەمەش یەکێك بوو لە خەسڵەتە تایبەتییەکانی. ئەو وانە مەزنەش کە لە خودەبییەوە هەڵمانهێنجا هەر ئەمە بوو. لە لایەکی ترەوە، پێغەمبەری سەروەرمان یاسا و ڕێساگەلێکی وەها تازەی هێناوە، لە بەرامبەر پیربوونی ڕۆژگاردا ئەوان بە تەڕ و پاراوی ماونەتەوە. تەنانەت دەتوانین بڵێین بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار گەنجتر دەبنەوە.

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە لایەن پەروەردگاری بوونەوەرانەوە بە کۆمەڵە بنەما و ڕێسایەکی ئایینییەوە هاتووەتە مەیدان و لە سەردەمەکەی خۆیدا ئەو ڕێسایانەی بە مرۆڤی ئەو سەردەمە گەیاندووە و فێریکردوون. ئەوانیش دەستاو دەست گەیاندوویانەتە ئێمە. خوا لە سەرجەم پێشینانمان ڕازی بێت! قورئانیش فێری ئەدەبی ئەمەك و پێزانینی چاکەی ئەوانمان دەکات و فەرمانمان پێدەکات نزا و پاڕانەوەیان بۆ بکەین:

﴿ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ
وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾

(الحشر: ١٠)

"پەروەردگارا لە ئێمە و لەو برایانەشمان خۆش ببە کە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر و لە دڵەکانماندا هیچ جۆرە بوغز و کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە لە ئاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە."

ئەمە گوزارشتە لە پێزانینی ئێمە بۆ چاکەی ئەوان هەتا دەگاتە هاوەڵە بەڕێزەکان. کاتێك لە لای هەر گۆڕستانێکەوە دەوەستین دەست بەرزدەکەینەوە، هەوڵ دەدەین ئەم ئەمەکدارییە دەربڕین. لە ئەنجامی خستنەگەڕی وزە و ئەدایەك کە لە بیرکردنەوەی ئێمە دەترازێت، هەتاوەکو سەردەمی پێغەمبەر پێشینانمان

چەندین دەوڵەتی یەك لەدوا یەکیان پێکهێناوە. یەکێك لە زانا خۆرئاواییەکان دەڵێت: "بەڕاستی حەزرەتی محەممەد زۆر مەزنە." بۆچی؟ چونکە لە سایەی ئەو دەستوور و بنەمایانەوە کە هێناونی، زیاد لە سەد دەوڵەت دروستبوون و چەندین شارستانی لەژێر ڕۆشنابییەکەیاندا دامەزراون و لەشکر بۆ زۆربەی ناوچەکانی جیهان نێرراون. ئەو لەشکرانەش بەهۆی بلیمەتیی سەرکردەکانیانەوە بەردەوام بەسەرکەوتوویی گەڕاونەتەوە. ئەو سەرکردانە تەنها فەتحیان نەکردووە، بەڵکو لەگەڵ خۆشیاندا مەشخەڵی زانیارییان هەڵکردووە. ڕۆژێکیش هاتووە ئەو مەشخەڵانە سەرانسەری جیهانیان ڕووناك کردووەتەوە و کردوویانە بە لانکەی زانست و عیرفان.

ئەوە بەغدا، ئەوە شوێنەوارەکانمان لە ئاسیای ناوەڕاست هەر لە مزگەوت و مەدرەسەوە تا دەگاتە نەخۆشخانە و پەرستگاکان.. وێڕای هەوڵی دوژمنان بۆ ڕووخاندن و سڕینەوەی مۆرك و سیمایان کەچی هێشتا هەر ماون. ئەوەش ئەندەلوسی بێ هاوتا! بە سەرجەم ئەو شوێنەوارە دێرینانەیەوە کە بلیمەتانی دونیای زانست و هونەریان سەرسام کردووە.. ئەوەش ئەندەلوس بە کەلتوور و هونەر و ڕەوشت و ڕێزگرتنیەوە لە بەها مرۆییە هاوبەشەکان! تەنانەت لە پاش تێپەڕینی پێنج سەد ساڵی پڕ ستەم بۆ لەناوبردنی، کەچی هێشتا ئەو شوێنەوارە ستەمدیدانە شاکارێکە دڵان بەرەو خۆی کەمەندکێش دەکات.

ئەی ئەگەر بە چاوی کەسێکی هونەرمەند و شارەزای بواری جوانسازی تەماشای ئەم هونەرە مەزنانە بکرێت دەبێت چ تام و چێژێکیان هەبێت و مرۆڤ بە ڕووی چ هەستانێکی لەدوننیدا بکەنەوە!

بەڵێ، دوای ئەو و بە شوێن هەنگاوەکانی ئەودا وەك چۆن هەزاران لانکەی زانست و بە سەدان هەزار کەڵەپیاو لە بواری هونەر و زانستدا پێگەیشتن، ئاوەهاش سەدان دەوڵەت کە تەمسیلی سیستەمەکەی ئەویان دەکرد، بنیاتنران. ئەمەوییەکان، عەبباسییەکان، سەلجوقییەکان، خەرزەمییەکان، دەوڵەتی قەرەخانی و دەوڵەتی عوسمانی تەنها چەند دانەیەکن لەوانە...

ڕەوا نییە ئاینی ئیسلام بەراورد بکرێت بە ئایینی مەسیحی. چونکە مەسیحییەت هەرگیز نەیتوانیوە لە کڵێسا بترازێت. دەوڵەت یا بەرژێمی سیۆکراتی، واتە بەگوێرەی ئیجتیهادی قەشە و پیاوانی ئایینی بەڕێوەچووە، یان لەلایەن کەسانێکەوە کە هەڵگری هزری فەلسەفەی ماددی بوون. بەڵام پەیام و ئاینەکەی پێغەمبەر بەو جۆرە نەبوو. چونکە بەرنامەکەی ئەو لەسەر بناغە هەمەکییە قووڵ و زیندووەکانی قورئان و سوننەت بنیاتنراوە و بەردەوام بووە، ئەو بناغانەی کە هەمیشە لە نوێبوونەوەدان و بە ڕووی ئیجتیهاددا والآن. لە هەرێمەکەی ئەودا زەمەن دەگۆڕێت و گۆڕانکاریش بەسەر ڕوخسارەکاندا دێت، بەڵام کاکڵە و واتاکان وەك خۆیان دەمێننەوە. لەم دونیایەدا شارستانییەت و دەوڵەتان دانەیەکیان ئاوا دەبێت و بەدوایدا دانەیەکی دی هەڵدێت. واتە ئاسمان بە بەردەوامی خۆری لەئامێز گرتووە.

## ب- هەڵکەوتووانی هەرێمەکەی

پێغەمبەری خوا بەو ئاسۆیەی کە وەحی پاڵپشتی دەکرد، زۆر کارزانانە ئەو پایانەی دیاریکرد کە دەوڵەتیان لەسەر بنیات دەنرا و هەریەکەیانی لە جێگەی دروست و گونجاوی خۆیدا بەکارهێنا. هەروەها ڕێگەشی خۆشکرد بۆ پێگەیشتنی چەندین سەرداری دەوڵەت و شاسواری مەیدانی هزری زانستی و خاوەن لێهاتنی هونەری.

لە سەردەمی خۆیدا چەندین سەرکردەی سوپای پێگەیاند. لەدوای خۆیشی و لەسەر ئەو ڕێگەیەدا کە بەرەو فەتحی جیهان درێژدەبووەوە، چەندین سەرکردەی مەزن پێگەیشتن، هەر لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە تا عوقبەی کوڕی نافیع و لە عوقبەیشەوە تا ئەحنەفی کوڕی قەیس و لە ئەحنەفیشەوە تا تاریقی کوڕی زیاد و لەمیشەوە تا محەممەدی کوڕی قاسم. کاتێك لەم گۆشەیەوە دەڕوانینە سەرچاوە و تەلارسازی ئەو پێکهاتە مەزنە، وا گومان دەبەیت کە هەر سەرقاڵی بواری

سەربازی بووبێت. زۆرێك لە بیرمەندە هاوچەرخەکان -وەك عەبباس مەحمود عەقاد- وەها سەیری سەردەمی بەختەوەری دەکەن کە زەمینەی پشکوتن و کرانەوەی توانا و لێهاتنە مەزنەکان بووە.

بەڵێ، قوتابخانەکەی حەزرەتی محەممەد تاکە قوتابخانەیە کە لە توانایدایە و توانیویشیەتی بەهرە و تواناکان بۆ بەرزترین ئاست بەرزبکاتەوە. هەرکەس ڕووی لەو قوتابخانەیە کردبێت، لە چوارچێوەی سروشتی خۆیدا توانیویەتی هەموو توانا نەقلی و ڕۆحییەکانی تا دوامەودا گەشەپێبدات. ئەوەتا حەزرەتی ئەبوبەکر لە جەنگ و ئیدارەی دەوڵەت و زانستیشدا کەسێکی بلیمەتە. حەزرەتی عومەر و عوسمان و عەلیش هەریەکەیان بلیمەتێکن.. خالید و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و ئەبوعوبەیدە و عەلائی حەزرەمی و قەعقاع کوڕی عەمر و سەدانی تریش هەموویان مەرد و بلیمەتی مەیدانی سەربازی بوون. هەروەك بڵێی ئەو سەردەمە سەردەمی بلیمەتەکان بووبێت. بگرە ڕاستتر وایە بڵێین، ئەو سەردەمە ئەو سەردەمە زێڕینەیە کە تاکە گەردیلەیەك لە سەرمایەی توانا و بەهرە و ئامادەییەکانی مرۆڤی تێدا فەرامۆش نەکراوە و هەموو بەجارێك برەویان پێدراوە و دەرگای شکۆفەکردنیان بە ڕوودا خراوەتە سەرپشت. سەردەمێکە سەدان بلیمەت و هەڵکەوتوو ئاوەدانیان کردووەتەوە.

جا ئەگەر عوقبەی کوڕی نافیع، کە بە هەڵمەتێك ئەمپەڕ و ئەوپەڕی ئەفریقای فەتح کرد بلیمەت نەبێت ئیتر کێ بلیمەتە؟ عوقبە هەر لە تەمەنی پانزە ساڵییەوە سوارچاك بووە و لە سەردەمی خەلیفەکاندا چەندەها ئەرکی گرنگی ڕاپەڕاندووە. تا لێواری ئۆقیانووسی ئەتڵەسی سەرتاپای کیشوەری ئەفریقای کۆنترۆڵکردووە. دەگێڕنەوە کە بە سواری ئەسپەکەیەوە دەدات لە ئاوی ئۆقیانووس، کە عەرەب پێیان دەوت "دەریای تاریکی" و دەڵێت: "ئەی خوایە، وا ئەم دەریایە هاتووەتە پێشم و ڕێی لێ گرتووم، ئەگەر ئەم دەریایە نەبوایە ئەوا ناوی پیرۆزی تۆم تا ئەوپەڕی دەریاکان دەبرد."[١]

---

١. إبن أثير، الكامل في التأريخ ٤٥١/٣.

دەبینین لە هەمان قوتابخانەدا تاریقی کوڕی زیاد، کە پێشتر کۆیلەیەکی بەربەری بووە، وەك سەرکردەیەکی سەربازیی هەڵکەوتوو دێتە سەر شانۆی ڕووداوەکان. بە سوپایەکی دوانزە هەزار سەربازەوە سەردەکەوێت بەسەر سوپای ئیسپانیدا کە ژمارەیان نەوەد تا سەد هەزار سەرباز بووە و لە ماوەیەکی زۆر کورتدا دەگاتە کۆشکی پادشا لە "طليطلة".[1] عەلائی حەزرەمیش بە هەمان شێوە سەرکردەیەکی مەزن بووە. تەنانەت لە سەردەمی حەزرەتی عومەردا وتیان ناتوانین کەڵك لە هەموو ئەو توانا و لێهاتنەی وەربگرین، لەبەرئەوە بەناچاری فەرمانیان دەرکرد بۆ عەلائی حەزرەمی کە لە جەنگی بەحرەیندا بوەستێت. مێژووی ژیانی عەلائی حەزرەمی پڕە لە پەند و سەروەری. مێژوونووسان دەڵێن ئەگەر خالیدی کوڕی وەلید ببرایە بۆ جێگەی عەلاء، ئەویش ببرایە بۆ جێگەی خالید، ئەوا هیچ شتێك نەدەگۆڕا و کەلەبەر پەیدا نەدەبوو. شتی وا چۆن دەبێ؟ چۆن لە سەردەمێکدا ئەو هەموو بلیمەتە هەڵدەکەوێ؟ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بلیمەت بوو خۆ ئەگەر لە وڵاتی فارسدا دوای شوێن پێیەکانی بکەویت تۆش دەگەیتە ئەو قەناعەتە. ئەبو عوبەیدەی جەڕاح بلیمەت بوو.. شەرحەبیل کوڕی حەسەنە و یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان و چەندەها هەڵکەوتووی تری زنجیرەی بلیمەتەکانی پاش پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)...

دەی خۆ بە جۆرێکی تر بیابان تەی نەدەکرا و گەیشتن بە شوراکانی چین و جەبەل تاریق دەبووە سەرگوزشتەیەك لە مەحاڵ. مەحاڵ بوو لە کەمتر لە چارەکە سەدەیەکدا ئەو جوگرافیا بەرفراوانە فەتح بکرێت. نەشدەکرا ئارامی و ئاسایش لەو ناوچانەدا سەقامگیر بکرێت.. سەقامگیریش بکرایە بەردەوامی هەبێت. ئەمە چ جای ئەوەی مەحاڵ بوو ئەو سیستەمە بەدرێژایی دوانزە سەدە و سەرباری بەرهەڵستی و دەستدرێژی و چەواشەکاری لە لایەن پەیڕەوانی هەموو ئایینە پێشینەکانەوە، لە لوتکەدا بمێنێتەوە.

بەڵێ، ئەوە ئەو بلیمەتییە سەرچاوە پێغەمبەرانەیەی ئەوان بوو کە وای کرد بۆ

---

١. إبن أثير، الكامل في التأريخ ٤/٢٦٧-٢٦٨.

چەندین سەدە جیهان فەرمانڕەواییەکی پێغەمبەرانە بەخۆیەوە ببینێت. وەك بڵێی بە ئاوابوونی پێغەمبەر (عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ)، ئەو خۆری خۆرانە پارچە پارچە دەبێت و دابەش دەکرێت بەسەر ئەوانەدا کە پاش ئەو دێن. ئیدی هەمووان لە سایەی ئەو فەتانەتە محەممەدییەوە بەو کارە گەورانە هەڵدەستن کە مێژوو شایەتیانە. تۆ بڵێی خەیاڵ و وێنای هاوشێوەی ئەو سەردەمەمان لە تواناداا بێ؟ ناڵێم ببینین، بەڵکو دەڵێم: وێنای بکەین، یاخود لە ئەندێشەدا چاومان پێی بکەوێت، یان هەر هیچ نەبێت ببێتە میوانی خەونەکانمان؟ ئەو ناوانەی لێرەدا بە پەلە ئاماژەمان پێدان و ئەو کارە مەزنانەش کە ئەنجامیان داون، هەریەکەیان هی ئەوەیە چەندین لێکۆڵینەوەی تێروتەسەلی لەسەر بکرێت.

ئێمە لێرەدا تەنها تیشکمان خستە سەر هەندێك لەو کەسایەتییە سەربازی و کارگێڕییە مەزنانەی کە ئیسلام بەدرێژایی مێژوو پێیگەیاندوون. باسکردنی هەموشیان کارێکە پێویستی بە چەندین پەڕاو هەیە. بواری ئەم پانتاییە کەمەی ئێرەش لەوە کۆتاترە ئەو هەمووە لەخۆ بگرێت. ئەوەبوو بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هاتینە ناو ئەم بابەتەوە و تەنها لەسەر ئەو لایەنانە وەستاین کە پەیوەنییان بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محەممەدەوە هەیە. هەموو هیوا و ئاواتیشم ئەوەیە کەسانی پسپۆڕ بە شێوەیەکی تێروتەسەل هەستن بە توێژینەوەی ئەم بابەتانە. جا مەگەر ئەو دەم قوتابخانەکەی پێغەمبەر بە چەند ڕەهەندێکیەوە باشتر دەربکەوێت و زوبانی خاوەن ویژدانان بە "محمد رسول الله" بێنێتە گۆ.

## ١. بلیمەتەکانی زانست لەو قوتابخانەیەدا

دەرگاکانی ئەم قوتابخانەیە هەروەك چۆن کراوە بووە بۆ پاڵەوانەکانی جەنگ و کارگێڕە لێهاتووەکانی دەوڵەت، هەرواش لەسەرپشت بوون بۆ زانست و زانستخوازان. بۆیە دنیایەك زانا و بیرمەند و یاساناس و موجتەهید و موجەددیدی پێگەیاندووە. سەرژمێریکردنی ڕێبوارانی ئەو ڕێبازە نوورانیەش کە هەر لە سەردەمی خەلیفە

ڕاشیدەکانەوە دەستی پێکردووە و بەدرێژایی سێ سەدە بەردەوام لە هەڵکشاندا بووە، مەسەلەیەکە نە لە توانای ئێمەدایە، وە نە پانتایی کتێبەکەش بواری ئەوەمان دەدا. پێموایە تەنیا ئاوڕدانەوەیەك بەلای عەبدوڵلای کوڕی مەسعود کە شوانی مەڕ بووە لە مەککە، سەروزیاد بێت.

لە سایەی ئەودا کوفە بوو بە مەڵبەندی زانست. لەو قوتابخانەیەدا سەدان زانای پایەبەرز لە بواری شەرعناسی و فەرموودە و زانستی کەلامدا هەڵکەوتن. ئەسوەد کوڕی یەزید، عەلقەمە کوڕی قەیسی نەخەعی، ئیبراهیم کوڕی نەخەعی، حەماد کوڕی ئەبو سولەیمان، ئەبوحەنیفە و چەندانی تر لە نموونەی ئەو بەرهەمە بەردارانەن. هەر هەمووشیان قەرزاری ئەو سەرچاوە موبارەکەن. خۆ ئەگەر ئێمەش ئەم حەقیقەتە تۆمارنەکەین و لە بیر خۆمانی بەرینەوە، مێژووی زانست دەمێکە ئەمانەی تۆمارکردووە و تۆماریشی دەکات. سەرباری هەندێك لەو خاوەن ڕۆحیەتە سەرکەشانەش کە چاویان بەم ڕاستییە هەڵنایەت، لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا جارێکی تر سەدای ئەم ڕاستییە لە تەواوی دونیادا دەنگ دەداتەوە...

## لە بواری شەرعدا

دەبا هەموو ڕۆحە مەزنەکانی تر لە مەنزڵی پڕ ڕێز و ستایشی ناو دڵ و دەروونماندا سرەوت بفەرموون و بە گەورەیی خۆیان بمانبوورن. لە ناویاندا تەنها نموونەیەك وەردەگرین و بە کورتی باسی دەکەین، تا ببێتە نموونە بۆ باقی زانایانی تر و بڵێین: "ئیتر هەموویان وان." چونکە مشتێك نموونەی خەروارێکە.

ئەبوحەنیفە کێیە؟ ئەبوحەنیفە پێشەوای مەزهەبی حەنەفییە. لە سەردەمێکدا کە زانست و کلتوور ڕاستەوخۆ و ڕووبەڕوو دەگوازرایەوە، ئەم ئیمامە بۆچوونەکانی خۆی بۆ ئەو کەڵەپیاوانە ڕووندەکردەوە کە لە دەوری کۆببوونەوە. مامۆستایەکی هێندە گەورە بووە لە بازنەی وانەکانیدا ئیمام ئەبو یوسفەکان، ئیمام محەممەدەکان، ئیمام حەسەن شەیبانییەکان، ئیمام زوفەرەکان، ئیمام وەکیعی مامۆستای ئیمامی

شافیعی و چەندینی تریش چۆکیان دادابوو. هەریەکە لەمانەش بۆخۆیان کەسایەتی ناسراو و "شیخ الاسلام"ی ئەو سەردەمە پرشنگدارە بوون. واتە مامۆستای مامۆستاکان بووە و واژۆی خۆی لەسەر پەڕەی هەموو سەردەمەکان نەخشاندووە و دەنگی خۆی گەیاندووەتە بەرەکانی پاش خۆی و بووە بە پێشەوا و چاوساغ بۆ سەدان ملیۆن لە موسوڵمانان. ئەو سەرنج و بۆچوونانەی کە بە قوتابییە پێشینەکانی خۆیی نووسیوەتەوە، بە تایبەتی ئیمام محەممەد، "شمس الأمة" ئیمام سەرخەسی لە دوتوێی کتێبە بەناوبانگەکەدا کە بە "مبسوط" ناسراوە و لە سی بەرگ پێکهاتووە، شەرحی دەکات. لەڕاستیدا چیرۆکی نووسینەوەی ئەم کتێبە زۆر سەیرە. چونکە بەرهەمی زیندانە.. بەڵام چ زیندانێك! هەموو ڕۆژێك قوتابییانی ئیمام بەدەوری زیندانی مامۆستاکەیاندا کە بنکی بیرێکی قووڵ بووە، کۆبوونەتەوە.. مامۆستا وانەی وتووەتەوە و ئەوانیش نوسیویانەتەوە...

لەو بەسەرهاتە سەیرانەی دەیگێڕنەوە ئەوەیە کە ڕۆژێکیان یەکێك لە قوتابییەکانی ئیمام پێی دەڵێت: ئیمام شافیعی سێ سەد لاپەڕە فەرموودەی لەبەربووە. لە بەرامبەردا ئیمام سەرخەسی بە ئەوپەڕی تەوازوعەوە دەڵێت: "کەواتە زەکاتی ئەو فەرموودانەی لەبەربووە کە من لەبەرمن..!" ئیمامی شافیعیش بۆخۆی هەڵکەوتە و بلیمەتێکی ترە.. لوتکەی ئەڤەرێستە.. ئیمام مالیك و ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش لوتکەی لەوجۆرەن...

دیسانەوە دەپرسین: ئەبوحەنیفە کێیە؟ ئایا قوتابی هاوەڵی پێغەمبەری خوا، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود بووە؟ یان قوتابی یەکێك لە تابعین بووە وەك عەلقەمە؟ نا نەخێر.. بەڵکو قوتابی قوتابی ئەوان بووە. واتە قوتابی حەممادی کوڕی ئەبو سلێمان بووە. ڕاستە حەممادیش دیسان بۆخۆی شەرعناس و یاساناسێکی مەزن بووە، بەڵام دیسانەوە ئەویش قوتابی قوتابی پێغەمبەر (عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَام) بووە.

بەڵێ، لە سەردەمێکدا کە سەراپای جیهان لەناو تاریکیدا مەلەی دەکرد و لە خۆرهەڵات و خۆرئاوای جیهاندا تەنانەت ڕووناکیی "بەرەبەیانی درۆزن"یش لە ئاسۆدا نەبینراوە، هەریەك لەم زانایانە کە پرشنگی زانستەکانیان جیهانیان

ڕۆشنده‌کردەوە، لە قوتابخانەکەی پێغەمبەردا پێگەیشتن. ئەو زانا پایەبەرزانە دونیایان بە زانست و عیرفانی خۆیان ڕووناککردەوە، ئەگەرچی ژمارەیان زۆریش بوو بەڵام هەموویان دانسقە بوون و لە چڵەپۆپەی زانیاریدا بوون. واتە نرخ و بەهایان ناگەڕێتەوە بۆ دەگمەنی و کەمی ژمارەیان. چونکە بەس لە سەردەمی ئەبوحەنیفەدا ڕەنگە بڵێم پەنجا زانای دیکەی وەك ئەو لە کوفەدا بوونیان هەبووە.

دەبینن خاکەکە چەندە بەپیت و سەردەمەکەش چەندە موبارەکە! ڕاستتر بڵێم، هەموو ئەمانە لە سایەی لافاوی نووری محەممەدی و شەپۆلانی ئەو دەریای عیرفانەیە. بەڵێ، لە سایەی ئەوەوەیە لە کۆمەڵگەیەکی دەشتەکیدا پۆلێك زانست دۆست هەڵدەقوڵێت و بەدرێژایی چواردە سەدە چوارقورنەی دونیا ڕووناك دەکەنەوە، پشت بە خوا هەتا ڕۆژی پەسڵانیش بەردەوام دەبن لە ڕووناککردنەوەی.

## لە بواری تەفسیردا

بە بڕوای ئێمە تەفسیر بۆخۆی دەریایەکە، بەڵام بەراورد بە دەریاکەی پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) دڵۆپێکە.. دڵۆپێك لەو دەریایە لە حەزرەتی عەلییەوە تا ئیبن عەباس و لەویشەوە تا موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیر و لەویشەوە تا ئیبن جەریر و فەخرەدینی ڕازی و ئیبن کەثیر و سەرجەم موفەسسیرە دانا و زاناکانی ئەم سەردەمەی خۆمان هاتووە. خۆ ئەگەر هیچ بەڵگەیەکی دیکە نەبوایە لەسەر ئەوەی کە حەزرەتی محەممەد پێغەمبەر و سەردار و گەورەی گرۆی مرۆڤایەتییە، ئەوا شوێنکەوتوویی ئەم کەڵەزانایانە شایەت و بەڵگەیەکی سەروزیاد دەبوو..

بۆ نموونە ئیبن جەریر نموونەی بلیمەتی و ناوازەییە. کە تەفسیرەکەی دەخوێنیتەوە دەبینی ئایەت و فەرموودەکان بەجۆرێك لێکدەداتەوە باز دەدەن بەسەر بەربەستی زەمەندا. باس لەوە دەکات کە چۆن ئاسمان لە حەوت چین پێکهاتووە و ئاسمان و زەوی چۆن کاتی خۆی یەك پارچە بوون و پاشان تەقیونەتەوە. پاشان باس لە بنەما سەرەکییەکانی هەڵکردنی هەوا و بارینی باران دەکات. واتە لە

کۆمەڵە بابەتێك دەدوێت کە پاش تێپەڕبوونی هەزار ساڵ ئینجا ڕاستییەکانیان دەرکەوتووە. لەو توێژینەوە زانستییانەی سەبارەت بە کتێبەکانی کراون، دەرکەوتووە کە تێکڕای نووسینەکانی ڕۆژانەی ئەو زانایە لە ژیانیدا بریتییە لە پانزە لاپەڕە بۆ هەر ڕۆژێك. جا ئەگەر ئیبن جەریر بلیمەت نەبێت ئیدی کێ بلیمەتە؟

ئەگەر لە بواری تەفسیردا لە ئیبن جەریرەوە بگوێزینەوە بۆ فەخرەدینی ڕازی و لەوێشەوە بۆ ئیمام سیوطی کە پاش خوێندنەوەی سەدان تەفسیر چەندین کتێبی گەورەی داناوە، لەویشەوە بۆ گەورە و کەڵەزانایانی ئەم سەردەمەمان، دەبینین کەسانی وا لە مەیدانی تەفسیردا هەڵکەوتوون، ئەگەر یەکێکیان لە خۆرئاوا دەربکەوتایە ئەوا پەیکەرێکی گەورەیان بۆ دروستدەکرد و بە شانازییەوە بە هەموو جیهانیان دەناساند...

ئێمە کەسانی وەك "ئیمام غەزالی"مان هەیە کە لە زۆربەی بوارەکانی زانستدا بێ هاوتایە. خۆرئاواییەکان زۆرکەم ویژدانیان بەگەڕخستووە.. لەگەڵ ئەوەشدا خۆرهەڵاتناسی بەناوبانگ "جیب" لە هەڵوێستێکی بەویژدانانەیدا ئیمامی غەزالی و گاڵۆکەکەی دەستی وەك ڕۆحێکی ناوازە وێنا دەکات کە بە ئەفسوونەکەی بەشەریەتی سەرسام کردووە. لەو هێڵە نوورانییەدا کە هەر لە ئیمامی غەزالییەوە بۆ ئیمام ڕەببانی و لەویشەوە بۆ بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی درێژدەبێتەوە، دەتوانین سەدان قوتابی لە قوتابیەکانی سالارمان حەزرەتی محەممەد ڕیزبەند بکەین.

## لە بواری فەرموودەدا

بلیمەتەکانی زانستی فەرموودەش هەریەکەیان بۆخۆی کۆتەڵەیەکی جیای زانست و مەردایەتین. ئیمامی بوخاری و موسیلم و ئەبوداود و ترمذی و نەسائی و ئیبن ماجە و ئیمام ئەحمەد و ئیمام داود و دارولقوتنی و بەیهەقی و دارەمی و هتد.. هەریەك لەمانە لە مەیدانی خۆیاندا بەشی هەموو دونیا دەکەن. بەڵام

وەستانی ئێمە لەسەر هەریەکێکیان و توێژینەوەی بنیاتی زانستییان، بەتایبەتیش لە ڕوانگەی ئەو ئامانجەوە کە ئێمە لەم کتێبەدا بۆ خۆمان دیاریکردووە، کارێکە بۆمان مەیسەر نابێت.

بەڵام تەنیا ئەوەندە دەڵێم کە ئیمامی بوخاری یەکێکە لەوانەی کە دوای لەبەرکردنی ٦٠٠ هەزار فەرموودە، تەنها چوار هەزاری لە پەڕاوەکەیدا تۆمارکردووە.[1] ئەو هەستیاری و وردبینییەش کە لە تۆمارکردنی فەرموودەکاندا نواندوویەتی بۆخۆی داستانێکە. بۆ هەر فەرموودەیەك دەستنوێژی گرتووە و دوو ڕکات نوێژی کردووە.. پاشان لە سروتێکی تایبەتیدا پەیوەندی لەگەڵ فەخری عالەمدا بەستووە.. گەر وەڵامی ئەرێنی وەرگرتبێت ئەوجا فەرموودەکەی خستووەتە ناو صەحیحەکەیەوە.[2]

ئەم پێشەوا گەورەیە تەنها قوتابییەك بووە لەو قوتابییانەی لە بازنەی وانەی پێغەمبەری نازداردا پەروەردەبوون. جارێکیان ڕێگەیەکی دوور و درێژی چەند ڕۆژە دەبڕێت بەس بۆ ئەوەی فەرموودەیەك لە کەسێك وەربگرێت. وەختێك بە شەکەتی دەگاتە شوێنی مەبەست، دەبینێت کابرا خەریکە بە مشتی دەستی ئەسپەکەی هەڵبخەڵەتێنێت، گوایە جۆی تێدایە بۆ ئەوەی بیگرێت. کەچی لەڕاستیدا هیچیشی تێدا نییە. کە پێشەوا بوخاری ئەم دیمەنە دەبینێت، بێ ئەوەی کابرا بدوێنێت یان فەرموودەکەی لێ وەربگرێت، یەکسەر دەگەڕێتەوە. کاتێك هۆکارەکەی دەپرسن بەمجۆرە وەڵامیان دەداتەوە: "کەسێك ئاژەڵەکەی هەڵبخەڵەتێنێت، چۆن دڵنیابم لەوەی منیش هەڵناخەڵەتێنێت!".. هەر خوا دەزانێت چەندە فەرموودەناسی بلیمەتی تر هەڵکەوتوون و هاوشێوەی پێشەوا بوخاری وردەکاری و هەستیارییان نواندووە لە کۆکردنەوە و تۆمارکردنی فەرموودەکاندا!

---

١. إبن حجر، مقدمات فتح الباري ٧/١، ٤٨٩؛ نووي، شرح صحيح المسلم ٢١/١.

٢. إبن حجر، مقدمات فتح الباري ٧/١.

## ڕەهەندە دونیاییەکەی زانست

مرۆڤ کە ئەو هەموو کتێبە زۆرانە دەخوێنێتەوە، کە بە لایەنگر و بێ لایەنەوە دەربارەی مێژووی زانستی کۆن و نوێ و بەراوردکردنیان نووسراون، خۆی پێناگیرێت هەست نەکات بە شانازی. ئەوەتا لە چاخی زێڕینی موسوڵماناندا ئەو سەرچاوانەی دەربارەی زانستی پزیشکی و بیرکاری و ئەندازە و لقە جیاوازەکانی زانستە سروشتییەکان نووسراون، هاوشانی ئەو کتێبانە بوون کە لە بوارەکانی تەفسیر و فەرموودە و زانستی کەلامدا نووسراون. لە جابری کوڕی حەییان ڕابەری زانستی بیرکارییەوە بیگرە تا دەگاتە ئیبن سینا و ئیبن بەطوطة و خوارزمی و زەهراوی، کە بە مامۆستای نۆشداری دادەنرێت و کتێبەکانی لە زانستی نەشتەرگەریدا بۆ ماوەی دە سەدە لە خۆرئاوا وەك سەرچاوە خوێنراون. تەنانەت کاتێك گۆڤارێکی زانستی باسی ئەم کەڵەزانایە دەکات، سەردێڕی باسەکەی بەمجۆرە دەنوسێت: ''ئەو زانایەی هەزار ساڵ ژیاوە!'' سەدان و هەزاران نموونەی هاوشێوەی ئەمانە هەموویان شاگردی قوتابخانەکەی پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بوون.

بەڵام ئایا بۆچی لای ئێمە ئەم مرۆڤە مەزنانە نەبینراون و تاوەکو ئەمڕۆش زۆرکەس نایانناسێت؟ نەبینینی ئەمانە بێ ئاگاییە لە ڕووی هەستەوە. لە خۆرئاوا ئەو جۆرە کەسایەتییانە هەمیشە لەبەرچاون. چونکە ئەمانە لەوێ چەند گردێکن لەچاو سارادا ڕۆشتوون بە حەوادا. ئەگەر زۆر بەرزیش نەبن چاو هەر دەیانبینێت. لە بەرامبەردا، لای ئێمە لوتکە و بەرزاییەکان لە زۆریدا زنجیرە زنجیرە و لەپەنا یەکدا ڕیزیان بەستووە. نەپێورانیان وای کردووە نەناسرێن. واتە ئەوان وەك کۆمەڵە لوتکەیەك وەهان کە بە تەنیشت یەکەوە بن، لەنێوانیاندا دەشت و شیو نییە تاکو دەربکەون و بناسرێنەوە.

کە دێینە سەر باسی خۆشمان، دیارە ئێمە بێ وەفاییمان نواند بۆیە وا گیرۆدەی ئەم حاڵە بووین. نەمانتوانی مافی تەواوەتی ئەو شاکارانە بدەین. لەو کاتەدا کە خۆرئاوا بەمانەوە ڕاپەڕینی زانستیی (ڕێنیسانس)ی خۆی بەرپاکرد، ئێمە

نەمانتوانی لە داوی هەندێك شتی پڕوپوچ خۆمان ڕزگار بکەین. هەڵە لە ئێمەدایە نەك لە پێشینانماندا. ئەوانە هەڵەن کە وەك میراتخۆر کەوتن بەسەر ئەو میراتەدا. هەڵە لەوانەدایە کە لەناو دەریادان و نرخ و بەهای دەریا نازانن. دیارە ئەوە تەنیا ماسییەکانن کە لە دەریادا دەژین و نازانن دەریا چییە!

## ٢. پاڵەوانانی جیهانی ڕۆح

ویلایەت ڕەهەندی پێغەمبەرییەکەیەتی لە پلەی دووەمدا.. لە مەیدانی ویلایەتدا کەسانی وەهای پێگەیاندووە و لەو دەرگایەوە کە کردوویەتیەوە بە چەشنێك بەرەو ئەوجی کەماڵات بەرزی کردوونەتەوە، تیایاندایە دەڵێت: "ئەگەر پەردەی غەیبیش لابدرێت یەقینم زیاد ناکات."[1] هەشیانە لایەنە نهێنییەکانی قورئان و سوننەت شیتەڵ دەکات و لە هێما ڕازئامێزەکانی نەخش دەچنێت...

ئەوە قەسیدەی "جەلجەلوتیە"، ئەوە "نهج البلاغە"، ئەوەش "مثنوي" و "فتوح الغیب" و "الفصوص" و "الفتوحات المکیة".

ئەدیسۆن لە یەکێك لەو ڕۆژانەیدا کە هەستی ئەمەکداری لە ناخیدا دەبزوێت، قسەیەکی لەمجۆرە دەکات: "لە کتێبی "الفتوحات المکیة"ی موحیەدین عەرەبیدا ئەو ڕێگەیەم دیتەوە کە منی گەیاندە کارەبا." پەڕاوی الفتوحات المکیة کە ئێستا لەبەردەستماندایە پڕیەتی لە نهێنی.. ئەگەرچی هەڵێنجانی کارەبا و ئەلەکترۆن و گڵۆپی کارەبا لە دەربڕینێکی ڕازئامێزی قورئانەوە لە چەند خاڵێکەوە کەوتبێتە بەر رەخنەش، بەڵام من پێموایە ڕەخنەگرتن لە ڕووداوێك کە تەئویلەکەی ئاشکرا بووە، هەوڵێکی خۆویستانەیە. مرۆڤ دەتوانێت لە ڕێگەی ویلایەت یان لە ڕێگەی تۆژینەوە لەناو تاقیگە زانستییەکان و ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەدا بگات بە دۆزینەوەی چەندین نهێنی. جا ئەگەر ئێمە لەمەوپێش نەمان توانیبێت یان ئێستا نەتوانین بگەین بەو نهێنییانە، دیارە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئێمە

---

١. علي القاري المسنوع ص١٤٩.

لە بیرکردنەوەی لۆژیکیانەدا هەژار و کەساسین، دڵمان لاوازە و لە بڕیار و لێبڕانەکانیشماندا کۆڵەوار و پەستین. دەرکی ئێمە کۆتایە لە ئاست تێگەیشتن لە بەرهەم و شاکارەکانی کەسانێکی وەك ئیبن عەرەبی و مەولانای ڕۆمی و ئیمامی ڕەببانی و بەدیعوززەمان، کە ئەمانە کۆمەڵە قامەتێکن پێش سەردەمەکانی خۆیان کەوتوون، چ جای ئەوەی دەرك بە گەورەیی کەسایەتییەکانیان بکەین. کە ئەمە وا بێت، دەی ئیتر چۆن لە شاهی نەقشبەندی یان مەعروفی کەرخی یان شازەلی یان شێخی گەیلانی و حەررانی تێدەگەین؟

با ئەوەش بزانین کە هەموو ئەوانە جگە لەوەی شاگرد و قوتابیی قوتابخانەکەی پێغەمبەر بن چی تر نەبوون. ڕاستە ئەوان لەچاو ئێمەدا بلیمەت بوون، بەڵام لەچاو مەدرەسەکەی حەزرەتدا تەنها دەستەیەك شاگردن -گیانم فیدای ئەو شاگردانە بێ- ئەوان شەیدایانی نوور بوون و بەدەوری نووری نبووەتدا ببوونە پەروانە. خۆ ئەگەر چاویان بەسەر جیهانی غەیبدا کرابێتەوە (ئیمام سیوطی) دەفەرموێت: "من لە ژیانمدا بە بێداری نەك لە خەوندا بیست و هەشت جار حەزرەتی محەممەدم بینیوە."[١] ئەوا لە سایەی ئەو شتانەوە بووە کە لەو سەروەرەوە فێربوون.. ئەگەر بەرەو ڕۆشنایی کەوتبنە باڵەفرکە، ئەوا بەهۆی هێزی کێشمەندی ئەوەوە بووە.

ئێمە بەندکراوی زیندانی سێ ڕەهەندیی مەکان و ڕەهەندە ڕێژەییەکەی ترین کە زەمانە. بەڵام ئەوان مەوداکانی مەکان و زەمانیان بەزاندووە و لە مەودایەکی تردا ڕەنگە هەموو ڕۆژێك ڕووبەڕوو و ئەژنۆ بە ئەژنۆ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ژیابن..! تەنانەت یەکێك لەوانە دەڵێت: "ئەگەر بۆ تەنیا ساتێکیش بە دیداری شادنەبم لەناودەچم. چونکە هەموو بوونی خۆم بە قەرزاریاری ئەو دەزانم، وەك چۆن گوڵەبەڕۆژە کرانەوە و داخرانی وابەستەی هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆرە، منیش بە هەمان شێوە ژیانم وابەستەی شوێنکەوتن و تەماشاکردنی ئەوە. هەرکات ئەو لە دڵمدا ئاوابێت، منیش کۆتایم دێت و نامێنم."

---

١. نبهاني، جامع الكرامات الأولياء ١٥٨/٢.

ئەوانە قوتابی پێغەمبەر بوون، بە کۆمەکی خوا لە داهاتووشدا نموونەی ئەوان هەڵدەکەوێتەوە. ویلایەت مەیدانی من نییە. خۆ گەر بڕیاربێت لە بەزمی ئەولیادا شتێك بم، ئەوا "قطمیر"یانم.. یان تەنیا حەیرانێکی ئەو دونیایەم. بە ئیزنی خوا لە داهاتوودا لە سایەی کۆمەڵە بێداربوونەوەیەکی تایبەتیدا، زۆر چاو بەسەر حەقیقەتدا دەکرێنەوە و قسەکانی بەندەش پشتڕاست دەکەنەوە.

پێغەمبەرمان حەزرەتی محەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هێندە ڕابەرێکی مەزنە، ئەوەتا شاگردەکانی پێش هەموو ئەوانە کەوتوون کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەناوی ڕۆحیانەت ناسی و یەکبوون لەگەڵ وزەی گەردوونیدا بەرگی ڕابەریان پۆشیووە و لە بازنەی بەتاڵدا دەسووڕێنەوە. ئەگەر پێشهاتەکان بەمجۆرە لەسەر ڕەوتی سروشتی خۆیان بەردەوام بن، ئەوا هەر لە ئێستاوە دەتوانین بڵێین: "دونیای ئاینده دونیای حەزرەتی محەممەدە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)." بەڵێ، موحیەدین ئیبن عەرەبی ئەمڕۆ ئەوەندە خۆرئاوای سەرسام کردووە، تەنیا لە ئەڵمانیا هەزاران کەسی بە ڕەچەڵەك ئەڵمانی لە سایەی ئەو ڕووناکییەوە کە موحیەدینی ئیبن عەرەبی و هاوڕێنەکانی پەخشیان کردووە، دەڵێن: "محمد رسول الله." جا ئەگەر لە جێیەکدا شێخ عەبدولقادری گەیلانی یان مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی یان ئیمامی ڕەببانی یان بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی بتوانن دڵان بەرەو حەزرەتی محەممەد وەربچەرخێنن، ئەوا ئەمە لە سایەی ئەو هێزە پیرۆزەوەیە کە بە تەواوی مانا تایبەتە بە ڕابەر و مامۆستاکەیان.

مەولانای ڕۆمی مرۆڤێکی مەزنە. (ئەگەرچی هەندێك سەبارەت بەو زیادەڕۆیی دەکەن و دەیخەنە مەنزڵی سەروەرمان!) مەولانا یەکێکە لەو قامەتە باڵا خاوەن دانستانەی کە بەرەو دونیای جاویدانی چارۆکەی هەڵداوە و ئاشنای جیهانی مەلەکوت بووە. نوێنەری بێهاوتای عەشق و ناڵە و هەژان و خواویستییە.. بە یەکێك لە گەورەترینی ئەو کەسانە دادەنرێت کە شێوازی نموونەهێنانەوە و گێڕانەوەی چیرۆکی داهێناوە بۆ گەیشتن بە حەقیقەتی ڕەها. لە هەمان کاتیشدا یەکێکە لە پێشەنگەکانی پەیف و بەیان. شارەزایان دەڵێن یەکێکیش لە عەسا سیحرییەکان

بەدەستی ئەوەوە بووە و هەرکێ چوویێتە هەرێمەکەیەوە لە ئاست ئەفسوونەکەیدا سەراسیمە بووە.

### ٣. بەهرەدارانی ڕەوانبێژی

پێغەمبەری خوا شاهی ڕەوانبێژانی عەرەب و شاهەنشای ڕەوانگۆیانی عەجەمە.

لەم مەیدانەشدا پڕی دنیایەك شایەتی هەیە. هەر لە حەسسانی کوڕی ثابت و کەعبی کوڕی مالیك و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەوە بیگرە، تا دەگاتە کەعبی کوڕی زوهەیری کوڕی ئەبو سەلما و لەبید و خەنسای کچی زوهەیرە. ئەوجا لەوانیشەوە بۆ ئەدیبەکانی سەردەمی ئەمەوی و عەبباسی و سەلجوقی و سەرجەم ئەو وێژەوان و شاسوارانەی مەیدانی بەلاغەت کە بەدرێژایی مێژوو هەڵکەوتوون، هەر هەموویان پەیڤەکانیان بە وتە و پەیامەکەی ئەو دەربڕیوە و کەمتەرخەمییان نەنواندووە لە بەگەورە ڕاگرتنیدا. نەخاسمە شاعیرەکانی ئێران...

حەیدەر بامماد دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێك گۆتەی شاعیری ئەڵمانی بە شازادە مۆیلەر دەڵێت: "لە مێژووی ئیسلامدا، بە تایبەت لەو سەردەمانەدا کە عەبباسی و سەلجووقی و ئێرانییەکان حوکمیان کردووە، دەبینین چەندەها شاعیری دیار و مەزن لە ئێراندا هەڵکەوتووە. کەچی لە جیهانی ئیسلامیدا تەنها چوار پێنجێکیان پەسەندکراون."

گۆتە، ئەو وێژەوانە ناودارەی کە بە شاکارە ڕۆمانی "فاوست" لە ئەدەبی ئەڵمانیدا دەرگای سەردەمێکی نوێی کردووەتەوە، دەڵێت: "لە وڵاتی ئێراندا چەندین ئەدیبی بەرز و بلیمەت هەڵکەتوون، بەڵام جیهانی ئیسلامی تەنها بایەخی بە پێنجیان داوە کە ئەمانەن: مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی، حافیز، فیردەوسی، ئەنوەری و نیزامی. جگە لەمانەش ئەوانی تریان فەرامۆش کردووە، واتە بە شاعیریان

دانانێن. لەنێو ئەوانەدا کە ئەوان فەرامۆشیان کردوون ئەدیبی وایان تێدایە من ناتوانم ئاویش بکەم بە دەستیاندا."

با لەم سەرسوڕمانەدا بمێنینەوە! سەرنج بدەن، ئێمە بە تەغار ستایش و سەنای کێ دەکەین و وەك بالۆن فویان تێدەکەین و گەورەیان دەکەین، لەولاشەوە کێمان فەرامۆش کردووە و پێیان نامۆ و بێگانەین!

جا ئەگەر نەمان زانیوە با بیزانین: هیچ ئەدیبێکی خۆرئاوایی نییە لاسایی حافیزی شیرازی نەکردبێتەوە. هەموو ئەو ئەدیبانە، سا عەرەب بن یان عەجەم، هەموویان لە قوتابیانی قوتابخانەکەی پێغەمبەرن و ئەو واتایانەیان بەکارهێناوە کە لەو قوتابخانەیەوە فێربوون.

لەڕاستیدا گەلێك شتی تر مابوون عەرزتانی بکەم.. بەڵام لەبەرئەوەی سەرتان نەئێشێنم بەوەندە دەست هەڵدەگرم؛ چونکە هێشتا دنیایەك شت ماوە سەبارەت بەو سەروەرە باسی بکەم...